سڤن هیسل

# لەشکری نەفرەتلێکراوان

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

شێرکۆ ئەحمەد حەویز





هەولێر ٢٠١٠

# لــەشــكــرى

# نەفرەتلێكراوان

نووسینی

سـڤن هێسل

بە دانیمارکی

* * *    * * *    * * *

مۆریس میشێل

لە دانیمارکییەوە کردوویەتی بە ئینگلیزی

شێرکۆ ئەحمەد حەوێز

لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی

چاپی یەکەم ٢٠١٠ز ٢٧١٠ ک



# وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
# بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
# بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر


ناوی کتێب: لەشکری نەفرەتلێکراوان

نووسینی: سڤن هێسل

وەرگێرانی: شێرکۆ ئەحمەد حەوێز

نەخشەسازی: محمد فیصل زنگنە

پیت چن : موخلیس خەلیل عەلی

چاپ: چاپخانەی رۆشنبیری

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ ژمارەی سپاردنی (   ) ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.

# ناوەرۆك

بەناوی خوای گەورە

سەلام ناوخۆش
پێنجشەممە
١٥ / ئاب / ٢٠٠٩

برا گەورەم مامۆستای بەڕێزم

سڵاو و ڕێز

بەڕاستی وەرگێڕان پرۆسەیەکی زۆر قورسە، چونکە هەر تەنها
ڕستە وەرگێڕان نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی هەمەلایەنییە.
وەرگێڕ دەبێ نووسەریش بێ، چونکە خودی پرۆسێسەکە
دووبارە نووسینەوەیە.
وەرگێڕ کاری تەنها لە هەردوو زمانەکە شارەزایی و بەس،
بەڵکو دەبێت بزانێت دەربارەی هەردوو زمانەکە مێژووی
تێوەندی هەر دەقێکی وەرگێڕدراو. وێڕای ئەمەش زۆر
دەق وەرگێڕ ناسیوەت و هەڵسان دەکەن، بە جۆرێ وەرگێڕ
ناچارە دەهێنێ تا تەواو ئەو خەڕە ئەندێشانەی
ڕستەکانی زمانی دەق source language بەوێژای
ئەمانەوە دەگێڕێتە ناو زمانی خۆی یا خود بە تێکەڵ لە
زمانی خۆی شتێکی بێ ئەو دەربڕینانەی نووسەری دەق داوە.

مامۆستا شێرکۆ هەر کوردییزان نییە، بەڵکو
لە وەرگێڕان پێشم دەرکەوت ئینگلیزانیکی تەواو باشیشە،
بۆیە ئەگەر مامۆستا پێم بیبەخشێ بڵێم، ئەمە لەپاش پێداچوونەوە دەرکەوت
هیچ بەشێکی ئەمە یا بڕێکمان، بەو شێوەیەی وەرگێڕاوە، دەدەم لە چاپ
سەرکەوتن و تەمەن درێژی بۆ دەخوازم.

## به ناوی خوای گەورە

سەلام ناوخۆش

پ. یاریدەدەر

٢١/ئـاب/٢٠٠٩

برای گەورە و مامۆستای بەڕێزم

سڵاو و ڕێز

بەڕاستی وەرگێڕان پرۆسەیەکی زۆر قورسە، چونکە هەر تەنها ڕستە وەرگێڕان نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی مەعـریفـیـیـە، وەرگـێـڕ دەبـێ نووسـەریــش بـێ، چـونکە خودی پرۆسێسەکە دووبارە نووسینەوەیە.

وەرگێڕی کارامە، هەر هەردوو زمانەکـە نـازانێ و بـەس، بـەڵکو شـت زانـین دەربارەی هـەردوو زمانەکـە سـتوونی تونـدی هـەر دەقێکـی وەرگێـڕدراوە. وێـڕای ئەمەش زۆر دەق وەرگێڕ نارەحەت و هەراسان دەکـەن، بـەجۆرێ وەرگێـڕی کارامـە دەهێوژێ هەتا تـەواو ئـەو هـزرو ئەندێـشانەی رسـتەکانی زمـانی دەق « Source Language » بەو پەڕی ئەمانەتەوە دەهێنێتە ناو زمانی خۆی یاخود ڕێکتر، لە زمانی خۆی شتێک بۆ ئەو دەربڕینانەی نووسەر دەدۆزێتەوە.

مامۆستا " شێرکۆ " هەر کوردیزان نییە، بەڵکو لەم وەرگێڕانە بۆم دەرکـەوت ئینگلیزیزانێکی زۆر باشیشە، بۆیە ئەگـەر مامۆسـتا ڕێـم پێبـدا بڵـێم، ئـەوە لـەپاش بەراوردکردنی چەند بەشێکی ئەم یادە ڕۆمانە، پەسـەندی وەرگێڕانەکـەی دەکـەم و هیوای سەرکەوتن و تەمەن درێژی بۆ دەخوازم.

ئەم کتێبە پێشکەشە بەو سەربازە نەناسراوانەی کە لەپێناو دۆزێکدا کوژران کە هی خۆیان نەبوو، بۆ چاکترین هەڤالانم لە بەتالیۆنی (٢٧)ەمی زرێپۆشی لسزادراوادا، هەروا بۆ هەموو ئەو ژنە ئازایانەی لەو ساڵە ڕەش و پڕ ترسانەدا یارمەتیان دام، بـۆ :-

ئۆبەرست مانفرید هنکا

ئۆبەرست لیفتنانت ئیریک ڤۆن بیرینک

ئۆبەر فیلدۆبیل ویلی بیر

ئەنتیرۆفیزەر هۆگۆ ستیک

ستابس گیفریتەر گوستاف ئیگن

ئۆبەر گیفریتەر ئەنتون ستێیەر

گیفریتەر هانس بریر

ئەنتیرۆفیزەر بیرنهارد فلیشمان

گیفریتەر ئاسمۆس براون

هەروەها

ئیڤا شادۆس، خوێندکاری یاسا

ئۆرسولا شێد، دکتۆری پزیشکی

باربارا ڤۆن هاربۆرگ، پەرستار

وەرگێڕانە کوردییەکەی ئەم کتێبە پێشکەشە بە گیانی باوکی بەڕێزم کە سەرەڕای دوورخستنەوەی بۆ شاری کووت لە ناوەڕاستی عێراق لە کۆتایی ساڵانی چلی سەدەی ڕابوردوودا، کتێبی ئەلفبێی کوردی بۆ هێنابوومە ئەوێ بۆ ئەوەی فێری خوێندنەوەو نووسینی زمانی شیرینی کوردی ببم و هەر لەو ڕۆژەشەوە خۆشەویستیی ئەو زمانەو هی نەتەوەکەشمی خستە دڵمەوە.

وەرگێڕی کوردی

" زۆر چاکە، پێـنـج دەقیقەکە بەسەر چوون. پێویستە ئەنجامەکەی بچێژی ! "

دوگمەی زەنگەکەی پاڵدا. دوو پیـاوی زەبەللاحی SS* بەجلوبەرگی ڕەش هاتنە ژوورەوە. فەرمانێکی کورتیان پێدراو - ئیڤایان پەلکێش کرد بۆ بەردەم مێزێک کە بەپارچە پێستێک داپۆشرا بوو.

---

★ SS :- واتە ئاسایشی تایبـەت یـا پۆلـیـسی نهێـنـی تایبەتی ئەڵمانی کە دەزگایەکی سەرکوتکەری ئاسایشی ئەڵمانیای نازیی بوو.

# فیلارێكی پیس

ڕۆژی پێشتر گەورە میننا سەکە* هێنرابووە بەردەم دادگەی سەربازیی و بەهەشت ساڵ كاری قورس حوكم درابوو، ئێستاش نۆرەی من هاتبوو، بردرامە دادگا، دوو سەگی چاودێریی پاسەوانییان دەكردم، خرامە ژوورێكی گەورەوە، دیوارێكی ژوورەكە بەوێنەیەكی گەورەی ئەدۆلف هتلەر داپۆشرابوو لەبەرامبەریشەوە (فریدریكی مەزن) هەڵواسرابوو ـ لەپشت كورسی سەرەك دادگاش، چوار ئاڵای گەورە هەڵواسرابوون، ئەوانە ئاڵای هێزی ئاسمانی و كەشتیگەل و، سوپاو (SS) بوون. بەدرێژایی دیواریشەوە ئاڵای بەشە جیاوازەكانی هێزی چەكدار ڕیزكرابوون: ئاڵایەكی سپی بەكرۆسێكی ڕەش بۆ هێزی پیادە، یەكی سوور بۆ تۆپخانە، زەرد بۆ سوارە، قەنەفلیی بۆ هێزە زرێپۆشەكان، ڕەشێكی بەزیو ڕازاوە بۆ ئەندازیاران و لیواكانی دەریاوانیش ئاڵایەكی ڕەنگ سەوزیان هەبوو كە بووقێكی ڕاوی لەسەر بوو، هەروا ئەوانی تریش. مێزی داد پرسەكە خۆشی بەئاڵای ڕەش و سپی و سووری ڤیرماخت ڕایخ داپۆشرابوو.

دادگاكە لە ڕاوێژكارێكی یاسایی بەپلەی مێجەرو لە دوو داد پرس – كە یەكیان لەپلەی هاوپتمان و ئەوی دیكەیان فێلدویبل بوو – و داواكارێكی گشتی و پیاوێكی (SS) بەپلەی ستورم بانفوهەر پێكهاتبوو.
فیلارێكی پیس شایانی ئەوە نییە پارێزەرێك بەرگری لێ بكات.

تاوانەكە خوێندرایەوە، كەوتمە بەر لێپرسینەوە، دادپرسەكە فەرمانی دا شایەدەكان بێن، لەپێشدا ئەو (گۆستاپۆ)یە** هات كە من و ئیڤای

دەستگیرکردبوو کاتێك کە لە دەمی ڕووباری (وێزەر)دا خۆمان دەشووشت، لەناکاوێکیش کە دەنگی هاوێنانەی شەپۆلە خاوو لەسەرخۆکانی وێزەر خۆی بەسەر کاروبارەکانی ئەو دادگایەدا سەپاند. کۆمەڵە زیخە، بریقەدارەکان ...

(ئیڤا)ی لەوێدا وەستاو کە ڕانە خڕەکانی وشك دەکردنەوە سەرپۆشی مەلەوانییەکەی، گەرمیی سەر پشتم ... گەرمیی، گەرمیی.
بەڵێ، بازم دایە سەر مێزەکەو لە وێوە بەناو پەنجەرەکەوە بۆ دەرەوە ڕامکرد.

بەگشتی پێنج ئەفسەری جیاوازی پۆلیس پرسیاریان لێ کردبووم. ئێستاش وا هاتوون و شایەدیی خۆیان دەدەن. بەڵێ ناوێکی خوازراوەم دایێ. نەء، ئەو ڕوونکردنەوەی من پێم دا ڕاستیی نەبوو. دیتنی ئەو کریمنەل سکرتێرەی کە فەرمانی دابوو (ئیڤا) قامچی زەن بکرێ شتێکی سەیر بوو. ئەوانی دی هەموویان (سادست)*** بوون، بەڵام تەنیا ئەو تەواو بوو، لەگەڵ مرۆڤی تەواویش هیچ ناکرێ، ئەوانەش زۆرن، ڕۆژە خەونێکی خۆشم دەست پێکرد : هەموو کەسێك فیلاری کرد، ئێمە هەموومان،

---

* میناس :- ئەو کەسەیە کە شارەزایی لە مین و تەقەمەنی هەیە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکات.

** گۆستاپۆ :- پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیای نازیی.

*** سادست :- کەسێکە کە چەشەو خۆشیی لە ئەشکەنجەدانی ئەقلیی، یان لەشیی و هەندێجاریش چەشەی سێکسی و لەم ئەشکەنجەدانە وەردەگرێ.

تەنیا ئەفسەرەکان مابوونەوە ئەوانیش چیان پێ دەکرێ ؟ لەسەر هەموو ڕێگایەکدا کۆمەڵە خەڵك هەبوون. هەر سەربازبوو بەرەو ماڵەوە دەچۆوە. ئەفسەرەکانیش لەوێ بوون، لەبەرەی جەنگ و لەپشت بەرەی جەنگدا بوون، خۆیان و نەخشەو پلانەکانیان و کڵاوە سەربازییە خاوێن و بووتە پۆلش کراوەکان. ئەوانی دی بەرەو ماڵ دەبوونەوە، منیشیان لەبیر نەچووبۆوە، دوای ماوەیەکی کەم دەرگاکە دەکرێتەوەو دێنە ژوورەوە. ئەوان هیچ ناڵێن، ئنجا سەرەك ڕاوێژکاری یاسایی و دوو داد پرسەکە هەڵدەستنە سەر پێیان، دەم و چاویان ژاکاوو ... ... ...

– (ئیڤا شادۆسی) شایەد بهێننە ژوورەوە.

– (ئیڤا)! تۆ لێرەی ؟

– (ئیڤا) بوو ؟

بەڵێ، (ئیڤا) بوو، تەواو وەکو چۆن من سڤن بووم، بەچاوان یەکدیمان دەناسییەوە، بەهەموو شتێکی تر، بەهەموو ئەو شتانەی کە ئێمە دەمانزانین. نهێنییە بچکۆڵەکان، ڕازە تایبەتمەندە زیندووەکان کە هەر تەنیا خۆمان دەمانزانین و کە بەچاو و بەدەم و بەدەستی هەستییارەوە هەڵمانمژین، ئەمانە هەموویان بوونیان نەمابوو، تەنیا هەرچاوەکانمان خۆیان و ترس و بەڵێنەکانیان بوون لەگەڵمان مابوونەوە، ئەوانەش وایان کردبوو ئێمە هەروەکو خۆمان بمێنن.

دەکرێ ئەم هەموو لێك دابڕانە درێژە لەو ماوە کورتەدا ببێ ؟

(ئیڤاشادۆس)، تۆ ئەم پیاوەی ئێرە دەناسی، وانییە ؟

زەردەخەنەی دووڕوویی دەربڕینێکە من ڕقم لێیەتی، چونکە هەمیشە ڕەق و ناشیرین و زێدەڕەوە، بەڵام جگە لەوە هیچ شتێکی تر نییە بۆ سەرو سیمای ئەنجومەنی بەدواداچووندا بەکار بێ جگە لە زەردەخەنەی دووڕوویی نەبێ،

بەڵێ ... دەنگی (ئیڤا) بەئاستەم دەبیسترا. خشەی پەڕێك هات و دەنگەکەی هەمووماني ئاگادارکردەوە.

- تۆ ئەوت لە کوێ ناسی؟

- لەکاتی هێرشێکی ئاسمانی لە کوڵن یەکتریمان دیت،

- تۆ ئەمەت لەوان ڕۆژاندا کرد.

- پێی گوتی کە فیلارە ؟

- نەخێر،

ئەو بێ دەنگییە بەفیزە بۆ کچەکە گەلێك زۆر بوو، بۆیە بەزمانێکی تێگیراو بەردەوام بوو"باوەڕ ناکەم"

- کچۆڵە، چاك بیر لە قسەکانت بکەوە. وەك دەزانی، هیواداریشم بیزانی، کە شایەدیی دانی بەدرۆ لەدادگادا کارێکی زۆر ترسناکە.

(ئیڤا) بە وەستاوی سەیری زەوی دەکرد. تەنانەت ساتێکیش تەماشای منی نەکرد. دەم و چاوی خەمبار بوو، وەکو هی نەخۆشێك کە تازە نەشتەرگەریی بۆ کرابێ. ترس دەستەکانی خستبووە لەرزین.

باشە، کامیان بوو ؟ پێی نەگوتی کە فیلارە ؟

- بەڵێ، وا تێبگەم گوتی.

- یان دەبێ بڵێی " بەڵێ " یان " نا " ئێمە وەڵامی ڕوونمان دەوێ.

- بەڵێ.

- چی تری پێ گوتی ؟ پاشان تۆ بردتە ( بێرمن ) و جلك و پارە و هەموو شتێکی ترت دایێ، وا نییە ؟.

- بەڵێ.

پێویستە هەموو شتێك بەدادگا بڵێی. ناکرێ هەموو وشەیێکت لێ دەرکێشین. چی پێگوتی؟

– پێی گوتم که له فەوجەکەی خۆی ڕای کردووه، گوتی پێویسته ئەمن یارمەتی بدەم، گوتیشی دەبێ بەڵگەنامەی بۆ بهێنم. منیش بۆم هێنا. له پیاوێك ناوی پاول بوو.

– یەکەم جار که له ( کۆڵن ) چاوت پێی کەوت بەدلەی لەبەر بوو ؟

– بەڵێ.

– چ جۆره بەدلەییێك ؟

– بەدلەیەکی ڕەشی هێزەکانی تانك بەنیشانەی گریفتەرییەوه.

– بەواتایەکی تر، تۆ هیچ گومانت لەوه نییه که سەرباز بوو ؟

– نەخێر.

– ئەو داوای لێکردی له گەڵی بچییه ( بێرن ) ؟

– نەء، من ئەو پێشنیازەم کرد. من گوتم پێویسته بێیت. ئەو ویستی خۆی بەدەستەوه بدات. بەڵام من ئیقناعم کرد که ئەمه نەکات.

– ئیڤا، ئیڤا، بۆ خاتری خوا ئەوه چی دەڵێی ؟ چییان پێ ڕادەگەیەنی ؟

– واته تۆ نەتهێشت ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێ و خۆی بەدەستەوه بدات ؟

– بەڵێ، من نەمهێشت ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێ.

نەمتوانی گوێ لەم قسانه بگرم. له شوێنی خۆم هەڵبەزیمەوەو بەهەموو توانامەوه هاوارم کرد، هاوارم کرده سەر سەرەك دادگاو گوتم لەپێناو ڕزگارکردنی من درۆ دەکا، بۆ دۆزینەوەی بارودۆخێکی هێورکەرەوه بۆ من وا دەکا، بەڵام ئەو هیچ بیرۆکەی ئەوەی نەبوو که من سەرباز بووم، بەدلەکەم لەناو شەمەندەفەڕدا لەنێوان پادر بۆرن و کۆڵن داکەند. که تووشی ئەویش بووم جلکی مەدەنیم لەبەربوو. پێویسته ئیزنی بدەن بڕوا "ئاگای له هیچ نەبوو تا گیرام" سوێندتان بۆ دەخۆم.

ڕەنگبێ سەرەك دادگایەكی سەربازیی مرۆڤ بێ، من نەمدەزانی. ئەگەر چی چاوەكانی ئەوەندە ساردو سڕبوون وەك پارچە شووشە وابوون و خوێنیان لە هاوارەكانی من دەچۆڕاند.

– پێویستە بێ دەنگ بی تا پرسیارت لێ دەكرێ. ئەگەر یەك وشەی دی بڵێی ناچارم دەرت كەم، ئنجا شووشەی چاویلكەكانی وەرچەرخاندە سەر ئیڤا.

– ئیڤا شادۆس، سوێند دەخۆی كە قسەكانت ڕاستن ؟

– بەڵێ، بەتەواوی وایە وەكو گوتم. ئەگەر منی نەدیبا خۆی بەدەستەوە دەدا.

– دیسان هەر تۆ یارمەتیت دا كە لەدەست پۆلیسی نهێنی ڕایكرد ؟

– بەڵێ.

– سوپاست دەكەم. بەسە ... جگە لەوە ... تۆ قەت حوكم دراوی ؟

– پێنج ساڵ سزای كاری قورس لە كامپی گرتووخانەی سەربازیی ڕاڤنزبروك بەسەر دەبەم.

كە بردیانە دەر تەماشاییكی ئەو بەری كردو ماوەیەكی درێژ چاوی تێبڕیم و لەلێوەكانییەوە ماچێكی بۆ هەڵدام. لێوەكانی شین و هەردووك چاوانی بێ سنوور هەم خەمبارو هەم شاد بوون. ئەو شتێكی كردبوو بۆ یارمەتیدانم. هیوادارببوو، باوەڕیشی وابوو كە ڕەنگبێ ژیانم ڕزگار بكا. لەپێناو هیواییكی لاواز كە بتوانێ بەشدارییەكی بچووك بكا لە بەرگری لێ كردنم ئامادە بوو كە قوربانیی بدا بە پێنج ساڵ لە ژیانی. پێنج ساڵ لە ڕاڤنزبروك !

من زۆر خەمبار بووم.

هەروەها وەكو شایەدێك (ترورودی) شیان هێنا، بەڵام هەر زوو پاش دەست پێكردنی ئیفادە شێتانەكەی، كە مەبەست پێی جێگیركردنی شایەدییەكەی ئیڤا بوو. لە هۆش خۆی چوو.

شتێکی سەیرە کە شایەدێك لە دادگا لە هۆش خۆی بچێ و ببرێتە دەرەوە. تروودی لەدەرگایەکی بچووك برایە دەر، کە دەرگاکەی لەسەر داخرا وەك بڵێی تەواویی کێشەکەی منیش لەگەڵیدا برایە دەر. بڕیاردانەکەیان زۆری نەخایاند. کاتێکیش حوکمەکە خوێنرایەوە هەموو کەسێك هەستانە سەر پێ، ئەفسەرو فەرمانبەرە ئامادەبووەکانیش دەستیان بۆ پێشەوە بەرزکردەوەو سڵاوی نازییانەیان وەرگرت.

– بەناوی فۆهەرەوە.

– سڤن هێسل، گریفتەر لە لیوای یازدەمی هۆسارس، بەپێی یاسا بە (١٥) پازدە ساڵ کاری قورس حوکم درا لەبەر فیلارکردنی. سەرەڕای ئەمەش بڕیاردرا کە لە لیواکەی دەربکرێ و لەهەموو مافێکی مەدەنیی و سەربازیی بێ بەش بکرێ تا ماوەیەکی نادیار.

– هایل هتلەر !

بۆ لە هۆش خۆت نەچووی ؟ ئەرێ هەموو شتێك لەبەر چاوت ڕەش نییە، وەکو ئەو کاتەی کە دەستیان لە لێدانت هەڵگرت ؟ دەبێ ئەوان چی بەمە بڵێن: شەرمەزاریی لە مردن خراپترە ؟ ئەمە هەر ئەوەیە. ئەوە کلێشەکەیە. مرۆ وا هزر دەکا کە قەت بەکاری ناهێنێ بەڵام کلێشەکان لێرەدا بەکار دەهێنرێن.

ئێستاش دەتوانیت بڕۆیت و ئەو مەبەستە بە خەڵك ڕابگەیەنیت.

نا، تۆ ناچیتە هیچ کوێیەك.

ئەوەندە شڵەژاوو سەرسام بووم کە تەنها هەر گوێم لەو قسانە بوو کە لە پاشان سەرەك دادگا لەڕووی لێدوانەوە بەسەر حوکمەکە کردنی، بێ ئەوەی لێیان تێ بگەم.

ئەو گوتی کە ئەوان دادو بە زەییان پێکەوە گونجاندووە، ژیانیان پێداومەتەوە. بە سزای مردن حوکم نەدرام. ئەوان وایان دانابوو کە من ئەڵمانیم و لە دانیمارك بۆ خزمەتی سەربازیم بانگ کرابووم، هەروەها کە ژنانێکی نامەسئوول، ژنانێك شایانی ئەوە نیین پێیان بگوترێ ژنی ئەڵمانیی، فریویانداوم تا فیلار بکەم.

دوو دوو بەکەلەبچە و زنجیر کۆت کرابووین ئنجا لە پاشان زنجیرێک بەدەوری هەموومانداا ئاڵا بوو. براینە وێستگەی گواستنەوەی شت و مەک، بەهۆی هێزێکی چەکداری پۆلیسی سەربازییەوە پاسەوانیی دەکراین.

سێ شەو و سێ ڕۆژ لەناو شەمەندەفەر ماینەوە ........

# بە ڕۆژ دەمردن، بە شەویش دەمردن

- بەر لەوەی لە میوانخانە بچکۆڵە خنجیلانەکەماندا پێشوازیتان لێ بکەم دەبێ زۆر چاک بزانن ئێوە کێن و چین.
- ئێوە دەستەیەك چرکنی داوێن پیس و نامەردن، کۆمەڵێك بێزلێکراون، ئێوە خاپەرۆکی مرۆڤایەتین. هەمیشە هەروا بوون و تا دەشمرن هەروا دەمێننەوە. جا بۆ ئەوەی دەروونە پیسەکانتان بتوانێت بەخۆشی بەسەر ببات، ئێمە چاودێریتان دەکەین تا لەسەر خۆ دەمرن، زۆر لەسەر خۆ تاکو ماوەتان بۆ هەموو شتێك هەبێت، من بەش بەخۆم دڵنیاتان دەکەم کە کەستان لە هیچ شتێکدا فێڵی لێنەکرێت، کە چارەسەرکردنتان پێیانەوە پەیوەست بێت، من زۆر داخ بۆ ئەوە دەخۆم ئەگەر هەر کامێکتان شتێکی لەم بارەوە لەدەست چووبێت.
- بۆیە ئێستاکە بەخێرهاتننتان دەکەم بۆ کامپی گرتووخانەی سزادانی سەر بە (SS) ڤێرماخت، لەنگریس.
- کوڕینە، کچینە، بەخێربێن بۆ کامپی گرتووخانەی قەڵاچۆکردنی لەنگریس.

قامچییەکی سووکی بە بووتە بریقەدارەکەی کێشاو تاك چاوێلکەکەی بەردایەوە سەر چاوی. بۆ دەبێ ئەم تەرزە مرۆڤانە هەمیشە تاك چاوێلکەیان هەبێت ؟ ڕەنگ بێ چەند ڕوون کردنەوەیەکی سایکۆلۆژیی هەبن.

هاپتشارفۆهەرێکی (SS) ڕێنماییەکانی خوێندنەوە، کە ئاماژەیان بەوە دەکرد کە : هەموو شتێك قەدەغەیە و سزای هەر سەرپێچی کردنێکیش برسی کردن، تێهەڵدان و ئنجا مردنە.

گرتووخانەکە پێنج نهۆمیی بوو کە لە شێوەی قەفەز دروستکرا بوو، هیچ دیوارێك نەبوو ژوورەکانی لەیەك جودا بکاتەوە، تەنیا شیشی ئاسن نەبێ.

ئێمەیان پشکنی، شۆردراین و لایەکی سەریشمان تاشرا. لە پاشان هەموو شوێنە مووداره‌کانی لەشمان بەشلەیەکی بۆگەنی تیژ چەورکرا کە لەئاگر خراپتر دەسووتا، ئنجا هەموومان پێکەوە خراینە ژوورێکەوە، لەوێدا بۆ ماوەی نزیکەی چوار سەعات بەرووتی ماینەوە لە کاتێکدا هەندێك لەپیاوانی (SS) چاوەدێرییان دەکردین. حۆقنەیان لەگوێماندا، ئەنگوستیان بەدەمماندا کرد، تەنانەت کونە لووت و بن هەنگڵیشمان هەڵنەبوێران. لەدواییدا حۆقنەیەکی گەورەمان لێدرا کە لە ئەنجامیدا بەتەنگەتاویی رامان کرد بۆ ئاودەستەکان، کە تەنیا هەر لادیوارێکیان هەبوو. ئەم بارە بۆ ئەو دوو ژنە جحێڵەی لە گەڵمان بوون خراپتربوو، ئەوان بەدەست نوکتە سێکسییە نا موحتەشەمەکانی پاسەوانانەوە دەیان نالاندو ناچاریش بەرگەی ئەم تاقیکردنەوە تایبەتەیان دەگرت.

ئەو جلکانەی کە پێمان دران - چاکەت و پانتۆڵی خەت خەت - لە قوماشێکی دڕی وەك گونیە دروست کرابوون، بۆیێ هەموو کاتێك وامان دەزانی لەشمان بە زیندەوەرو مێروولە داپۆشراوە.

ئۆبەرشارفۆهەرێك فەرمانی پێداین کە بچینە دەر بۆ ڕێڕەوەکە، لەوێ لەبەردەم ئەنتەر ستۆرم فۆهەرێك ڕیز بووین . دەستی بۆ پیاوەکەی لای ڕاست درێژ کرد :

- وەرە ئێرە !

کابرا پاڵێکی لەلایەن پیاوێکی (SS)ەوە خوارد کە لە پشتییەوە وەستابوو، پاڵدانەکە کابرای بەلوول خوادوویی خستە بەردەم ئەفسەرە نابووتە لەخۆ باییەکەوە، کە لە بەردەمیدا بەتووندیی بۆ ئاگاداریی ڕاوەستا.

- ناوت چییە ؟ تەمەنت چەندە ؟ چییت کردووە ؟ خێرا وەڵامم بدەوە.

– جۆن شریبەر. بیست و پێنج. بەهۆی ناپاکیی گەورەوە بەبیست ساڵ کاری قورس مەحکوم کراوم.

– پێم بڵێ قەت سەربازیت کردووە ؟

– بەڵێ، گەورەم، من فیلدوێبل بووم لە بەتالیۆنی (١٢٣)ی پیادە.

– کەواتە، بەواتایەکی تر، ئەوە یاخیبوونێکی تەواوە کە تۆ ناتەوێ بەدروستیی دانی پێدا بنێی.

سەرەڕای ئەمەش تۆ بێ حەیایانە، وەکو فێرکرابووی وا لەگەڵ من نەدوای. ئاگادار بە، ئەی بێ نرخ. ئێستا دەمانەوێ تۆ لە ڕەوشتە بەدەکانت چارە بکەین. ئەگەر ئەمەشیان سوودی نەبوو تەنیا هەر ئاگادارمان کەنەوە ئێمە چارەیەکی تر دەدۆزینەوە.

ئەنتەرستۆرم فۆهەر چاوی بڕییە ئاسمان و بەدەنگی بەرزەوە گوتی :

– فەلاقە.

ئەوەندەی نەخایاند کابرایان بەپای ڕووتەوە لەسەر پشت لەناو فەلاقەگەکەدا درێژکرد.

– هێرئەنتەرستۆرم فۆهرەر، چەند فەلاقەی لێبدەین ؟

– بیستی لێ بدەن.

کە لێبوونەوە کابرا لە هۆش خۆی چووبوو، بەڵام بۆ ئەم جۆرە حاڵەتە لە وەسف بەدەرانە ڕێگای مامەڵە لەگەڵ کردنیان هەیە و ئەوەندەی پێ نەچوو کابرا لە ڕیزدا لە شوێنی خۆی ڕاوەستا.

ئەوی دیکەیان، بەسوود وەرگرتن لە شارەزاییەکانی ئەوانی تر، وەکو پێویست وەڵامی دایەوە.

- هێرئەنتەر ستۆرمفۆهرەر، ئەنترۆفیزەری پێشوو (ڤکتۆر گیس) لە تیپی حەفتەمی پێشڕەو دەخوازێت ڕابگەیەنێت کە تەمەنم بیست و دووە، بە دە ساڵ حوکم دراوم لەبەر دزیی.
- تۆ دزیت کردووە ! ناپاکی فێڵباز ! مەگەر نازانیت کە سەرباز نابێ دزیی بکات ؟
- هێرئەنتەرستۆرمفۆهرەر، دەخوازم ڕابگەیەنم کە من دەزانم سەرباز نابێ دزیی بکات.
- بەڵام لەگەڵ هەندێش، کردت ؟
- بەڵێ، هێرئەنتەرستۆرمفۆهرەر.
- بۆیە، تۆ فێربوون بەزەحمەت دەزانی ؟
- بەڵێ هێرئەنتەرستۆرمفۆهرەر، دەمەوێ ڕابگەیێنم کە من فێربوون بەزەحمەت دەزانم.
- باشە، ئێمە لەگەڵتدا بەخشندە دەبین و وانەیەکی تایبەتیت پێ دەدەین. مامۆستایەکی لە ڕادەبەدەر باشمان لێرەدا هەیە.

ئەنتەرستۆرمفۆهرەر چاوی بڕییە ئاسمان و هاواری کرد :

- کات – ۆ – ناین – تێلز (قام – چی – نۆ – کلك).

هەر تازە پەنجە پێی پیاوەکە گەیشتبوونە زەوی کە مەچەك بەستیان کرد.
هیچ کامێکمان ڕامان نەکرد، هەتا ژنەکانیش. هەر زوو ئەوەمان زانی کە ئێمە لەلەنگریسدا ژن و پیاو نەبووین، تەنیا بەرازو، قالۆچەی ڕیخ و قەحپەبووین.

هەموو شتێك کە پەیوەندی بە لەنگریسەوە هەبوو لە وەسف کردن بەدەرو بێزارکەرە. خەیاڵی مرۆڤی سادست بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش سنووردارە،

سەرباری هەموو هونەرکارییە تارماوییەکانی، کەچی خۆت مێشکت وای لێدێت کە بڕنەکات، دیسان جۆرە بێزار بوونێك لە دیتنی ئەو خەڵکە پەیدادەبێ کە بەهۆی ڕێگای وا ئازار دەکێشن و دەمرن کە پێشان بەمێشکی کەسدا نەدەهات. چەوسێنەرەکانمان ئازادیی ئەوەیان پێدرابوو کە ڕێ بەئارەزووی هێزو دڕندەتی خۆیان بدەن و، سوودی تەواویان لەو هەلە ڕەخساوە وەرگرتبوو. ئەمە هەڵی ژیان بوو بۆ ئەوان. گیانیان ئەوەندە بۆگەن بوو بۆگەنتر لەجەستەی زیندانییە نەخۆش و ئازاردراوەکانیان.

من نامەوێ بەهیچ شێوەیەك لۆمەی پاسەوانەکانمان بکەم. ئەوان قوربانییانی پۆستێك بوون کە کەسانی تر بۆیان دروست کردبوون. تا ڕادەیەکیش ئەوان خراپتر لەوە بەرچاو دەکەوتن کە ئێمە هزرمان لێیان دەکردەوە، ئەوان گیانیان بۆگەن هەڵگەڕابوو.

هەندێ جاری وا دەبوو هزرم بۆ ئەوە دەچوو کە تەنیا هەر ئەوەندە بەسە لە بارەی لەنگریسەوە بدوێم بۆ ئەوەی خەڵکیش وەکو من هەست بە کینەو بێزاریی بکەن و دەست بە چاککردنەوەی باری جیهان بکەن، دەست بەبنیاتنانی ژیانێکی ئەوتۆ بکەن کە هیچ شوێنێکی بۆ چەوساندنەوە تێدا نەبێت، تەنانەت بەمەش ناتوانیت وا لە خەڵك بکەیت کە لە مەبەستەکانت تێبگەن تـا خۆیان بەم ئەزموونەدا تێنەپەڕن کە تۆ پێیدا تێپەریوویت. بۆ ئەو جۆرە خەڵکەش پێویست ناکات هیچ بڵێیت. ئەوانی تریش، ئەوانەی کە ئازاد دەکران، وا لەمن ڕادەمان هەروەك بیانەوێ پێم بڵێن کە من لە قسەکانمدا زێدەڕۆیی دەکەم هەرچەندە خۆشیان دەیان زانی کە وانیم، چونکە ئەوان هەموو ڕاپۆرتی دادوەرییەکانی (نۆرەمبرگ) یان پێچابوویەوە، کەچی لە

تەماشاکردنی هەموو ئەو شتەی لەبەر دەمیاندا قیت دەبوونەوە سڵیان دەکردو وایان پێ باش بوو کە چینە خاك و خۆڵێکی تر بخەنە سەر بۆگەنییەتیی بناغەکانەوە، بخووری زیاتر بسوتێنن و بۆن و گولاویش بەدەورو بەردا بڕشێنن.

لەگەڵ هەندێشدا لەوانەیە یەك کەسی ئازا هەبێ کە زاتی ئەوە بکات بەبێ ترس و لەرز شت ببیستێ و ببینێ. من ئەوجۆرە کەسەم پێویستە چونکە بێ ئەو زۆر وەحشەتناك دەبێت. دیسان من پێویستیم بەوە هەیە کە چیرۆکەکەی خۆم بگێڕمەوە بۆ ئەوەی خەفەتی خۆمی پێ بەبا بکەم لەوانەشە هەر بۆ ئەم مەبەستە من بنووسم یا لەوانەیە بەتەنیا هەر بیخەمە بەر خەیاڵ، کە ئەوەش دەڵێم دەمەوێ ئاگادارییەك بدەم بۆ ئەوەی مێژوو بەسەر ئەم شتەدا خۆی دووبارە نەکاتەوە. ڕەنگبێ من هەر خۆم بخەڵتێنم کاتێك ئارەزووی ئەوە دەکەم کە لەسەر تۆپکەی خانوواندا ئەو ئەزموونەی کە هەم بوو بەدەنگی گەورەوە دەری ببڕم، هەر چییەکی بەم کارەش مەبەستم بێ ئەوەیە سەرنج ڕاکێشم کە پاڵەوانێکی ناو ڕووداوی وام کە هەموو کەسێك ماوەی نەبووە تاقی بکاتەوە.

نا، نەك هەموو کەسێك باوەڕی پێیان نەکردووە، بەلام سەبارەت بەمنەوە ژمارەیەکی باشیان هەیە بۆ ئەوەی هەستی زیاترم ببێت لەوەی کە خۆم بەمرۆڤێکی نائاسایی دابنێم. بۆیە، لەوەسفکردنی لەنگریسدا لەم پارچە نووسینە ئەدەبییەی خوارەوەدا من ناتوانم بەقەتعی بڵێم بۆ وام کرد. هەر یەکێك لەوانەیە ئەو هۆکارەی کە پەسندی دەکات بیگەڕێنێتەوە بۆ من.

هەروەها، ئەوەش دەزانم کە ئەوانەی وا هزر دەکەنەوە کە ناتوانن باوەڕ بەقسەکانی من بکەن ئەوانەن کە بارتەقای قورسایی سەرەکی ئەو تاوانە بکەن کە دەکەوێتە سەر شانی هەر یەکێکمان ئەگەر بێتو هەموو لەنگریسەکان لەناو نەبرێن، لە هەر شوێنێکدا کە تائێستا مابن.

هیچ پێویست ناکات باسی شوێنان و وڵاتان و ناوان بکەین – کە تەنیا هەر دەبنە هۆکاری لەبیر بردنەوەو مایەی پێکدادان و تاوانبارکردن لە نێوان لایەنە دژ بەیەکەکان، لەنێوان نەتەوەو، بیرو ڕاو بلۆکەکان، کە هەر یەکەیان سەر گەرمی ئەوەیە هێرش بکاتە سەر کردەوەی ئەوانی تر بۆ ئەوەی هەموو شتێکی لە بابەت ڕەفتاری خۆیان کۆتایی پێبێت.

ئەمەبوو لەنگریس :

فێلدوێبلێك بەتاوانی کاری تێکدانی ڕایخ ماوەی سیی ساڵ بەکاری قورس حوکم درابوو، ڕۆژێکیان کە دەیویست پارچە سابوونێك بدات بە ژنە گیراوێکی دراوسێی، پاسەوانەکان (ئۆبەرستۆرمفۆهرەر ستین)ی سەرۆکی قاوشەکەیان بانگ کرد کە کابرایەکی خەیاڵاوی ترسێنەر بوو.

– بۆ خاتری شەیتان ئەوە چییە لە بابەت ئێوەی دوو کۆترە باریکەوە گوێم لێ دەبێت ؟

ئێوە لێك مارە کراون ؟ باشە، باشە ئەمەیان پێویستی بە ئاهەنگ گێڕان هەیە.

تەواوی زیندانییەکانی نهۆمەکە فەرمانیان پێدرا بێنە خوار بۆ یەکێك لە گۆڕەپانەکان.

هەردووکیان ژنەکە و پیاوە لاوەکەش فەرمانیان پێدرا خۆیان ڕووت بکەنەوە.

ئێوارەی کریسمس بوو کلۆ بەفر بە دەورماندا خولیان دەخوارد.

ستین گوتی " ئێستاش پێمان خۆشە کورتە کردارێکی سێکسی ببینن ! "

ئەو ماسییە بە ترشەی لە بۆنە دەگمەنەکاندا پێمان دەدرا بە کەڵکی بەکاربردنی مرۆڤ نەدەهات، بەڵام ئێمە دەمانخواردن – سەلك و ئێسکان و هەروەها پوولەکەکانیشیان. لەناو زیندانەکانماندا دەستمان بە کۆت و زنجیرەوە لە دوامانەوە بەسترا بوو.

لەسەر زگ لێی ڕادەکشاین و خواردنمان وەکو بەراز دەلێسییەوە، تەنیا سێ خولەکمان پێدەدرا بۆ تەواوکردنی خواردنەکە، زۆر جاریش خۆراکەکە گەرمێکی سووتێنەر بوو.

کە زیندانییانیش لە سێدارە دەدران :

ڕۆژانی وا بە لێدانی فیکەیەکی تیژ دەستی پێدەکرد، هەر لەو کاتەشدا زەنگە گەورەکە چەند جارێکی جیاواز لێیدەدا بۆ ئەوەی دەری بخات کام لە نهۆمەکان دێنە خوارەوە. کە جاری یەکەم فیکەکە لێی دەدا دەبوایە بە ئاگادارییەوە ڕوو لە دەرگای زیندانەکە بوەستیت. لە فیکەی دووەمیشدا دەبوایە لە شوێنی خۆتدا پێ بکوتیت : تەپ، تەپ، تەپ، ئنجا میکانیزمێك لەلایەن پیاوێکی (SS)ەوە دەخرایە گەڕو لەیەك کاتدا دەرگای هەموو ژوورەکانی دەخستە سەر گازی پشت، بەڵام تا ئەو کاتەش لەناو زیندانەدا هەر پێمان دەکوتا تا فیکەیەکی تازەو دەنگ تیژ لێیدەدا.

لە ڕۆژێکی ئاوادا هەژدە کەس هەبوون لە سێدارە دەدران. لەخوارەوە، لە گۆڕەپانەکەدا نیوە بازنەیەکمان بە دەوری سەکۆیەکدا پێکهێنا، کە بریتی بوو لە شانۆیەکی دە پێ بڵندی هەژدە سێدارە لەسەر. هەژدە گوریسی بە قەفیان پێدا شۆڕ ببۆوە. دیمەنی گوریسی شۆڕبۆوە ببووە بەشێك لە ژیانی من،

لەبەردەم سەکۆیەکەشدا هەژدە دارمەیتی لە تەختەی ناڕێک دروستکراو دانرابوون.

نێرینە حوکم دراوەکان پانتۆڵی خەت خەتی خۆیانیان لەبەر کردبوو، ژنەکانیش تەنوورە خەتدارەکانیان و هیچی تریش نا. یاریدەدەری سەر لەشکر بڕیارەکانی مەرگی خوێندنەوە. ئنجا هەر هەژدەیان فەرمانیان پێدرا بە پێپیلکە تەسکەکاندا سەرکەون بۆ سەر سەکۆیەکە و لەوێ ڕیزبن، هەر یەکەیان لە تەنیشت سێدارەکەی خۆیەوە. دوو پیاوی (SS) کە دەوری جەللادیان دەگێڕا قۆڵی کراسەکانیان تا سەر ئەنیشکەکانیان چاك هەڵکردبوو.

هەموویان یەك لەدوای یەك لە سێدارە دران . کە هەر هەژدەیان لە وێدا بەسێدارەکاندا شۆڕ ببوونەوە، میزو پیسایی بە لاقەکانیاندا دەهاتە خوارێ، دکتۆرێکی (SS) هات و، تێڕوانینێکی بێ باکانەی تێگرتن و ئیشارەتێکی بەجەللادەکان دا کە هەموو شتێك تەواوە. ئنجا لە پاشان لاشەکان لە سێدارەکان کرانەوەو خرانە ناو دار مەیتەکانیان.

من پێم وایە دەبێ یەك دوو وشە لە بابەت ژین و مەرگ لەو ساتەدا بڵێم، بەڵام نازانم دەبێ چی بڵێم. لە بابەت لە سێدارە دانەوە هەر ئەوەندە دەزانم کە تەواو شتێکی نا ڕۆمانسییە.

بەڵام هەر کەسێك ئەگەر پێی خۆشبێت زیاتر لە بابەت مەرگەوە گوێبیست بێت، ئەوە ستۆرمبانفۆهرەر (شاندرج) هەبوو، کە لاو چاك بوو، پۆشتەو، ڕێك و هەمیشە دۆستانە و بە ڕەوشت و گوێڕایەڵ بوو، بەڵام هەتا ئەو (SS)انەی کە لە ژێر فەرماندەی دابوون لێی دەترسان.

ڕۆژێکی شەممە لەکاتی ناو بەسەرکردنەوەدا گوتی " ئێستاش با بزانین ئەوەی من پێم گوتبوون تێی گەیشتوون. هەنووکە فەرمانێکی کورتی سووك بە هەندێکتان دەدەم و ئەوانی ترمان چاوەڕێ دەکەین بزانین بەڕێکی جێبەجێ دەکرێت ".

پێنج کەسی لە ڕیز دەرهێنا. فەرمانیان پێدرا ڕووبەڕووی ئەو دیوارەوە بوەستن کە دەوری گرتوخانەکەی دابوو. زیندانییەکان ڕێیان پێ نەدەدرا لە پێنج یارد کەمتر لە دیوارەکەوە نزیك ببنەوە.

- بۆ پێشەوە - بڕۆن ! ،

هەر پێنجیان چاویان لە پێش خۆیان بڕیبوو بەرەو دیوارەکە چوون تا پاسەوانەکانی ناو بورجی چاودێری کردن گوللە بارانیان کردن. شاندرج ڕووی لە ئێمە کرد.

- ئەوە شتێکی جوان بوو، ئەوە ڕێگای بەجێهێنانی فەرمانە، ئێستاش کە فەرمانتان دەدەمێ، چۆك دادەن و هەرچیتان پێدەڵێم لە دوای من بیگێڕنەوە. چۆکتان دا- دەن ! ، هەموومان چۆکمان دادا.

- ئێستاش بەدەنگی بەرزو بەئاشکرا لە دوای من بڵێن : ئێمە بەرازو ناپاکین.

- ئێمە بەرازو ناپاکین.

- کە دەبێ تێك بشکێین.

- کە دەبێ تێك بشکێین.

- ئێمە شایانی ئەوەین.

- ئێمە شایانی ئەوەین.

- سبەی، یەك شەممەیە، بەبێ خۆراك دەبین.

- سبەی یەك شەممەیە، بەبێ خۆراك دەبین.

- چونکە ئەگەر ئیش نەکەین.

- چونکە ئەگەر ئیش نەکەین.
- شایانی خۆراك پێدان نابین.
- شایانی خۆراك پێدان نابین.

هەموو پاش نیوەڕۆیەکی ڕۆژانی شەممە ئەم هاوارە شێتانەیە لە گۆڕەپانەکەدا دەنگی دەدایەوەو لە ڕۆژانی یەك شەممەدا بێ خۆراك دەبووین.

لە زیندانەکەی تەنیشتمەوە، کات ڕێنجەر ناوێك هەبوو، ترسناك دیار بوو. پرچی وەك لۆکە سپی بوو. زۆربەی ددانەکانی لەبەر کەم ڤیتامینیی هەڵوەرابوون، باسك و لاقەکانی وەکو ئێسکانی درێژو باریك وابوون. برینی گەورەی کێم کردوو لەسەر لەشیدا هەبوون کە کێمیان لێ دەتکا.

ئێوارەیەکیان پێی گوتم، تۆ بەو جۆرە سەیرم دەکەی تەمەنی من بەچەند دادەنێی؟، ئنجا پێکەنینێکی وشك و برینگی بە ڕووم دادا.

وەڵامم نەدایەوە.

- پەنجا ساڵێك، پێشبینی دەکەم وەڵامەکەت وابێت. مانگی داهاتوو دەبمە بیست و چوار.

بیست مانگ لەمەو بەر پیاوێك بە هەژدە ساڵ مەزەندەی کردم.

کات سکرتێری دەستەیەکی باڵای ئەفسەران بوو لە بەرلین، لە هەمان فەرمانگەدا دۆستایەتی لەگەڵ کاپتنێکی لاو پەیدا کرد، تا لە دواییدا لێی بەدەستگیران کرا. ڕۆژی گوێزانەوە دەستنیشان کرا بەڵام هیچ گوێزانەوەیەك نەکرا. دەسگرەکەی گیراو، پاش چوار ڕۆژان ئەویشیان پیل بەست کرد، گۆستابۆ سێ مانگان خستیانە ژێر ئەشکەنجە، بەتاوانی ئەوەی هەندێ دۆکیۆمێنتی تایبەتی کۆپی کردووە. خۆیشی ئاگای لە هیچ نەبوو. ئەو و جوانە کچێکی دی هەریەکەیان بە دە ساڵ حوکم دران. دەسگرەکەی و دوو

ئەفسەری تریش حوکمی مەرگیان بەسەردا درا. چوارەمیشیان بە کاری قورسی هەتا هەتایی حوکم درا. کات بۆ دیتنی جێبەجێکردنی حوکمی لە سێدارەدانی دەسگرەکەی بانگ هێشتکرا و لە پاشان نێردرایە لەنگریس.

بەیانییەك کات و سێ ژنی تر فەرمانیان پێدرا کە بەسەر کۆمەڵە پێپیلکەیەکی درێژی زۆر لێژدا بخشن کە هەموو نهۆمەکانیان پێکەوە دەبەستەوە. ئەمەیان شێوە مەشق پێکردنێك بوو کە پاسەوانەکان حەزیان لێبوو پێمانی بکەن. دەبووایە کۆت و زنجیر بکرێن و بەم چەشنە بەسەر پێپیلکەکاندا بخشێن سەر لە پێشەوە، ئنجا جەستەش بەدوایەوە.

من نازانم ئایا کات لە نهۆمی پێنجەمەوە کەوت یا خۆی کەواند. بەتەواوی تێك شکا. من هەر گوێم لە هاوارو ئنجا شرقە بوو، چەند ساتێکی بێدەنگی مەرگاوەری بەدوادا هات، کە لەپاشان دەنگێکی تیژ لە بنەوە هاواری کرد : قەحپەکە ملی خۆی شکاند !.

چەند ڕۆژێک دواى مردنى كات، مـن و ژمارەيـەک كەسـانى تـر گواسـترايـنەوە بـۆ كامپى گرتووخانەى ڤاكن لە نزيک بريمين. پێمان گوترا كە ئێمە بۆ " كـارى تايبـەتى لە ڕادەبەدەر گرنگ " هەڵبژێردراوين.

ئەو كارە هەرچييەكى هـەبوو لـە سـوودو بەرژەوەنـدى ئێمـەدا نـەبوو. هـيچ يەكمان لەو باوەڕە دانەبووين كە بۆمان خۆشتر دەبێ لەو كارەى كە پێى ڕاهاتبووين.

ئێمـە وا ڕاهـاتبووين كـە وەک گيانـدارى شـت ڕاكـێش لەبـەردەم گاسـن و خەرماشە و ڕۆڵە و واگۆندا ئيش بكەين و ڕايـان بكێـشين. تـا كاتێـک بـە هۆيانـەوە دەكەوتين و دەمردين. ئێمە بەوە ڕاهاتبووين كە لە كانگە بەردەكاندا ئـيش بكـەين تا بەو ئيشەوە دەكەوتين و دەمردين. هەروەها لە كارگەى (گوش) دا كارمان دەكرد، كە لە وێدا پياو بەهۆى خوێنبەربوونى سييەكانەوە دەكەوت و دەمرد.

هەموو كارەكان وەک يەک وابوون، بە هۆيانەوە دەكەوتين و دەمردين.

# فـــاگـــن

فاگن کاریگەری لە دوولادا دەکرد، وەکو خۆی کە هەبوو، لە ڕاستیدا بریتی بوو لەکامپێکی ئەزموونگەریی پزیشکیی، بەڵام سەرباری ئەوەش بۆمبی تێدا بوو.

لە چەند ڕۆژی یەکەمدا خرامە بەر کاری قورسی هەڵکەندنەوە. وەکو کۆیلە کارمان دەکرد، لە پێنجی بەیانییەوە تا شەشی ئێوارە زەویمان هەڵدەکەند، ڕۆژی سێ جاران گرارێکی ڕوونمان پێ دەدرا. پاشان هەلێکی گەورە ڕەخسا، کە یەکسەر قۆستمەوە: هەلی لێ خۆشبوون !

فەرماندەی کامپ پێی ڕاگەیاندین ئەوانەی خۆیان بەخشیوە، هەلی لێ خۆشبوونیان بۆ ڕەخساوە، دەبوایە بۆ هەر ساڵێکی حوکمەکەت کە ماوتە پازدە دانەیان لێ جێبەجێ بکەیت، ئەوەش مانای ئەوە بوو کە من دەبوایە دووسەدو بیست و پێنجیان لێ جێبەجێ بکەم.

بەڵام خۆ من ڕوونم نە کردووەتەوە، دەبوایە پازدە بۆمبی نەتەقیو هەڵوەشێنییەوە بۆ هەر ساڵێکی حوکمەکەت کە ماوتەو کە دەبێ بەسەری ببەیت. بۆ یەکێکی وەکو منیش کە پازدە ساڵی هەبوو، دەبوایە دوو سەدو بیست و پێنج بۆمبی نەتەقیو هەڵبوەشێنێتەوە، ئنجا لەوانە بوو لێی خۆش بین.

ئەو بۆمبە نەتەقیوانە بۆمبی ئاسایی نەبوون، بەڵکو جۆرێك بوون لەوانەی کە نە بەرگری شارستانی و نە یەکەکانی سوپا نەیان دەوێرا دەستیان لێ بدەن. خەڵکانێك توانیبوویان پەنجایان لێ هەڵبوەشێننەوە بەر لەوەی بکوژرێن، بەڵام

من دڵنیا بووم لەوەی زوو یا درەنگ یەکێك دەگاتە دوو سەد و بیست و پێنج، هەر بۆیەش خۆم بەخشی.

ڕەنگبێ ئەمە هۆی بڕیاردانم بووبێت، یانیش ئەو ڕاستییە بووبێت کە هەموو بەیانییەك بەر لەوەی بچینە دەر، پارچە نانە جۆیێك و پارچەیەك سجووق و سێ جگەرەمان پێدەدرا وەکو زیادە بەشێکی ئازووقە.

دوای ڕاهێنانێکی کەم لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بۆمب، لەلایەن پیاوانی (SS)ەوە بردراین بۆ چەند شوێنێکی جیاواز کە بۆمبی نەتەقیویان لێبوو، کاتێك کە زەویمان هەڵدەکەندو بەدوای ئەو بۆمبانەدا دەگەڕاین، پاسەوانەکانمان بەماوەیەکی باش دوور لەئێمەوە دەوەستان، بۆمبەکان لەوانە بوو، دە تا بیست پێ لەژێر زەویدا بن، کە دەمان دۆزینەوە، دەبوایە خاکو خۆڵیان لەسەر لابەین، وایەرێکمان بەدەوریاندا دەئاڵاندو ئنجا سلینگەکان شۆڕ دەکرانەوە ناو چاڵەکان، دەبوایە هەر جارێك ئەوەندەی کەرتە گرێیەك بڵند بکرێن، تا قیت دەکرانەوە، هەرکە یەك لەو دڕندانەش بەسلنگەکەیەوە شۆڕ دەبۆوە، کەس لەوێ نەدەما، زۆر بەئاگادارییەوە تا بەئاگا نەیەت، بەخێراییشەوە تاچاك دوور کەونەوەو پەنایەك بدۆزنەوە – تەنیا هەر یەك پیاو لەگەڵ بۆمبەکە دەمایەوە، ئەویش ئەو گیراوە بوو کە دەبوایە فیوزی بۆمبەکە بکاتەوە، ئەگەر ئەمەشی نەزانییایە ئەوا ... ... ...

دوو سندووقە تەختەمان لەناو لۆرییەکەدا دانابوو بۆ ئەو کەسانەی کە کارەکەیان نەدەزانی، بەڵام هەموو ڕۆژێکیش پێویستیمان پێیان نەبوو، نەك لەبەرئەوەی خەڵکیی کارەکەیان دەزانی، بەڵکو لەبەرئەوەی هەندێ جار هیچ پاشماوەیەکمان نەدەدۆزییەوە بۆ ئەوەی بیخەینە ناو سندووقەکانەوە.

دەبوایە لەسەر بۆمبەکە دابنیشی بۆ شل کردنەوەی فیوزەکەی، چونکە ئەو دانیشتنە گرتنی فیوزەکەی بەیەك لادا ئاسانتر دەکرد، بەلاّم بۆم دەرکەوت کە باشتر وایە لەژێر بۆمبەکەداو لەناو چاڵەکەدا ڕابکشێی کاتێك کە شتە ترسناکەکە دەهێنرایە دەرەوە، هەروەك چۆن ئاسانتر بوو ڕێ بەتیووبەکە بدەیت بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو دەستە دەستکێشە ئەسبستۆس لەبەرەکەتەوە.

شەست و هەشتەمین بۆمبی من جۆری (ئێریەل تۆرپیدۆ) بوو. پازدە سەعاتمان پێ چوو تا دەرمان هێنا، کە کارێکی وات دەبێ نابێ زۆر قسە بکەی، بەردەوام دەبێ ئاگادار بی، زۆر بەئاگادارییەوە هەڵکەنی، بیر بکەیتەوە بەر لەوەی هێزی زیاتر بخەیتە سەر بێڵەکەت یان بەدەست یان پێیەکانت، هەناسەدانت دەبێ لەسەرخۆ بێ، هەتا جولانەوەکانیشت دەبێ هێمنانە بن و هەر جارەش یەکێکیان بکەیت، دەستەکان زۆر باشن بۆ هەڵکەندن بەتایبەتی ئەگەر مەبەستت بێ خۆڵەکە نەخزێ. خۆ ئەگەر (تۆرپیدۆ)یێك ئەوەندەی داوە موویێك بجووڵێ، مانای کۆتایی هەموو شتێکە. لە باری ئێستایدا بێ دەنگە، بەلاّم کەس نازانێ چی بەمێشکیدا دێ بیکا ئەگەر شوێنەکەی بگۆڕێ، دەبێ شوێنیشی هەر بگۆڕێ، پێویستە بەهۆی سلنگەوە بڵند بکرێ، دەبێ فیوزەکەی لێ بکرێتەوە. پێش ئەمە لێی دڵنیا نین، تا ئەو کاتەش ناوێرین هەناسە هەڵکێشین. بۆیە با دەری بێنین. ئا، پەلەمەکە، لەسەرخۆ بیکە، هەمو جولانەوەیێك لەسەرخۆو هێمنانە بێ.

(ئێریەل تۆرپیدۆ)ی وا دوژمنێکی خوێن ساردە، بێگومان هیچ شتێك ئاشکرا ناکا، پیاو ناتوانێ یاری پۆکەر لەگەڵ ئێریەل تۆرپیدۆدا بکا.

که ڕەهامان کرد، پێمان گوترا نابێ فیوزەکەی لێ بکرێتەوە تا تۆرپیدۆیەکە لە شار دەبرێتە دەر. ئەمەیان، ڕەنگ بێ جۆرێکی تازە بێ، کە کەس نایزانێت یان وا درێژ کرابێت کە ئەگەر فیوزە نەفرەتلێکراوەکە هەناسەیەکی بەرکەوێت، دەتەقێتەوە، خۆ ئەگەر دڕندەیەکی واش بتەقێتەوە ئەوا تەواوی ئەو بەشەی شارەکە دەتەقێنێتەوە.

لۆرییەکی جۆری کروپ – دیزل کە بەسلنگەوە بەسترابوو هات و لەچاوەڕێی بارە قورسەکەیدا وەستا، چوار سەعاتی پێچوو تا بۆمبەکە بەرز کرایەوە، دانراو ئنجا بەسترایەوە بۆ ئەوەی جوولە نەکات.

ئەمە هەمووی کرا، تەماشامان کردو هەستمان بەخۆشی کرد، بەڵام شتێکمان لەبیرچوو.

– کێ دەتوانێ لێ بخوڕێت ؟

خامۆشیی، کە مارێك بە لاقەکانتدا هەڵدەگەڕێت، دەبێ خۆت بکەیتە ستوونێکی بێ گیان، شتێکی مردووی وا کە مار حەزی لێ نەکات، ئێمەش خۆمان کرد بەو ستوونە، بەهزر کشاینەوە ناو قوڵایی تارماییەکان تاکو نەبینرێین، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە نیگای کابرای (SS) بەسەرماندا هاتوچۆی دەکرد، کەسمان تەماشامان نەکرد، بەڵام ئەوەندە لێی بەئاگا بووین، دڵە کوتەمان گرتبوو، گیانە فڕکەمان پێوە نووسا بوو، وەکو قرژاڵ، لاتەریك، لەچاڵەکان دوورە پەرێز، لە ناوەوە و لە دەرەوە لەنێوان دار و پەردوودا.

– ها ... ئەتۆ ! دەتوانی لێ خوری ؟

– – نەموێرا بڵێم، نا.

– پێشم کەوە، !

ڕێیەکە بە ئالآیان نیشان کرابوو، یەك لە نیشانە دیارەکان ئەوەبوو کە ڕێیەکە چۆڵ بوو، چاکیش کرابۆوە، بۆیە ڕووەکەی تا ڕادەیەك لە ئاست یەك

بوو. هەمووی بۆ خاتری خانووە موبارەکەکانیان بوو ! من کەسێکم بەدی نەکرد، لۆرییەکانی تر لەدواوە لە دووری منەوە دەخشین. هیچ هاندەرێك نەبوو وا بکا لەو مەترسییە نزیك ببنەوە. لە شوێنێکدا خانوویێك گڕی گرتبوو، بەبێ دەنگ دەسووتا. دووکەڵەکەی چاوەکانمی زووراندەوە، وام لێهات بەدەگمەن بتوانم ببینم. بەڵام نەموێرا خێرایی زیاد کەم. پێنج دەقیقەی پڕ ئازار بوون بەر لەوەی دووبارە هەوای پاك هەڵمژمەوە.

لە ماوەی ئەو لێخوڕینەمدا نەمزانی بیرم لەچی دەکردەوە، هەر ئەوەندەم دەزانی کە کاتێکی زۆرم هەبوو بۆ بیرکردنەوە، هەروا کە من هێمن بووم، کەمێکیش لەوانەیە دڵخۆش بووم و هەتا کەمێکیش بۆ یەکەم جار لە ماوەیەکی زۆر درێژدا کامەران بووبم، کە چرکەی داهاتوو، ڕەنگبێ دوا ساتت بێ، کاتی زۆرت بەدەستەوە دەبێ بۆ بیرکردنەوە. هەروا، دەشزانم بۆ یەکەم جارە لە ماوەیەکی درێژدا کە هۆشی ئەوەم ببێ بزانم خۆمم، من خۆمم لەبیر کردبوو، هەتا هیچ باوەڕێکیشم بەخۆم نەبوو، کەسییەتیم بەتەواوی سڕابووەوە، تائێستاش پەستیی و شوورەیی پێوەیە، شوورەیی ڕۆژانە. ئەمەیە ئەوەی لێت دەپرسی، خۆم بەخۆمم گوت، ئەمەیە ئەوەی لێت دەپرسی. ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازم. ئەمەیە ئەوەی لێت دەپرسی. ئەوەی کەس نەی وێرا بیکا، تۆ کردت. بۆیە پاش ئەو هەموو شتە، تۆ کەسێکی کە دەتوانیت شتێك بکات. کەسێك کە بۆ بەجێهێنانی مەبەستێك بەکارهێنرابێت. تەماشای ئەم هەموو هێڵی ترامە بکە لە دەرەوە.

لە شار دەرچووم، بەبەردەم دوایین مەزراو کووخە لە تەنەکە دروستکراوەکاندا ڕەت بووم کە لەوێدا دەربەدەرەکان، بێکارو بێنەوایەکان

دەژیان. ڕەنگ بێ خانەدانەکانیش هەر لەوێدا بژین ئێستاش وا جەنگ بەرپا بووەو شارەکە تا دێ هەموو شەوێك پڕ لە چاڵ دەبێت، پیاوێك بەتەنیا زەوی هەڵدەکەند بەسەر خاکەناسەکەیدا کووڕ ببووەوە تەماشایەکی منی کرد.
پێم گوت " ناتەوێ خۆت بشارییەوە ؟ ".
ورتەیەکی لێوە هات، بەڵام لەبەر دەنگی مەکینەکە نەم زانی چی دەڵێت، لە شوێنی خۆشی مایەوە. ڕەنگبێ گوتبێتی، سەفەرێکی خۆش، سەرسام لەوەی کە لەم ڕێیە چۆڵەدا وا لەسەر خۆ لێدەخوڕم.
لەناو شاریشدا لەوانەیە ئێستا بەرەو ماڵ و دوکانەکانیان بخزن. لە پێشا هەرە ئازایەکان و، ئنجا ئەوانی تر دێن، ئاسوودە و دڵشاد. سەیرکە، تا ئێستاش هەموو لەوێن.
لەوانەیە بمتوانیبایە ڕابکەم، لە شەقامە چۆڵەکاندا گەلێك هەڵم بۆ ڕەخسا، دەمتوانی خۆم لە لۆرییەکەوە فڕێ بدەم و بۆ پەناگایەك بخزم، بۆمبەکەش بۆ چەند ساتێك بەبێ لێخوڕ بە جێبهێڵم تا بۆ خۆی لە گرمە دەدات. بەڵام بۆچی ئەم هەڵەم نەقۆزتەوە، نازانم، وام نەکرد. لە ڕاستیدا بەتەواویی خۆشم ڕادەبوارد، من و ئێریەل تۆرپیدۆی دۆستم تەنیا بووین، کەسی تریش بۆ من هیچی پێ نەدەکرا.
ئاڵاکان ڕێگاکەیان هەر نیشان دەکرد، بەڵام لەوێ لەم دەشت و دەرەدا ماوەی نێوانیان زیاتر بوو، لەو کاتەدا ئارەزووی خۆپاراستنی خۆم لەو سەرخۆشییە سەیرەی بێدار بووەوە: هەرنەگەیشتینە جێ ؟ چش ! بەڵام دوای بڕینی ئەو هەموو میلە، دوای نزیکەی بیست و چوار سەعات زۆر خراپە ئەگەر

هەشت میل دوور لەناو ئەو مەزرایەدا، توانیم بوەستم، وەکو چۆن ئەوان پێیان وابوو داگرتنی ئەو تۆرپیدۆیە کارێکی لەتوانا بەدەربوو، بۆیە هەر بەهەڵواسراوییەوە تەقییەوە.

بۆ لێخوڕینی، سێ جگەرەم پێدرا بوو، لەگەڵ تێبینییەك كە شایانی ئەو سێ جگەرەیە نەبووم، بەلام بۆیێ پێم دران، چونکە فۆهەر بێبەش نییە لە هەستی مرۆڤایەتیی.

پێم وابوو ئەو سێ جگەرەیە کرێیەکی باش بوو، تەنیا چاوەڕێی یەك جگەرەم دەکرد.

* * *     * * *     * * *

خراپترین شت کە تووشم هات و کە لەوانەیە تووشی هەموو زیندانییەك بێت، ئەوە بوو نەخۆش کەوتم، کە ڕەنگ بێ هەر ئەوەش ژیانی ڕزگار کردبم. ماوەی پێنج ڕۆژ لەکار دابڕام. ئەگەر هەر یەکێك بەنەخۆش دابنرێ، یەکسەر دەینێرنە نەخۆشخانەی کەمپ، کە لەوێدا ئەوەندە تاقیکردنەوەی لەسەر دەکەن تا وای لێدێت بەکەڵکی هیچ نەیەت، کاتێکیش بەکەڵکی هیچ نایەت کە لەبەر زۆر بەکارهێناندا بمرێت. لەبەرئەوە نابێ خۆت بەنەخۆش دابنێیت. بەلام من لەکاتی ناو بانگکردندا لەهۆش خۆم چووم، کاتێکیش کە هاتمەوە هۆش، خۆم لە نەخۆشخانە دیت.

قەت پێیان نەگوتم تووشی چی بوویم. هیچ نەخۆشێك ئەمەی پێناڵێن. ئەو ڕۆژە هات کە بتوانم هەستمەوە. گەلێك جۆرە دەرزیم لێدرا، منیان خستە ژوورێکی زۆر گەرم و لەوێوە بردمیانە ناو سندووقێکی پڕ لە سەهۆڵ، لەو هێنان و بردنەشدا بەردەوام نموونەی خوێنیان لێ وەردەگرتم. ڕۆژی وا هەبوو

ئەوەندە خواردنیان دەدامێ تا مەست دەبووم، ڕۆژی پاشتر ئەوەندە برسی و تێنوو دەکرام تا دەگەیشتمە ڕادەی لەهۆش خۆچوون، یان سۆندەی لاستیکیان ڕەوانەی ناو هەناوم دەکردو هەرچی تێیدابوو دەریان دەهێنا. ئەو کارە پڕ لەئازارانە یەك لەدوای یەك دەهاتن، لەدواییدا نموونەیەکی گەورەو پڕ ئازاریان لەمۆخی بڕبڕەی پشتم وەرگرت، کە پاش ئەوە دەستەکانم لە باربانەیەکی پڕ لەزیخ بەسترانەوەو بەم چەشنە دەبوایە باربانەکە بەدەوری پەرژینێکدا بەبێ وەستان پاڵدەم. هەر چارەکە سەعاتێکیش هەندێ خوێنیان بەنموونە لێ وەردەگرتم، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە باربانەکەم پاڵدا، لەو کاتەشدا سەرم گێژی دەخوارد، ماوەیەکی زۆر لەدوای ئەم مامەڵەکردنە ژانە سەرێکی بێ ئامانم گرت.

من لە زۆر کەسان بەختەوەرتر بووم، ڕۆژێکیان وایان هەست کرد کە من تەواو، یان لەوانەیە بەکەڵك نەیەم، بردمیانەوە بۆ کەمپ. لەوێ (SS)ێکی دەم بەگرژین پێی ڕاگەیاندم کە لە کاری بۆمب هەڵوەشاندنەوەدا دەرکرام. ئەو بۆمبانەی کە من هەڵیان دەوەشێنمەوە چی تر بۆم ناهێنە هەژماردن. گەڕامەوە بۆ کارکردن لە کانە بەردێکدا.

ئنجا، لەناکاو، پاش ئەم هێنان و بردنە گەڕاندمیانەوە بۆ لای بۆمبەکان، بەڵام هەر پاش ئەوەی ژمارەیەکی باشم لێ هەڵوەشاندنەوە، ناردمیان بۆ لەنگریس. بەم جۆرە هەموو ڕەنجم بەخەسار چوو.

حەفت مانگان لە کانی چەو دەرهێناندا لە لەنگریس مامەوە، کارێکی بێزارکەری لەسەرخۆی شێتانە بوو.

ڕۆژێکیان (SS)ێك هات بەدوامدا. دکتۆرێك پشکنیمی. هەموو لەشم تووشی لیری کێماوی ببوو، شوێنە لیر لێهاتووەکانیان بۆ شوشتم و مەڵهەمیان لێدا. ئنجا دکتۆر لە تەندروستی پێچامەوە، گوتم زۆر باشم، نابێ لە شوێنی

وادا شەکوا لەهیچ شتێك بکەیت. لە جێی وادا پیاو تا هەناسەی پیّ مابیّ باشەو تەندروستیی لەبارە.

بردمیانە بەردەم ئەفسەرێکی (SS)، پەنجەرەکانی ژوورەکەی پەردەیان پێوە بوو، پەردەکان خاوێنیش بوون. پەردە ! پەردەی کەسکی کراوەی بەنەقشی زەرد. پەردەی کەسکی کراوەی بەنەقشی زەرد. پەر ______ .

– کوڕە ئەوە تۆ بۆ زارە بەشکەت گرتووە ؟.

– بۆ هیچ گەورەم، لێم ببوورە، تکایە وا دابنیّ کە زارە بەشکەم بۆ هیچ نەگرتووە، ئیلهامێك وای لێکردم بەدەنگێکی نزمەوە بڵێم " تکایە وام بۆ دابنیّ کە هەر لەخۆڕا زارە بەشکەم گرتووە ".

بەشڵەژاوییەوە سەیری کردم، ئنجا ئەو ئەندێشانەی وەلاناو، پارچە کاغەزێکی دەرهێنا.

– دەکریّ لێرەدا بۆمان مۆر بکەی کە تۆ خۆراکی ئاساییت پێدراوە، بەهیچ جۆرێك برسی و تێنوو نەکراویت، هیچ جۆرە هۆیێکیش نییە کە لە بارودۆخی ئێرە شەکوات هەبیّ لەماوەی مانەوەت لێرەدا.

مۆرم کرد. چ بایەخێکی هەیە ؟ دەبیّ نەگوازرێمەوە کامپێکی تر ؟ یان دەبیّ نۆرەم نەبیّ بۆ لە سێدارەدان ؟

بەڵگەنامەیێکی تر، یەکێکی دیمەن زۆر ترسناك، خرایە بەردەمم.

– لێرەشدا بۆمان مۆر بکە کە مامەڵەی توند، بەڵام باشت لەگەڵدا کراوەو، هیچ کردارێکت بەپێچەوانەی یاسای نێو دەوڵەتییەوە لەگەڵدا نەکراوە.

مۆرم کرد. چی دەبیّ با ببیّ.

– ئەگەر قەت ئەوەندەی تۆسقاڵێك لە بابەت هەرچییەکی لێرەدا دیوتە یان بیستووتە بدرکێنی، ئەوا دووبارە دێیەوە ئێرەو، ئەو کاتە پێشوازییەکی تایبەتیت بۆ ئامادە دەکەم، تێگەیشتی ؟

- بەڵێ تێگەیشتم، گەورەم.

بەم جۆرە گواسترامەوە.

خرامە ناو زیندانێکی تاکانە، کە لەوێدا بەدلەیێکی سەربازیی بێ هیچ جۆرە روتبەو نیشانەیەك فڕێ درابوو، پێم گوترا لەبەری کە .. نینۆکەکانیشت پاك بکەوە، خوێڕی ! ، ئنجا (SS)ێك بردمیە فەرمانگەی فەرماندارەوە کە لەوێدا یەك مارك و بیست و یەك فینکم پێدرا لەبری حەفت مانگ کارکردنم لە شەشی بەیانییەوە تا هەشتی شەو. شتابچارفۆهەرێك بەسەریدا هاڕاندم :

- زیندانیی ژمارە A ٥٥٢٣١٨ - بۆ بەڕەڵلابوون - دەر- چۆ !

بەم جۆرەش هەر ئازاری پیاو دەدەن. من زۆر شاناز بووم بەوەی کە نەم هێشت ئاواتەکانم هەڵبچن، بەگورجی وەرچەرخام و دوورکەوتمەوە، چاوەڕێی ئەوەم دەکرد لەقاقای پێکەنین بدەن. بەڵام ئەوان لەوە زرنگتر بوون، خۆیان لە پێکەنین بەدوور گرت، لەدالأنەکەدا دانیشەو چاوەڕێ بە !

لەوێدا پێ نەدەکەنین. لەدواییدا گەیشتە هێسکانم، چونکە زیاتر لە یەك سەعات چاوەڕێم کرد، بیری نادانانەم بەبیردا هاتن، سەرسام بووم لەوەی کە خەڵك چۆن وا نابووت و بەدکردار دەبن، بەڵام بەخۆمم گوت، خۆ بۆ خۆت دەبینی کە وان. وام زانی تۆ ئەم جۆرە بیرە منداڵانەیەت واز لێ هێناوە.

هەتا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت من بەهۆی ئەو پەشۆکانە بێدەنگە تەواوەوە هەرەسم هێناوە کە تیایدا دوای فیلدۆبیلەکە کەوتم تا ناو ئۆتۆمبێلە ئۆپڵە خۆڵەمێشییەکەی، دوای ئەوەی پێیان گوتم لێبووردنم بۆ دەرچووە و لەمەودوا لە بەتالیۆنێکی سزادراودا کار دەکەم.

دەروازە گەورە قورسەکە لە دوامانەوە پێوەدرا، خانووە چیمەنتۆییە خاکییەکان، خۆیان و پەنجەرە بچکۆڵە شیشدارەکانیان بزر بوون، من لەو ترس و لەرزە بێناوە دەربازم بوو.

من لەمە تێنەگەیشتم، گێژبووبووم، نا، ترسابووم، بەجۆرێکی وا کە کاتێ لە گۆڕەپانی سەربازگەی هانۆڤەردا دەڕۆیشتین، تا ئەو کاتە بەتەواویی بەهۆش خۆم نەهاتبوومەوە.

ئێستاش، دوای چەندین ساڵ، ئەو ترسە بێ ناوە و ئەو هەموو تۆقینەم نایەتەوە بیر، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە ئەمانە کۆن بوون و بەسەر چوون.

بەڵام ئەم ترس و بیمەم لە چی ؟ لەکاتێکدا لێی دوورکەوتوومەوە ؟

تا ئێستاش وەڵامی ئەم پرسیارەم نەداوەتەوە.

* * *     * * *     * * *

ڕۆژێ بیست جاران بە جوێن و لەعنەتێکی زۆرەوە پێمان دەگوترا کە ئێوە سەر بە بەتالیۆنێکی سزادراون، کە ئەمەشیان مانای ئەوە بوو دەبێ ئێمە ببینە باشترین سەرباز لە جیهاندا.

لە شەش حەفتەی یەکەمدا لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە تا حەفت و نیوی شەو مەشقمان دەکرد. تەنیا مەشق.

# سەدو سیی و پێنج لاشە

ئەوەندە مەشقی سەربازیمان پێ دەکرا تا خوێن لە نینۆکی پەنجەکانمان فیـچقەی دەکـرد – ئـەم قـسەیە وەك لێـچوانێکی ئـەدەبیی ناکـەم – بـەڵکو ڕاستییەکی ترسناکە.

یا واش دەبوو وەك ڕۆیینـی قـاز بەهـەموو کـەل وپـەلی سـەربازیمانەوە بە ڕێگادا هەڵدەزەقینەوە : بە کڵاوی پۆلا، بە کۆڵی پشت، هەگبەی تەقەمەنی پڕ لە زیخ، سەرباری ئەوەش پاڵتۆمان لەبەر بوو، کەچی کەسانی تر بە جل و بەرگی هاوینە دەسوڕانەوە و لەگەرماندا ناڵەیان دەهات.

یا بەناو قوڕو لیتەدا کە تا ئەژنۆمان دەهات ڕێگامان شەق دەکرد، لە ناو ئاودا کە تا نزیك ملمان دەهات ڕادەوەستاین و مەشقی تفەنگمان دەکرد بێ ئەوەی هیچ گرژییەك بەدەم و چاومانەوە دیار بێ.

دەرەجەدارەکانمان دەستەیەك شەیتانی سەگلوور بوون، ئەوەندەیان بەسەرماندا دەهاڕاند و هاواریان دەکردینێ تا وامان لێ دەهات دەگەیشتینە لێواری شێت بوون. ئەوان چاوپۆشییان لە هیچ هەڵێك نەدەکرد.

هیچ سزایەك ئەوەندەی بێ بەشکردن لە ئازادیی ناخۆش نەبوو، بۆ کەمترین هۆ لە ئازادیی بێ بەش دەکراین. هەر ئەرك و هەر ئەرك و، هەر ئەرك بوو. ڕاستە سەعاتە وەختێکمان بۆ خواردنی نیوەڕۆ هەبوو، ڕاستیشە هەر بە قسە، لە کاتژمێر حەفت و نیوەوە تا کاتژمێر نۆ ئازاد بووین، بەڵام ئەگەر هەر چرکەیەکی ئەو کاتەمان بۆ خاوێن کردنەوەی جلە قوڕاوییەکانمان و، شتە

چەرمینەکان و کەل وپەل و، بووتەکانمان تەرخان نەکردبایە ئەوا ئەم کارەمان بەترسناکترین تۆڵەستاندن فێر دەکرا.

دەبوایە کاتژمێر نۆ لەناو نوێنەکانمان بین، بەڵام ئەمە بۆ خەولێکەوتنمان هەمان شت نەبوو. هەموو شەوێکی تاك، مەشقی ورياكردنەوەو مەشقی جلك گۆڕینی خێرامان هەبوو.

هەرکە زەنگی ورياكردنەوە لێیدەدا بە شڵەژاویی دەردەپەڕین، تەواویی پێداویستیی جەنگیمان دەکردە بەرخۆ و دادەبەزین، ئنجا دیسان دەمان گۆڕییەوەو جلی تايبەتی مەيدانی نمايشمان دەپۆشییەوە، پاشان بۆ مەشقکردن، لە کۆتاییشدا دیسان جلی مەيدانمان دەپۆشی، قەت چاکمان بۆ نەدەرەخسا، هەموو شەوێك بۆ ماوەی دوو کاتژمێر وەکو گەلە ئاژەڵێکی ترساو سەرەو ژێر وسەرەو ژوور بەسەر پێپیلکەکاندا ڕاوەدوويان دەناين، وردە وردە کەوتینە بارێکی وا کە تەنیا سێبەری دەرەجەدارێك بەتەواویی بەس بێ بۆ ئەوەی بەترسێکی شێتانەوە لەخۆ بچین.

هەرکە شەش حەفتەی یەکەم بەسەرچوون، دەستمان بەمەشقی تفەنگ و مەشقی مەيدان کرد. ئەمانە فێریان کردین کە ماندوو بوون چییە.

فێری ئەوە کراین کە بە درێژایی چەندین میل لە مەيدانی مەشقکردندا بەسەر زگمانەوە بخشین، بەناو ژیلەمۆو بەردەستێی تیژدا کە هەموو ناو لەپەکانمانیان دەدڕی و دەيان کردن بەپارچەیەکی خڵتانی خوێن، یان بەناو

قوڕەڕەشی بۆگەنـدا دەخـشین کـە ئەوەنـدەی نـەدەما بمـان خنکێنێـت، بـەڵام ڕێپێوان بوو لە هەموو شتێك زیاتر لێی دەترساین.

شەوێکیان لەناو نوێنەکانمان وەدەرنـراین، دەرەجەدارەکـەمان بـە بۆڕەبۆڕ لـەو ژوورانـە وەژوور کـەوت کـە تیایانـدا نووسـتبووین، خـەوی مردووانمـان لێکەوتبوو:

– ئاگاداریی ! ئاگاداریی ! .

بە لەشـی ماندووەوە لـەناو نوێنەکانمان دەرپـەڕین، دۆڵابـەکانمان خستە سـەر گـازی پـشت و بەخێرایـیـەکی شـێتانەی لەعنـەتبارەوە بەدلـەکانمان لەبـەرکردن. قایـشێك بەزەحمـەت دەبەسـترێت، بزمەیـەکی سـەر سـەخت، بـە فیڕۆچوونی نیـو چرکە، ئەمانـە هـەمووی بـەلا بوون، پـێش ئـەوەی دوو دەقیقـە بەسەر بچێت لە دەرەوە لـە دالانەکانـدا دەنگـی فیکەکان هاڕەیـان هـات، دەرگـای ژوورەکانمان بە پێلەقە کرانەوە.

– سـرییەی ژمـارە ٣ – دا بـە – زن ! بـۆ خـاتری خـوا، ئێـوە، ئـەی گـەواد و بۆگەنینە، تائێستا نەچونەتە خوار بۆ مەیـدان ؟ نوێنەکانیشتان چاك نـەکراوە ؟ وا دەزانن ئێرە خانەی پەك کەوتووانە ؟ هەی حوشترە تەمبەڵینە ! .

بە شڵەژاویی بەپێپیلکەکاندا شۆڕ بووینـەوە، دوایین قایشمان دەبەسـت، پـاش چـەند چـرکەیەك لـە مەیـدانی سـەربازگەکەدا هـەمووومان لـە دوو ڕیـزی شەپۆلکردوودا وەستاین، ئنجا هۆڕژنێك هات :

– سرییەی ژمارە ٣ – دوو دوو بۆ ژوورەکانتان ! .

سەیر بۆ ئەوانەی کە هیچ شتێك لە ناو سەریاندا ناتەقێت لەبەر ئەم جۆرە هاوار کردنە ! یا ڕەنگ بێ دەستکارییەکی ئـەو شوێنەیان کردبێـت کـە خـەڵکی

ئاسایی  هەستی خۆیانی لەناو دەپارێزن. قەت تێبینی ئەوەت نەکردووە کە ئەوان چۆن قسە دەکەن ؟ ناتوانن بەشێوەیەکی ئاسایی بدوێن. وشەکان لەناو ڕستەکانیاندا پێکەوە دەنووسێن تا وایان لێدێت دەبنە وەڕین، وشەی دواییش لەناو شریخەی قامچیدا بزر دەبوو، ئەگەر ئەمەیان بەهەر جۆرێك بۆ بڕەخسا با. قەد گوێت لێیان نەدەبوو کە ڕستە بەبڕگەی بێ نەبڕە کۆتایی پێبهێنن، هەمووشتێکیان دەکردە پارچەی سەربازیی و، دەیان کردە شتی نا ئاشکرا. هەر هاوار بوو، بەردەوام هەر هاوارکردن بوو، ئەوانە شێتن، ئەو خەڵکانە.

وەکو لافاوێك کە هەموو شتێك لەبەردەم خۆیدا ڕادەماڵێت، ئێمە ئەو سەدو سیی و پێنج تازە سەربازە ڕژاینە سەر پێپیلکەکان بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە ژوورەکانمان و جلەکانمان بگۆڕین، بەر لەوەی دووبارە هاواری، دا بە — زن، دەنگبداتەوە.

دوای ئەوەی دەیان جار بەسوێند لێخواردنی شێتانە و بە نەعلەت لێ کردنەوە سەرەو ژێرو ژوور ڕاو نراین دووبارە خۆمان لە گۆڕەپاندا دۆزییەوە. ئارەقەمان لێ دەچۆڕاو بەچاوی پڕ شۆڕەوەو بەتەواوی کەل و پەلی ڕێپێوانەوە، ئامادە بۆ ئەنجامدانی ڕاهێنانی شەوانە.

فەرماندەی سرییەکەمان، کابتن لووپی یەك دەست، بەزەردەخەنەیەکی سست، ڕاوەستابوو، ئێمەی دەپشکنی. داوای لە دەستەکەی دەکرد کە ڕاهێنانێکی ئاسنین ئەنجام بدەن، ڕاهێنانێکی نا مرۆڤانە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش وامان دەزانی کە ئەو، تەنیا ئەو، لەنا هەموو ئازاردەرەکانمان، شتێکی مرۆڤانەی لا هەیە. بەلانی کەمەوە ئەو ئەم شیاوییەی هەیە کە هەرچی بەئێمەی دەکات خۆشی لەگەڵماندا بیکا. هیچ کاتێکیش داوای ئەوەی لێ نەکردووین شتێك ئەنجام بدەین کە خۆی پێی نەکرێ، کاتێکیش کە لەهەر ڕاهێنانێکدا

دەگەڕاینـەوە، ئـەو وەك ئێمـە پـیس دەبـوو. لەبـەر ئـەوە، مرۆڤێکـی بـاش بـوو، کەسێك بوو کە ئێمە لێی ڕانەهاتبووین، ئێمە لـە دەسـەلاتدارێکی وا ڕهـاتبووین کە قۆچی قوربانیی لـەناو ئێمـەدا دەست نیشان دەکرد، هـەژارێکی بێنـەوای وا کە هەمیشە بەدوایـەوە دەبێت و قـەتیش بـەجێی ناهێڵێت تـا دەی فەوتانـد، بـێ هـۆش دەبـوو، بـێ توانـا دەبـوو، بـەهۆی مانـدوو بوونـەوە دەمـرد یـا خـۆی دەکوشت. کاپتن لووپی نەقۆچی قوربانی هـەبوو نەکەسێکی پەسـند - ئـەو لـەو جـۆرە ئەفسەرانە بـوو کـە سـەربازەکانی خـۆی وا لێکردبـوو لـەپێناوی ئـەودا خۆیان بخەنە ئاگرەوە، چونکە خۆی بۆ ناو ئاگریش پێشیان دەکەوت و چونکە خۆشـی بـاش بـوو. ئەگـەر ئازایـەتیی و چـاکیی ئـەو پیـاوە بـۆ خزمـەتی ئامانجەکانی هتلەر نەبووایە، ئەگەر لە هەر لەشکرێکی تردا ئەفسەر بووایە، ئەو کاتە بێگومان خۆشم دەویست، بەلام ئێستاش، ڕێزی دەگرم.

فەرماندەکـە بـەخێرایی پۆشـاکی سـرییەکەی خـۆی پـشکنی، ئنجـا ئـەو کـارەی بـەکۆتا هێنـاو، دەنگـە تیـژە، فەرماندەرەکـەی بەگۆڕەپانەکـەدا شـریخەی هات :

- سرییەی ژمارە - ٣ - ئاگادار - بن ! چاوتان بۆ پێش ! چەك بۆ - شان ! .

سێ شرقەی ئاوازدار لـە نـاخی شـەودا دەنگیـان دایـەوە، کـاتێ کـە سـەدو سـی و پێنج تفـەنگ پێکـڕا خرانـە سـەر شـان. چـەند چرکەیەك بـێ دەنگییـەکی تەواو - هەموو ئەفسەرێك، دەرەجەدارێك و سـەربازێك وەك لوولـەی تفـەنگ ڕەق ڕاوەستان، لەژێر کڵاوە ئاسنینەکانەوە سەیری پێش خۆیان دەکرد، قوڕ بەسـەر ئەو هەژارە بەد بەختەی کە بەقەدەر داوە موویێك دەجولێتەوە ! .

دووبـاره دەنگـی کاپتنەکـه بـەناو دار ئەسپیندارو خـانووه ڕەنـگ خاکییـەکانی سەربازگەکەدا نەڕەی هات:
- بەلای ڕاست - بۆ پێشەوە ! بۆ لای ڕاست - بسوڕێن - خێرا - بۆ پێش ! ،

کـه پاشـنەی ئاسـنینی بووتـەکانمان بـه زەوییـه چـیمەنتۆکەدا کێـشا، گرمەیـــەك هـــات و پریـــشکه ئـــاگری فـــڕێ دا. لـــه دەرەوەی گۆڕەپـــانی سەربازگەکەشدا، لەسەر ڕێگا تەڕ و باراناوییەکەدا کە بە دار ئەسپیندار دەورە درا بوو، خلۆر دەبووینـەوە. لـه بـەتالیۆنێکی سزادراودا بێگومـان هـەموو جـۆرە گۆرانی گوتن و گفتوگۆیەك قەدەغەیە. خەڵکانی پلە چوار بۆیان نییـه سوود لـه ئیمتیـازاتی سـەربازی ئـەڵمانیی ببیـنن. مـافی ئـەوەشمان نـەبوو نیـشانەی سەربازیی (داڵ) یا هـەر نیشانەیەکی تری جیاکـەرەوە ببەستین، ئەوەی پێمـان ڕەوا بینرابوو، شریتێکی سپی باریك بوو ( کە هەمیشە هەر دەبوایە سپی بێت ! ) کـه بەسـەر قـۆڵی ڕاستماندا دەهاتـه خـوار بـه پیـتی ڕەنـگ ڕەشـیش وشـەی (SONDERABTEILUNG)ی لەسەر نووسرابوو.

چـونکه دەبوایـه ئێمـه باشـترین سـەربازی جیهـان بـین، بۆیـه هـەموو ڕێپێوانـەکانمان، ڕێپێـوانی قـورس بوون، هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو یـەك چارەکە سـەعاتی پێنـه دەچـوو لـەشمان هـەڵمی دەکـرد. پێیـەکانمان گـەرم دادەهـاتن، دەممان بەش دەکرد و هەناسەمان پێ هەڵدەکێشا، چونکه لووت بەتەنیا توانـای دابینکردنـــی ئۆکـسجینی تـەواوی نـەبوو. بەنـدی تفەنگـەکانمان و قایـشی شـانەکانمان ببوونـه بـارێکی قـورس بەسـەر سـووڕی خـوێن لـه باسـکەکانمان، ئەنگوستەکانمان سپی هەڵگەڕابوون و ئەستوور ببوون، کەمێکیش تەزی بوون، بەڵام ئەمانە هەمووی شتی بێ بایەخ بوون ئەوەندە گوێمان پـێ نـەدەدان. وامـان

لێهاتبوو دەمان توانی ڕێپێوانێکی قورسی شازدە میلیی ئەنجام بدەین بێ ئەوەی هەست بەهیچ ناڕەحەتییەك بکەین.

ئنجا نۆرەی ڕاهێنانەکان هات, پێشڕەوکردن بە پێکهاتەی کراوە، بەچوونە پێشی کورت هەنگاو، هەر جارەو یەکێکمان، بەو سیبیانەی کە وەکو مووشەدەمە کاریان دەکرد، بەو دەشت و دەرە وەربووین، ڕامان دەکرد، بەناو کێڵگە شێدارو، سەهۆڵبەندەکاندا دەخشین، بەئامێرە کورتەکانی خەندەك هەڵکەندنەکانمان، وەك ئاژەڵی ترساو خۆمان دەخزاندە ناو چاڵە هەڵکەنراوەکانەوە.

بەڵام، بێگومان، قەت ئەو کارەمان بەو خێراییە نەدەکرد کە پێویست بوو، هەموو جارێکیش فیکەکان دەیان گەڕاندینەوە دواوە، لەوێدا بە هەناسەی سوارەوە بۆ ماوەی چەند چرکەیەك دەوەستاین تا بە لەعنەت دەکراین. لە پاشان دووبارە دەستمان پێ دەکردەوە، بۆ پێش، بۆ پێش – بۆ پێش. هەموو گیانمان بە قوڕو لیتە سواخ دەدرا. لاقەکانمان دەلەرزین، جۆگەلەی ئارەقە بە لەشماندا دەهاتە خوارێ و، پێستەی لەشمانی دەزووراندەوە، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە بەهۆی قایشە داخوراوەکان و کەل وپەلە قورسەکانەوە تووشی ڕووشان دەبوون و بریندار دەبوون. ئارەقە لە جلەکانمانەوە دەچۆڕایەوەو جێ جێ ئارەقە بەپشتی چاکەتی زۆرانمان دیار بوو. بەدەگمەن شتمان بەدی دەکرد، چونکە ئارەقە کوێرەی کردبووین. نێوچەوانمان دەخوراو دەزوورایەوە، چونکە بەدەستی پیس و قوڵی زبرو زووری چاکەتەکانمان دەمان سرییەوە. ئەگەر بوەستابایینایە، جلکە تەڕبووەکانمان دەبوون بەئاسنی سارد، ناو ڕان و ناو گەڵمان داڕوشابوون و خوێنییان لێ دەهات. لە ترسانا ئارەقەمان دەکرد.

ماندوو و مردوو، گێلانە دەرکمان بەوەکرد کە ڕۆژ بۆتەوە. ئنجا کاتی ئەوە هات کە مەشقی پەلاماردانی ئاسمانیی بکەین.

بەسەر ڕێگا سەختەکەدا بە ڕاکردنێکی قورس دەستمان پێکرد. هەموو بەردێك، هەموو گۆماوێکی گچکە، خۆ چاڵە قووڵە نەفرەتلێکراوەکان کە چاوە ترساوە زەقەکانمان بەدییان نەدەکردن، هەر باسیان لێوە ناکرێ، ئەمانە هەموویان وایان لێ دەکردین کە هەموو هەستمان ئاراستەی ئەوە بکەین کە پێیەکانمان بەدروستیی کاردانەوە ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی خلیسك نەبەن، تێ هەڵنەگلێن یا بە هەڵە پێیەکمان دانەنێین. تەنیا کاری وەگەڕخستنی پێیەکان، وەك پێویست، یا ڕاکردن و ڕۆیشتن، کارێکن کە مرۆڤ بێ بیرکردنەوە ئەنجامیان دەدا، بەڵام بۆ ئێمە ببوونە هەوڵدانێکی پڕ لە ئازاری لەشیی و عەقڵیی. لاقەکانمان زۆر قورس ببوون. نائومێدانە قورس بوون. زۆر بە زەحمەت لنگمان دەداو لوولمان دەخواردو بەو لاو بەم لادا بەلنگە لۆقێ، هەنگاومان دەنا. دەم و چاوە جیاوازە ڕەنگ پەڕیدە چاو بە قووڵداچووەکانمان سوور هەڵگەڕابوون، چاوەکانمان توند و زەق، دەمارەکانی نێو چاوانمان ئاوسابوون، بۆ هەناسە هانە هانمان بوو، ناو دەممان وشك و لینج بوو، ناو ناوەش هەناسە بڕکێ چەند دڵۆپە کەفێکی دەڕشاند.

فیکە هاڕەی هات و بۆ هەردوو لای ڕێگاکە دەرپەڕین، کوێرانە خۆمان هەڵدایە ناو خەندەکەکانەوە بێ گوێ دانە ئەوەی ئەستری یا ئاو لە ناوەوە هەیە یان یەکێکی تر بەر لە ئێمە خۆی تێ هەڵدابێ. ئنجا پێشبڕکێی شێلگیرانە دەستی پێکرد بۆ دانانی مۆرتارو ڕەشاشەکان لە شوێنی خۆیاندا. ئەمانە هەموویان لە ماوەی چەند چرکەیەکدا کران، باشترە پەنچەکانت پارچە پارچە بین یا شەق بەر پشتت بکەوێ لەوەی لەسەرخۆبی.

ڕێپێوانمان دەست پێکردەوە، میل لە دوای میل. باوەڕم وایە من هەموو شتێك لە بابەت ڕێگاکانەوە دەزانم :

ڕێگای خۆش، ڕێگای سەخت، ڕێگای پان، ڕێگای تەسك، بەردین، قوڕاویی، چیمەنتۆکراو، زەلکاویی، بەفراویی، گرداویی، چەوڕێژ، خلیسکاویی، تۆزاویی، لاقەکانم هەموو شتێکیان لە بابەت ڕێگاکانەوە فێرکردووم کە پێویستە بیانزانم، دوژمنانی دلڕەق و ئازاردەرانی پێیەکانم.

باران وەستا. ڕۆژ هەلات. ئەمەشیان مانای تینوویەتی، سەر قورسیی، ژانە سەر، چاو ڕەشکەوپێشکە کردنە. پێ و گۆزینگەکان لەناو بووتە گرگرتووەکانمان دەئاوسان. بەجۆرە جەزبەییێکی سەیرەوە خۆمان بۆ پێش ڕادەکێشا.

کاتی نیوەڕۆ فەرمانی وەستانمان پێدرا. ماسوولکەکانمان ئەوەندە ئازاریان پێگەیشت بوو، تەنانەت بۆ وەستاندنیشیان هەر ژانیان دەکرد، هەندێکمان بگرە توانای وەستانیشیان نەبوو، پاش فەرمان پێدانەکە تلیان دەخواردەوە تا خۆیان بەئەوانەی پێش خۆیان دەکێشاو لەوێ دەوەستان و بەسەری پێدا شۆڕبووەوە بەم لاو بەو لادا دەچوون تا ئەوانی تر پالیان پێوە دەنانەوەو دەیان بردنەوە شوێنەکانی خۆیان.

گەیشتینە دەورو پشتی یەك لە گوندە بچووکەکان. جووتە لاوێك بە هەلەداوان بۆ لامان هاتن بۆ ئەوەی تێمان ڕابمێنن. نیو سەعات پشوودانمان پێدرابوو، بەبێ وەستان و بێ ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە کە پەنجا میل لە سەربازگەوە دوورین لە شوێنی خۆماندا خۆمان بە زەویدا کێشا، بێ ئەوەی هەتا قایش و پشتێنەکانیشمان شل کەینەوە، هەرکە خۆمان بە زەویدا کێشاو، بەر لەوەی بگەینە زەویش خەومان لێکەوت.

هەر ئەو ساتە، یان وا هەستمان دەکرد، فیکەکە هاڕەی هاتەوە. بەڵام سێی دەقیقە تێپەڕی بوون، کە هەموو پشوودانە بە نرخەکەی ئێمە بوو. چارەکە سەعاتی دوای ئەمە دۆزەخێك بوو پڕ لە ئازار.

ماسوولکەی ڕەق بوو، پێی هاوار کردوو، نەیان دەویست دووبارە وەگەڕ بکەونەوە. هەموو هەنگاوێك بریتی بوو لە زنجیرەیەك ژان و ئازار، کە یەکسەر بەرەو مێشك دەچوو. پاشنەی پێیەکانمان هەستیان بە هەموو بزمارێکی ناو بووتەکانمان دەکرد، بۆیێ وامان دەزانی لەسەر پارچە شووشەی شکاو دەڕۆین.

بەڵام هیچ یارمەتییێك نەبوو، هیچ لۆرییەك نەبوو بۆ هەڵگرتنەوەی ئەوانەی کە دەکەوتنە ناو خەندەکەکانەوە. نەخێر، ئەوان، بەستەزمانانە، هەڵسوکەوتێکی تایبەتییان لەلایەن لیفتنانت و هەر سێ دەرەجەدارە دڵڕەقەکەی سرییەکەمانەوە لەگەڵدا دەکرا. ئەوەندە بەسەریاندا دەیان هاڕاندو گەفیان لێ دەکردن تا شێت دەبوون و بەدەشت و دەران دەکەوتن، یا بێ هۆش دەبوون، یان وەك مرۆڤێکی خۆکاری بێ ئیرادەیان لێ دەهات و بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەموو فەرمانەکانییان جێبەجێ دەکردو، ئەگەر فەرمانیان پێ بدرایە لە پەنجەرەی نهۆمی چوارەمەوە خۆیان تێ هەڵدەدا. گوێمان لێ بوو، دەرەجەدارەکان بۆڕەو هاواریان بوو، گەف و گوڕی ئەوەیان دەکرد کە هەندێ لەو بەد بەختانە بەر پرس بکەن لەوەی کە فەرمانەکانیان بەخێرایی ئەنجام نەداوە.

لە پاشان لەکاتی ئێوارەدا بەرەو گۆڕەپانی سەربازگە کەوتینە ڕێ، توانای ڕاوەستانمان نەمابوو. ئامادە بۆ کەوتن.

– سەربازان – بۆ پێشەوە !

بەدوایین کۆششەوە خۆمانمان ڕاکێشا. لاقەکانمان ئاسۆیانە دەهاوێشت و پێیەکانمان بەڕووی ڕێیە بەردرێژەکەدا دەکێشا. پریشکە ئاگر لەبەر چاوماندا لوولیان دەخوارد. چاك هەستمان دەکرد پۆرگەکان دەتەقن. بەلام هەر دەبووایە بڕۆین. هەر لاقە لەنگەکانمان بە زەبر لە زەوی دەداو، ژانەکەمان وردو خاش دەکرد. هەموو توانا هەلگیراوەکانی خۆمانمان کۆدەکردەوە.

فەرماندەی کامپ، ئوبەرست لیفتنانت (فۆن دێر لینن) لەو شوێنە وەستابوو کە لەوێوە بەرەو سەربازگەکەمان وەردەچەرخاین کاپتن لووپی فەرمانی دا :

– سرییەی ژمارە ٣ – بۆ چەپ ! بنۆڕن !

بەتەواویی سەرمان بەرەو چەپ وەرسوڕاند، هەمووشمان چاومان بڕیە شێوەی نابووتی کۆلۆنێل. بەلام ئەو جوولە توندانەی کە بەشێك بوون لە سلاو وەرگرتن، بەهیچ جۆرێك بەو توندییە نەبوون، هەتا لاقەکانیشمان بەیەکەوە نەدەهاوێشت تەنانەت توانای هەنگاونانیشمان نەبوو .. کاپتن لووپی ڕاچەنی، وەستا، چووە لای تەنیشت و چاودێری سرییەکەی خۆی کرد. ئنجا نەڕەیێك هات :

– سرییەی ژمارە ٣ – وەستان !

دەنگی کۆلۆنێل بوو، ساتێك بێ دەنگیی گۆڕستانان بوو، ئنجا کۆلۆنێل لە هاڕژنی دا :

– کاپتن لووپی، توخوا بەمە دەلێی سرییە ؟ ئەگەر دەتەوێ لەگەل بەتالیۆنە پیادەکەی تردا بچیتە بەرەکانی جەنگ، پێمان بلێ. ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرانمان هەن کە بەدلشادییەوە پێیان خۆشە لەم سەربازگەیەدا جێی تۆ بگرنەوە.

دەنگی کۆلۆنێل بە تووڕەییەوە گرمەی هات :

- بۆ خاتری خوا ئەم کۆمەڵە ناپاکە ناکەسە چییە ؟ ئەو ڕانەهێنراوە ڕەشۆکییانە چین ؟ کەس هزری ئەوە ناکا کە ئەمانە سەربازی پروسیایین، پیاو وادەزانێ ئەمانە کەسانێکی گەڕی ناکەسبەچەن. بەڵام ئەمە چارەسەر دەکەین !

بە فیزەوە، سرییە ماندووەکەی ئێمەی پشکنی. بەسەرسامییەوە لەوێدا وەستاین. هەر خوا دەکا زوو ئەم کارەی تەواو دەکا، بۆ ئەوەی خۆ بگەیەنینە سەربازخانەو، جلەکانمان داماڵین و لێی بخەوین. بەگەف و گوڕەوە دووبارە گوتی " ئەمە چارەسەر دەکەین " ئەم ناکەسانە پێویستییان بە ئیش هەیە، بە کەمێك ڕاهێنان، وا نییە کاپتن لووپی ؟.

- بەڵێ وایە، جەنابی هێر ئوبێرست لیفتنانت، کەمێك ڕاهێنان. ڕق و کینەیەکی لەسەرخۆ لەناومانـدا دەسـتی بەسـەرهەڵدان کـرد کـە لەگـەڵ بـەزەیی بەخۆداهاتنەوەدا تێکەڵ بوو، ئەمە وا دیارە بەلای کەمەوە دەمانخاتە بەر یەك کاتژمێر لە قورسترین جۆری ڕاهێنـان لـەناو سوپای ئەڵمانـدا، دێوانـەترین و ماندووکـەرترین ڕاهێنـان لـەناو ئـەو سوپایەدا. ئەمـە تـەنیا واتـای ڕێپێوانـە ئازاردەرەکە دەبەخشێ.

قـەت بـووە لووەکـانی نـاو گـەلانت بئاوسێن و لەبەر زۆر ئیش کـردن ڕەق بن، بەجۆرێك لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا ژان بکەن، بووە ماسولکەکانی ڕانت خڕو ڕەق بن و ناوناوە بەهەموو هێزتەوە پێیانـدا بکێشیت بۆ ئـەوەی دووبارە بیـان خەیتەوە ئیش، هیچ بووە ماسولکەکانی لاقت بەهۆی گرژ بوونەوە وێك بێنـەوە، هەر بووتێکی کە لە پێتە وابزانی سەد ئەوەندە قورسەو هـەر لاقێکیشت یـەك تەنە، ئنجا بەم حاڵەوە هەوڵ بدەی لاقەکانت تا ئاستی ڕانەکانت بەرز کەیتـەوەو پەنجەکانیشت ڕێك بوەستێنیت، ئەم جووڵەیە بەشێوەیەکی وا ڕێك و سووك و ئاوازدارەوە ئەنجام بدەیت وەك هەڵپەرکێی تیپێکی کیژۆڵان ؟

پاشان، قەت ئەوەت تاقیکردوەتەوە کاتێك گۆزینگەکانت بێ هێز دەبن، چونکە دەمێکە وازیان لەم گەمەیە هێناوەو پەنجەی پێیەکانیشت بەئاوسانێکی خوێنینەوە تێك دەئاڵێن و بنی پێیەکانیشت دەسووتێنەوە، پۆرگی گەورەی پڕ لە ئاو یان پۆرگی تەقیو کە خوێنیان لێ دەچۆڕێتەوەو هەم دەسووتێنەوەو هەم وەکو پارچە شووشە تێی ڕادەچێت، ئایا ئەوەت تاقیکردۆتەوە کە بەنەرمیی لەسەر یەك قاچ بەرەو پێش بچیت و لەکاتێکدا قاچەکەی ترت بهێنیت و بووتەکەتی پێ لەسەر بەردی نووك تیژ، بە توندی هاوسەنگ بکەیت ؟ ئەمەش دەبێ لەیەك کاتدا بە وردییەوە بکرێت، بەجۆرێك کەوا بزانی ئەو سەدو سیی و پێنج زەلامە یەك کەسن. ئەم کارەش دەبێ هەواڵێکی وا بڵاوبکاتەوە کە خەڵکیی بۆی ڕابوەستن و گوێ بگرن و بڵێن: " ڕێپێوانێك دەکرێت ! ئەمە شتێکی نایابە ! چ جۆرە سوپایەکمان هەیە ! " نمایشە ڕێپێوان بەردەوام کار لە نەوجەوانان دەکات.

ئەمە کاری لە ئێمە نەکرد. ئەمە بێزارترین و ماندووکەرترین ڕاهێنانە لە سوپادا، ماسوولکەی زیاترو لەمفە لووی پتری لە لەشماندا هەڵزراند، پتر لە هەموو شێوەکانی تری ڕاهێنان بۆ ئەمەش دەتوانیت پرس لە دکتۆران بکەیت !

بەڵام ئێمە سووکایەتیمان بە ئۆبەرست لیفتنانت دەکرد. بەهەمووی یەك سەعات نمایشە ڕێپێوانمان نەکرد. ئەو ئێستا ڕۆیشت و بەپۆشتەیی لەلایەن کاپتن لووپییەوە سڵاوی بۆ کرا، بەڵام بەر لەوەی بڕوات گوتی " بەڵێ، بەیەزدان ئەوە دەبێ چارەسەر بکرێ. کاپتن لووپی ! "

– گەورەم ! .

– ئەم دەستەیە دەبەیتە مەیدانی ڕاهێنان و لەوێدا فێریان دەکەی چۆن دەبنە سەرباز نەك دەستەیەك ناکەسبەچەی گەڕ. نابێ پێش کاتژمێر نۆی سبەینێ

بگەڕێیەوە. ئەگەر تا ئەو کاتەش ئەم دەستەیەی تۆ نەیان توانی ڕێپێوانێکی وا ئەنجام بدەن کە هەموو بەردی ڕێگاکە وردو خاش بکەن، دەبێ دووبارە بیانگەڕێنیتەوە، تێگەیشتی ؟ ،

- تێگەیشتم، هێر ئۆبەرست لیفتنانت.

بەدرێژایی شەو مەشقی هێرش بردنمان لەو دەشت و دەرەدا کرد لەگەڵ نمایشە ڕێپێواندا.

کاتژمێر نۆی بەیانی ڕۆژی دوایی هەموومان بە تەپەپێی ئاوازدارەوە بەبەردەم ئۆبەرست لیفتنانتدا ڕەت بووین. ئەو بەدڵی نەبوو. وای لێ کردین کە حەفت جار بەبەردەمیدا ڕەت بین، من لەوەدا دڵنیام کە ئەگەر هەریەك لە ئێمە لە دەرفەتێکدا تەنیا بۆ ماوەی دەیەکی چرکەیەك دوا بکەوتبایە ئەوە دووبارە دەگەڕاینەوە دواوە.

کاتژمێر دە بوو کە ئیزن دراین و کۆرانە بەرەو ژوورەکانمان بە لادا دەچووین و لەوێ لێی نووستین.

کارێکی نا مرۆڤانە بوو، بەڵام لەو کاتەدا ئێمە مرۆڤی ڕاستەقینە نەبووین. ناکەسبەچەی گەڕ بووین، دەستەیەك ناکەسبەچەی برسی کراو بووین.

ئەم وێنەیەی ڕاهێنانەکانمان پێویستییان بە دەست پێداهێنانێکی کۆتایی هەیە، جا بۆ ئەوەی هەموو شتێك بخرێتە بەر ڕووناکی ڕاستەقینە و گۆشە نیگای خۆیەوە، دەبێ برسیەتیشی بخرێتە پاڵ.

قەت تێر بە زگی خۆمان نەمان دەخوارد، لە ڕاستیشدا هەموومان لەم بارەیەوە کەمێك بێ هێز ببووین وەکو لە گەلێك باری تریشەوە. لە کۆتایی جەنگدا لە ساڵی ١٩٤٥ تەواوی گەلی ئەڵمانیا لەسەر بەشە ئازووقەی

دووچاربوونی برسییەتیدا دەژیان، بەڵام لە (١٩٤٠ – ١٩٤١)دا ئەوەی پێمان دەدرا کەمتر بوو لە بەشە ئازووقەی خراپترین گرووپی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٤٥ – کە مەدەنییە ئاساییەکان بوون – هیچمان پێ نەدەکرا، چونکە کۆپۆنمان نەبوو، خواردنی نیوەڕۆمان هەموو ڕۆژێك وەك یەك بوو، لترە شۆرباییێکی ڕوونی چەوەندەر کە مشتێك کەڵەمی تێدەکرا، بەڵام کەڵەمیش ڕۆژێك نا ڕۆژێك پێمان دەدرا. نەدەبوایە زیاتر لەمە نازمان هەڵبگیرێ یان بەهانەگیر بین.

گۆشت خۆراکێکی خوشگوزەرانی بوو کە نەمان دەزانی چییە. ئێواران بەشە ئازووقە وشکەکەی خۆمان بۆ ڕۆژی پاشی هەڵدەگرت: پارچەیەك نانە جۆ، کە بە ئاسانی دەکرایە پێنج کەرت، سێیانیان بۆ ئەو ئێوارەیەو دووانیشیان بۆ بەیانییەکەی. هەروەها، بیست گرام کەرەی ترشاوو لەتە پەنیرێکمان هەبوو، پەنیرێك کە زۆرترین ڕێژەی ئاوی تێدابوو. دەبێ ڕێژەی ئاو لە پەنیردا لە سەدا پێنج بێت. ڕۆژانی شەممە زیادە بەشێکی پەنجا گرامیی مرەبای شێلمیان پێدەداین، بۆ بەیانیان قاوەیەکی بێ ڕەنگی ترشاومان دەدرایێ، ڕەنگی وەك چا وا بوو، تام و بۆنیشی بێز کەرەوەبوو، بەڵام لەگەڵ هەندێشدا هەڵمان دەلوشی.

هەندێ جار، کە لە دەرەوە مەشقمان دەکرد، لەوانە بوو پەتاتەیەك یان سەلکە شێلمێکمان بدۆزیبایەوە، ئەو کاتە دەستێکمان پێدا دەهێنا، قوڕەکەمان ڕا دەماڵی، ئنجا دەمان ئاخنییە ناو دەممان و دەمانخوارد، ئەوەندە زوو قووتمان دەدا، لەوانە بوو چاودێرێك پێی وابوایە کە کارەکە هەمووی فڕو فێڵێکی ئەفسوناوییە. زۆری نەخایاند بۆمان دەرکەوت کە توێکڵی دار

حەیزەران لەگەڵ جۆرە گیاییێکی تایبەت کە لە قەراغ خەندەکەکاندا شین دەبوو، زۆر بەتام و خۆشمەزەبوو لەوانەیە تا ڕادەیەکیش تێرکەر بوو. بەڵام هەر چۆنێك بێت ئەم شتانە بەری هەناویان دەگرت و ئازاری برسیەتییان سست دەکردەوە، فەرموو ئەمە شێوەی ئامادەکردنیەتی : هەندێ لە توێکلی دار حەیزەران یان ئەو گیایە بێنە، بیخە بەینی دوو کلاو ئاسن و بیهاڕە، ئنجا برێك قاوەی جۆری (ئیرسان)ی تێکەڵ بکەو وەکو گرار فڕی بکە. خۆ ئەگەر یەك لە ئێمە بە موعجیزە، کۆبوونێکی نانی بۆ بهاتبایە ئەوا میوانداریێك لە ژووری ئەو بەختەوەرەدا دەکرا. یەك گردە نان ! .

ئێمە بەردەوام لـە پـشکنینی ڕۆژانـی دوو شـەممە دەترسـاین. لـە ناوبـانگکردنی بەیانیاندا دەبوایە کڵاوە ئاسنە، چاکەتی سەربازیی نمایش کردن، پـانتۆڵی سـپی کـە خەتی ئوتووی وەکـو دەمـی چـەقۆ تیـژ بێـت، پرێـسکە، قایـشی پـشت، هەگبـەی تەقەمەنی، ئامێری چـاڵ لێـدان، سـونگی، تورەکـەی توێـشوو، تفـەنگمان پـێ بێـت، دەبوایە پاڵتۆکەت بەشێوازی دروست لوول بدەیت و بەسەر سنگتەوە هەڵی بگریت.

هەموو زەلامێک دەبوایە دەستە سرێکی سەوزی خاوێنی لە گیرفانـدا بێـت و، ئەم دەستە سرەش دەبوایە بەشێوازی نزامیی قەد کرابێت.

# پاك كردنەوە و پەرداخكردن

نە خاوێنی و نە ڕێككاری ئازاری كەس نادەن، لە هەموو لەشكرێكیش شتێكی سروشتییە كە خاوێنی و ڕێككاری دەبێ هەبن و ئەمانەش بۆ وەدیهێنانی پلانێكی گونجاوو درێژ كاردەكەن.

هەر سەربازێكی هۆشداریی ویژدان زیندوو زۆرترین كاتی خۆی بەخاوێنی و ڕێككاری بەسەر دەبا، بەلام سەربازی سەر بە بەتالیۆنێكی سزادراو تەواوی كاتی خۆی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەكا، واتە هەموو ئەو كاتەی كە بە شتی ترەوە بە فیڕۆی نادا. هەموو ڕۆژانێكی یەكشەممە هیچمان نەدەكرد لە شۆردن و پاك كردنەوە و قەدكردن بەشێوەیەكی ڕێك بەولاوە، شتەكانمان بە ڕێكی هەڵدەواسی و هەندێكیانمان بەجوانی لە شوێنی خۆیاندا هەڵدەگرت. كەل وپەلە چەرمینەكانمان دەبوایە بریقەیان بێت، وەك ئەوەی وارنیش كرا بن، نەدەبوو لەكەیەك لەسەر جلك و كەل و پەلەكانمان بێ، نە لە دەرەوە و نە لە ناوەوە. من دەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم كە هەر سەربازێكی سەر بە بەتالیۆنێكی سزادراوی ئەڵمانی كە ڕۆژانی دووشەممە دەچوو بۆ نمایشگە لە تەوقی سەرییەوە تا بنی پێی پاك و خاوێن بوو.
بەلام من وا دەزانم كە هەڵەیێك لە ڕێككاری و خاوێنی عەسكەریدا هەیە، چونكە پاش ڕەنجكێشانی ڕۆژێكی تەواو بۆ وەدەست هێنانی ئەم دوو شتە، ئنجا بە هیچ شێوەیێك هەست بەو ڕەزامەندییە ناكەین، كە مێشكت دەحەسێنێتەوە، ئەو شتەی كە بە ئاسایی لە دوای ئەم پاكسازییە دەبوایە هەستی پێ بكەین.

نمایشەکە ڤیستڤاڵی پاکسازیی نەبوو، بەڵکو دێوەزمەی ترس ولەرزبوو. هیچ سەربازێکی پاك وخاوێن وپۆشتە، هەستی بەخاوێنی خۆی نەدەکرد بەڵکو وەك ئاژەڵێکی تۆقێنراو خۆی دەهاتە بەرچاو.

پێم وایە من ئەو جۆرە دەربڕینانەی وەکو (ئاژەڵی تۆقێنراو) و (ترسی هار) و لە (ترسانا تۆقیو) زۆر بەکار دەهێنم، من چاك دەزانم کە دووبارە کردنەوە باش نییە، دەشزانم کە لە دەربڕینی ئەدەبییانەی باشدا دەبێ بەدوای جۆراو جۆرییەتیدا بگەڕێین، بەڵام من لەوە دەترسم کە بەهەڵەدا بچم، چونکە چۆن بۆ شتی وێکچوو تۆ دەتوانیت جۆراو جۆرییەتی لە دەربڕیندا بدۆزییەوە ؟ ڕەنگبێ هەندێ کەس بشێن، بەڵام من زۆر لەخۆم دڵنیا نیم. من زۆر ماندووم، زۆر پەشۆکاوم، زۆریش نا ئومێدم، ناوناوەش زۆر توڕەم تا بتوانم کات و وزەی خۆم تەرخان بکەم بۆ گەڕان بەدوای واتای جیاوازو جیاکاریی جوان. ئەوەی من دەیگێڕمەوە شتێکی ئەوەندە تراژیدی و خەم ئەنگێزە، کە تا ئێستاش، دوای ئەو هەموو ساڵانە، ناو بەناو بەهۆیانەوە دەچەوسێمەوەو وام لێدێت کە ئەو مافە بەخۆم بدەم کە داوای یارمەتیت لێ بکەم بۆ ئەوەی لەهەر شوێنێکدا کە وشەم پێ نەدۆزرێتەوە بەهانام بێیت. مادام تۆش لە مەبەستەکانی من تێدەگەیت، زۆر لام گرنگ نییە، زوو یا درەنگ سەرت بشەکێنی و بڵێی : " کابرا چاکی گوتووە "

ئێمەی، بێ سەرپێچییەکان، وەکو ئاژەڵی ڕاوکراومان لێهاتبوو، چاك دەمانزانی هەرچییەکی ببێت هەر لە ئەستۆی ئێمەدا دەئاڵێت و ئێمەی تێوە دەگلێین. لە هەموو شتێکیش ناکۆکتر ئەوە بوو کە هەر کاتێك هاوپتفیلدویبل هیچ کەم و کورتییەکی لەئێمەدا نەدیبا، تووڕە دەبوو، ئنجا یەك لە ئێمەی

سەربازی پاك و خاوێن، لە هەموو كاتێك خراپتر تووش دەبوو، قوڕ بەسەر ئەو كەسەی كە لەخۆڕا تووش دەبوو، دەقات دەیخوات. ئاسانیش نییە لە شوێنی وادا دروست كار بكەیت.

– ڕیزی پێشەوە یەك هەنگاو بۆ پێش – ڕیزی دواوە یەك هەنگاو بۆ پاش – بڕۆن !

یەك – دوو

بۆ ماوەی دوو دەقەی درێژخایەن پاش كرانەوەی هەردوو ڕیزەكە، هاوپت فیلدویبل وەستاو، چاوی تێبڕین . هەر كەسێك كەمێ بەم لاو بەولادا بچێت ، بە بیانووی سەرپێچیكردن ، تووش دەبێت . بەڵام ئێمە فێر ببووین چۆن خۆمان دەكەینە پارچە تەختەو بەم جۆرە دەمانتوانی بەبێ جووڵە بۆ ماوەی نیو كاتژمێر بەردەوام بوەستین. ئەمە جۆرە متبوون و بوورانەوەیەك بوو كە دەست دەكەوت و كە شایانی سامانێكی لە ڕادەبەدەر بوو بۆ ئەو سەربازەی كە نرخی توانای وەستان و بوون بەپارچەیەك تەختە دەزانێت.

هاوپتفیلدویبل نەڕاندی : " ئایا هەمووتان ئامادەن بۆ پشكنین ؟ " سرییەكە تێكڕا وەڵامیان داوە : "بەڵێ، هێر هاوپتفیلدویبل " .

– كەس هیچی لەبیر نەچووە خاوێنی بكاتەوە ؟

هەموو تێكڕا : " نەخێر، هێر هاوپتفیلدویبل " .

بەتووڕەییەوە تێمان ڕاما. هەر ئێستا دەمان قۆزێتەوە.

بەتیزەوە گوتی " ئێوە وا ناڵێن، ئەمە یەكەم جارە لە مێژووی ئەم بەتالیۆنە، ئەگەر ڕاست بێت. بەڵام با بزانین " .

لەسەرخۆ لە یەكەم پارچە تەختە نزیك كەوتەوە، جارێك و دوو جار بە دەوریدا سووڕایەوە، خول خواردن بەدەوری ئەیاری خۆت بێ ئەوەی ورتەیەكت لێوە بێت جۆرە جەنگێكی دەروونیی زۆر كاریگەرە. پشتە ملت گەرم

دادیّ و دەستەکانت تەڕ دەبن، هزرو بیریش لەناو سەرتدا دەست بە خول خواردنێکی هستیرییانە دەکەن بەهەموو لایەکدا، بەڵام خولی سروشتی خۆیان. تۆ وەکو ستوونێك بێ جووڵە بوەستی و خۆت بکەیتە پەیکەرێکی ترساوی بێ هەناسە، ئنجا لەناکاو هەست بکەی کە چ بەخوازەو چ لە ڕاستیدا خەریکە بۆگەن دەبی.

لە پشتەوەی سێیەم کەسی ڕیزی یەکەم دەستی پێکردو گوتی : " بەڵێ، بەڵێ – بابزانین " .

کاتێکیش کە ژمارە چوارو پێنجی دەپشکنی، خامۆشییەکی تەواو باڵی کێشابوو. ئنجا بۆڕژنێك هات: " سرییەی ژمارە سێ – ئاگاداریی ! " کە پاشان لێشاوی قسەی پیس بەدوایەوە هات. ئێمە لەبابەت هاوپتفیلدویبلەوە گوتبوومان کە ناتوانێ قسەی پیس بڵێت ئەگەر پێشتر پەندێکی پیس نەهێنێتەوە، کە لەوانەیە نوکتەیەکی بێ مانا بێت، بەڵام لەم بارەیەوە لێڕا هاتبووین. لە ڕاستیشدا ئەمە وەسفکردنێکی باشی ئەو دڕندەیەیە، ئەو پتی بورژوازییە تەواو بۆگەنەی کە شتێکی کەمی لەشیرینی دەسەڵات و توانا پێ درابوو.

– بۆ خاتری خوا ئێوە چ سرییەیەکی ــــــــ . ئێوە دوێنێ هیچ شتێکتان نەکردووە ئەوە نەبێت کە خۆتان لەناو ــــــــ وەرداوە. خۆ لە ڕیخ وەردان، شتێکە بۆ گاڕانە بەرازێکی وەك ئێوە دەشێت. من تائێستا پێنج کەسم پشکنیوە هەر هەموویان لەو گەوادانە دەکەن کە لە قەحپەی سۆزانیی لەدایك بووین و بە ماشە لەدایکیان هێنراونەتە دەر. ئەمانە قسەی ئاسایی مرۆڤ نەبوون بەڵکو لێشاوێك بێژەی بۆگەن بوون. یەکێك لە دەربڕینە لە دڵ شیرنەکانی ئەم دڕندەیە دەڕبرینی (نەخۆشی فەڕەنگیی) بوو. ئەو بۆ خۆیشی تووشی خراپترین شێوەی (نەخۆشی پرووسیی) ببوو، کە پاڵنەرێکی سستە بۆ

زەبوون کردن. ئەمە نەخۆشییەو، تایبەتیش نییە بە بەتالیۆنە سزادراوەکان، بەڵکو بەناو هەموو سوپای ئەڵماندا تەشەنەی کردووە، کە لە وێدا وەك بەڵای قونێر وایە و لەبن هەرقونێرێکیش زۆر دڵنیای لەوەی کە دەرەجەدارێك بەدۆزییەوە، کەسێك کە شتێکە بەڵام ئەوەندەش نییە.

ئێستاش، ئێمە مەشقی سزادانی ڕێکخراومان پێ دەدرێ کە بۆ ماوەی سێ کاتژمێر درێژە دەکێشێ، کۆتاییەکەشی کەندەکێکی درێژە کە چەند پێییێك قووڵەو تا نیوەی پڕیەتی لە قوڕی بۆگەن کە کەفێکی زەردباوی گریزاویی بەسەرەوەیە.

هەر جارێکیش کە فەرمانی (لەسەر زگ) ڕەوانی بنی کەندەکەکەی دەکردین دەبوایە ئەو کەفە لەدەم وچاومان هەڵسووین. پاشان لەکاتی نیوەڕۆژەدا، بەرەو سەربازگەکەماندا دەگەڕاینەوەو لەوێ هەر بەم حاڵەوە، خۆراکمان قووت دەدا، ئنجا دەبوایە خەریك ببینەوە، چونکە دووبارە پێویست بوو لە ماوەی نیو کاتژمێردا پاك و خاوێن و پۆشتە بین کە دادەبەزینە مەیدان بۆ مەشقی پاش نیوەڕۆیان.

خۆمان و جلەکانمان بەو هۆیەوە دەشوشت و بە تەواوی بەرگەکانمانەوە لە بن دووشی ئاودا دەوەستاین. دەبوایە لە پێشا تفەنگ و کەل و پەلەکانی ترمان بشۆین، ئنجا بە دیقەت، بە پەڕۆییێك وشك بکرێنەوە و لە پاشا چەور بکرێن، دەبوایە لوولەی تفەنگەکان بە ئاگادارییەوە ڕابکێشرێن. هەر سەربازێکی ئاسایی حەفتەی جارێك بەم جۆرە کەل و پەلەکانی پاك

دەکاتەوە، لەوانەشە هەندێ جار ئەگەر مەشقی تایبەت هەبوایە دووجار وا بکا، بەڵام ئێمە دەبوایە ڕۆژێ دوو جار ئەم کارە ئەنجام بدەین.

دوای ئـەمـە، کە دادەبەزینە مەیدان، جلەکانمان ئـاویان لـێ دەتکا، بەڵام ئەمە گرنگ نییە مـادام پاك وخاوێنن.

تـەنیا یـەك شـت هـەبوو ئەوەنـدەی ئـەم پـشکنینە ترسناکەی ڕۆژانـی دوو شەممە لێی دەترساین، ئەویش ژوور پشکنین بـوو هـەمو ئێوارەیـەك لـە کاتـژمێر بیـست و دوو، ئـەوەی دەرەجـەداری ئێـشکگر بـیری لـێ دەکـردەوە لەمـەڕ کەسانێکی ماندوو و مردوو کە بیکەن دوای ڕۆژێکی پڕ لە ماندوو بوون، شتێك بوو لە توانا بەدەر.

بەر لەوەی دەرەجەداری ئێشکگر بێتە ژوور دەبوایـە هـەر سـەربازێك لـەناو نوێنەکانیـدا ڕاکـشا بـێ و لـە بـارێکی ئاسـایی و سرووشـتیدا – لەسـەر پـشت، باسکەکانی لە تەنیشتەوە درێژ کرا بن و لەسەر بەتانییەکەوە، پێیەکانیـشی بۆ پشکنین ڕووت کرابن. ئێشکگری ژوورەکە بەرپرس بوو لەوەی کە یەك زەڕە تۆز بەسـەر هـیچ شـتێکەوە نـەبێ لـەناو ژوورەکـەدا، لـەوەی کـە هـەموو پێیـەکان وەك پێـی منـداڵی تـازە لـەدایك بـوو خـاوێن بـن، لـەوەی کـە هـەموو شـتێك لـەناو دۆڵابەکانـدا لـە شوێنی خۆیانـدا بن و بـە گـوێرەی ڕێنماییـەکان قـەد کـرابن، لـە سەرەتای پشکنینەکەدا، ئێشکگری ژوورەکە دەبوایە ئەم ڕاپۆرتە بدات :

– هێرئەنترۆفیزەر مـن ئێشکگری ژوور سـەربـازی وەزیـفـە (بـرانـد)، ڕادەگەیەنم کـە هـەموو شـتێك لـە ژووری (٢٦) ڕێکـە، ژمـارەی تـەواومان دوازدە کەسـە، یازدەمـان لـەناو نوێنـەکانیانن. ژوورەکـە بەتـەواویی پـاك کـراوەو هـەواگۆڕکێ کراوەو هیچ شتێك نییە ڕای بگەیەنین.

دەرەجەداری ئێشککگر وەك عادەتیی، ئەم قسانەی بەهەند هەڵنەگرت، بەڵام تەماشایێکی دەوروبەری کرد. قوڕ بەسەر ئەو ئێشکگرە بەدبەختەی ژوورەکە، ئەگەر دەرەجەداری ئێشککگر تۆزە پیسییەکی بدۆزیبایەوە، یان دۆڵابێکی بدیبا کە بەتەواویی دانەخراوە، یان جووتێك پێی چاو پێ بکەوتایە کە تەنیا ڕەشاییەکیان پێوە بوایە.

گیرنەری دەرەجەدار، کەوا تێبگەم نەخۆشێکی ڕاستەقینەی عەقڵیی بوو – هەمیشە وەك سەگ دەوەڕی، وات دەزانی ئەو کابرایە هەمیشە لەسەر لێواری تەقین و پارچە پارچە بوونە، لە ڕاستیشدا بۆ ئەو شتێکی نائاسایی نەبوو ئەگەر فرمێسکی کینەی هەڵڕشتبا. کاتێکیش کە لەسەر کار دەبوو، ئێمە شێلگیرانە هەموو شتێکمان دەسڕییەوەو دەماڵی، دەمان شوشت و پوختەمان دەکرد. لەبیرمە ئێوارەیەکی وەیشووم کە شنتزوس ئێشکگری ژوور بوو. شنتزوس قۆچی قوربانی ژوورەکە بوو، بەدریژایی ڕۆژ هەوەس خۆش بوو، بەڵام ئەوەندە نا ئومێدانە بێ توانا ببوو کە ببووە ئەو قوربانییە هەڵبژاردەیە بۆ هەر یەك لە سەرکردەکانی لە ستابفیلدوییل بەرەو خوار. شنتزوس، وەك هەر یازدە کەسەکەی ترمان تووڕە بوو، کە لە وێدا لێی پاڵ کەوتبوون و چاوەڕێی گیرنەر بوون و، پرسیاریان لەوە دەکرد کە دەبێ چیمان لە بیر کردبێ، لە یەکێك لە ژوورەکانی تر گوێمان لە دەنگی گیرنەر بوو، وامان زانی هەموو تەختە خەوو دۆڵابەکانمان بەر پێلاقە دران و وردو خاش بوون. لەناو ئەم هەرایەشدا هاوارو هاڕەو دەنگە گڕەکەیمان گوێ لێ بوو : هەی بەرازە گەڕەکان، بەدرەفتاران، هەموومان ڕاچڵەکین، ڕەنگ زەرد وەك هەمیشە. گیرنەر لە بارێکی ڕاستەقینەدا بوو، هەر کاتێکیش کە پێ دەنێتە ژووری (٢٦) ئەو کاتە بەتەواویی گەرم دەبێ،

لەناو نوێنەکانمان دەرپەڕین و دووبارە تەواویی ژوورەکەمان بەسەر کردەوە، بەڵام هیچمان نەدۆزییەوە.
دەرگاکە بە پێلەقەیەکی توند کرایەوە سەر پشت.
ئاخ، ئەگەر هەر شنتزوس نەبوایە، یەکێکی تر ئێشکگری ژوورەکە بوایە، یەکێك کە تۆزێك زیاتر گیانی دەست پێشخەریی هەبوایە.
شنتزوس لەوێدا مالق و ڕەنگ زەرد وەستا.
تەنیا ئەوەندەی پێکرا کە بەچاوی ترساوەوە تەماشای گیرنەر بکا. گیرنەریش بە یەك باز گەیشتە وی و لە دووریی تەنیا دوو گرێوە بەسەریدا هاڕاند : بۆ خاتری خوا ! کابرا، دەکرێ من بەدرێژایی شەو چاوەڕێ بم تا ڕاپۆرتەکەت دەدەی ؟ شنتزوس بەدەنگی لەرزۆکەوە ڕاپۆرتی دا :
هەموو شتێك ڕێکە ؟ گیرنەر هاڕاندی، دیارە تۆ ڕاپۆرتی چەوت دەدەی ! .

بۆ ماوەیەك هەموو لایەك وەکو گۆڕستان بێ دەنگ بوون. ئێمەش لەناو نوێنەکانمان ڕاکشابوین، چاوەکانمان بە شوێن گیرنەردا کەوتبوون کە لەسەرخۆ بەو ناوەدا دەڕۆیشت و بەدوای تۆزدا دەگەڕا، مێزەکەی هەڵگرت و بنی پێچکەکانی سڕییەوە، هیچ پیسیی نەبوو. ژێر بووتەکانمانی پشکنی، ئەوانیش خاوێن بوون. پەنجەرە و سیمپۆشی چرایەکان، هیچی نەدۆزییەوە. وا لە پێیەکانمان ڕاما دەتگوت ئەگەر شتێك نەدۆزێتەوەو بیکا بەبیانوو، دەکەوێ و دەمرێ.

لە کۆتاییدا وەستاو ژوورەکەی بەنیگاییێکی خەمناك و، مەبەستدارانەوە پشکنی، بەڕاستی وادیار بوو ئەو کابرایە نایەوێ ئەمجارە وازمان لێ بهێنێ. بەتەواویی لە کەسێك دەچوو کە پارەکەی نەهاتبێتە ژوانەوە، جا بۆیە ئەویش

دەبێ هەر بۆ خۆی و بەئارەزووە ترسناکە جێبەجێ نەهاتووەکانییەوە بچێتەوە ماڵ و تەنانەت ناو نوێنەکانیشی.

هەر تازە دەرگاکەی لە دوای خۆیدا داخستبوو، کە لەسەر پاشنە پێیدا وەرچەرخا.

– گوتت هەموو شتێك ڕێکە ؟ دەبا بزانم.

بەیەك بازی گەورە گەیشتە تەنیشت قاوەدانەکەمان، ئەو قاوەدانە ئەڵەمنیۆمە گەورەیەی کە سێ گالۆنی دەگرت. هەموو ئێوارەیەك دەبوایە بریقەی بێت و پڕ لە ئاوی خاوێن بکرێ، ئەم جارەش هەروا بوو، کە گیرنەر بەداخەوە ساتێك بەر لە ئێستا وای بۆ دەرکەوتبوو. بەڵام، ئێستا بۆمان دەرکەوت – دڵیشمان خەریك بوو لە لێدان بکەوێت – کە گیرنەر بیر لە شتێکی تازە دەکاتەوە.

وەستاو لە تەنیشتەوە سەیری ڕووی ئاوەکەی کرد. قەت ناکرێ ئاوێك کە چەند دەقیقەیێك مابێتەوە هەندێ گەردە تۆزی نەنیشتبێتە سەر.

هاواری گیرنەر زۆر گەورە بوو.

– بەمە دەڵێن ئاوی پاك ؟ ، بۆ خاتری خوا کێیە ئەو بەرازە پیسەی کە ئەم قاوەدانەی پڕ لە ......... کردووە ؟ تۆ وەرە هەی ڕیخاویی ، قوڕاویی !

.

گیرنەر لەسەر کورسییەکە دانیشت و شنتزوس قاوەدانەکەی دایە دەست.

– ئاگادار بە ! سەرت بۆ دواوە ! دەمت بکەوە !

وردە وردە دەفرەکە لەناو دەمی شنتزوس بەتاڵ کرا. وەخت بوو بخنکێ، کە دەفرەکە بەتاڵ بوو، دەرەجەدارە شێتەکە بەدیواری دادا، ئنجا لە ژوورەکە دەرپەڕی، لە ژووری شۆردنەوە گوێمان لەتەقە تەق بوو، شێرەی ئاو کرایەوە، پاش کەمێك پەقرەجە ئاوێکی خێواندە ناو ژوورەکەوە، کە شەش پەقرەج ئاوی بۆ ناردین، ئنجا فەرمانی وشك کردنەوەی ئاوەکەمان پێدرا، لەبەرئەوەی تەنیا

دوو پارچە پەڕۆی زەوی سڕینەوەمان هەبوو، بۆیە ماوەیەکمان پێ چوو تا ئاوی ژوورەکەمان وشك کردەوە.

ئەم سوحبەتەی، بەر لەوەی تامی ببڕێت، چوار جاران دووبارە کرایەوە. ئنجا ئەنترۆفیزەر گێرنەر بەدڵی ڕەحەتەوە بۆ خەوتن چوو، ئێمەش سەلامەت دەرچووین.

فیورۆر جێرمەنتیکۆس ئەوەیە کە ڕۆمانییە کۆنەکان بەو جۆرە شەڕە تایبەتییە خوێناوییە دڕندانەیان دەگوت کە لەکاتی جەنگ کردندا لەگەڵ خێڵەکانی باکووری ئەلبدا تووشی دەبوون، ڕەنگ بێ بۆ ڕۆمانەکان و بۆ دوژمنە سەر سەختەکانی تری ئەڵمانەکان سووکە دڵخۆشکردنێك بێت ئەگەر بزانن کە ئەڵمانەکان بەهەمان شێتییەوە مامەڵە لەگەڵ یەکتری دەکەن وەکو ئەوەی کە لەگەڵ هاوسێیەکانییانی دەکەن.
فیورۆر جێرمەنتیکۆس – دەردە ئەڵمانی یان پرووسی.
گیرنەر دەرەجەدارێکی هەژار بوو، بەدبەختێکی دەردەدار بوو کە ناچار بوو بەو ژوان و تۆزە ڕازی بێت.
خوا سەلامەتی کا.

فەرماندەکە لێرە بەولاوە سرییەکەی ئێمەی دایە دەست قەشەوە، قەشە
نەڕاندی " سرییەی ژمارە سێ – بۆ نوێژکردن -چۆک دادەن" !

# یەك جۆر سەرباز

مەشقەکەمان بە ڕاهێنانێك کۆتایی هات کە حەفت ڕۆژ و حەفت شەوی خایاند. ئەو مەشقە لەمەیدانێکی گەورەی ڕاهێناندا ئەنجام درا بەناوی مەیدانی سەنلاگەر، کە لەوێدا گوندی تەواو، پرد، هێڵی ئاسنیان دروست کردبوو، هەموو شتێکیان تەواوبوو، تەنیا دانیشتوانی تێدا نەبوو، هەروەها لەوێدا دەبوایە ڕێگا بەناو دارو دەوەنی چڕ، زۆنکاو و ڕووباراندا شەق بکەین، بەسەر پردی هەڵواسراودا بڕۆین کە بەسەر هەڵدێرە قووڵەکاندا درێژکرابوون.

ڕەنگبێ ئەمە بەشتێکی ڕۆمانسیی بێتە بەر چاو، وەك گەمەی مارو پەیژە لەسەر پێوەرێکی گەورە بەڵام لەکاتی گەمەکەدا زەلامێکمان لە دەست دا، کە لە یەکێك لە پردە نەچەسپاوەکاندا کەوت و ملی شکا.

یەکێك لەو گەمانە بریتی بوو لە هەڵکەندنی چاڵە زەوی هەر ئەوەندە قووڵ کە بتوانین کاتێ خۆمانی تێدا گرمۆڵە بدەین بکەوینە ژێر ڕووی زەوییەوە، لە پاشان تانکی قورس دەهاتن و بەسەر ئەو چاڵانەدا دەڕۆیشتن، کە خۆمان لە ناویاندا وێك دەهێناو لە ترسانیشدا دەلەرزین.

موچڕك لە دوای موچڕکمان پێدا دەهات، دەبوایە خۆمان لەسەر زەویدا پان بکەینەوەو ڕێگە بەو تانکانە بدەین کە بەسەرماندا بڕۆن. هەستمان دەکرد بنی پۆڵایینی تانکەکە پشتمانی دەسڕییەوە لەکاتێکدا کە زنجیرە قورسەکانی تەق و هۆڕیان بوو بەلای چەپ و ڕاستدا دەهاتن و دەچوون.
مەشقی ئەوەمان پێدەکرا کە لەسەر زەبری تانك ڕابێین.

بەهەر حال، ئێمە دەترسێنراین و ئەمەش شتێکی ئاساییە. سەربازی ئەڵمانیی لەسەر ترس پەروەردە کراوە، وا ڕاهاتووە کە وەك مەکینە بەرگەی تیرۆرو تۆقاندنی تەواو بگرێت، نەك ئازایانە شەڕ بکات، چونکە بە ئایدۆلۆژیاییێکی ئەوەندە گەورە جۆش دەدرا کە بەئاشکرا بۆی ڕوون کردووەتەوە کە لەکاتی پێویستدا خۆی بەخت بکا. لەوانەیە تۆ ناو لەم ڕەوشت کەمییە بنێی نیشانە جیاکەرەوەکانی عەقلییەتی پرووسی و نەخۆشی درێژخایەنی گەلی ئەڵمانیا.

ڕۆژێك دوای کۆتایی هاتنی ئەم ڕاهێنانە، سوێندی ئەمەکداریمان خوارد. بۆ ئەم مەبەستەش بەدەوری سێ لای چوارگۆشەیەکدا وەستاین، کە لە ناوەڕاستیدا تانکێك هەبوو، لەم لاو لەولایدا ڕەشاشێکی ئۆتۆماتیك دانرا بوو. هەر کە ئەم تابلۆیە جوانە ڕێکخرا، قوماندارەکە خۆی و یاریدەدەرو ئەو قەشەیە پەیدابوون، کە بۆ بەگەورە پیشاندانی ئەم بۆنەیە، تەواویی موتومۆرووی بەخۆوە کردبوو.
ئنجا قوماندار دەستی پێکردو گوتی :
- ئەی پیاوانی سوپای پرووسی ! ڕاهێنانەکەتان تەواو بوو، پاش ماوەیەکی کەم هەمووتان دەنێرینە بەتالیۆنە جیاجیاکانی مەیدانەوە وەك بەتالیۆنەکانی نارنجۆك هاوێژو دژە تانك و غەددارە هەلگرو پشکنین و تەنانەت یەکەکانی بەرگری ناوەخۆش. بەڵام گرنگ نییە بۆ کوێ دەنێردرێیت، لە هەر کوێ بێت دەبێ ئەرکی خۆت جێبەجێ بکەیت، ئێوە هەمووتان نەفرەتلێکراون، بەڵام ئەگەر ئازاو بوێر بن، لەوانەیە ڕۆژێ ئەوە بێت کە فۆهەری مەزن دووبارە بتانگێڕێتەوە باوەشی پڕ لە سۆزی خۆی. ئێستاش دەبێ ئەو سوێندە کۆنەی

ئەمەکداریی بخۆن. ئەو سوێندەی کە جارێك پێشێلتان کرد، بەڵام من دڵنیام کە لێرە بەدواوە، بۆ تەواویی ماوەی ژیانتان، دەتانخاتە سەر دلۆڤانیی بۆ نیشتمانەکەتان. لە هەر یەکێکتان واچاوەڕوان دەکەم کە قەت جارێکی دی سوێندەکەی خۆتانتان لەبیر نەچێت و ئەرکی خۆشتان بەرامبەر بەنیشتمانی دێرین و میللەتی مەزنمان و، بەرامبەر بەفۆهەرو بەخودا لە بیر نەکەن.

کەمێك دوای ئەوە هەموومان چۆکمان دادا، کڵاوە پۆڵایینەکانمان لابردو دەستەکانمان لە دەوری لوولەی تفەنگەکانمان وەرپێچا، دیمەنێکی زۆر کاریگەر بوو، دەشیا ببێتە کەرەستەی فیلمێکی خەبەریی. پاش ئەمە قەشە نوێژێکی کورتی بۆ خوای گەورەو توانادارو، تەبیعی، خوای ئەڵمانەکان خوێند، ئەو خوایەی کە سەرکەوتن وەدەست نازییەکان دێنێت. ئەو گەلحۆیە لە ڕاستیدا وشەی نازیی بەکارنەهێنا، بەڵام چی تری مەبەست بوو کاتێك گوتی :

– خوای توانادار، ئەی گەورەمان، گەورەیی و چاکەو بەخشندەیی خۆتمان نیشان دە بەوەی کە هێزەکانی ئەڵمان بەسەر دوژمنە بەربەرییەکانماندا سەرخەی.

دوژمنە بەربەرییەکانیشیان، تێفکرە، خەڵکانێك بوون کە پیاوی وەکو ئیبسن و نانسین، هانس ئەندرسن، ڕەمبراندت و سپینۆزا، ڤۆلتێرو ڕینیە کلێر، چایکۆڤسکی و گۆرکی، شکسپیرو دکنز، ئەبراهام لنکۆلن و تیۆدۆر درێسەر، چوپین و کۆپەرنیکۆس، سوکرات و هۆمیرۆس و ژنانی وەك فلۆرانس نایتنگل و ئیمیلاین و پانخورست، ماریۆن ئەندرسون و مسز ڕۆزفلت، ماری و ئایرن کۆری، کاترینی دووەم، جۆن ئارك، ئیساك دنسن، ئانا پاڤلۆڤایان پێ گەیاندبوو.

دوای ئـەمــــە، ئــــەو چەكانــــەی لــێ پــیرۆز كــردین كــە بەهۆیانــەوە بەربەرییـەكان لـەناو دەبـەین، بـەڵام وا تێبگـەم ئـەوە هـیچ سـوودێكی نەگەیانـد. وەستان و كێشانی نیشانەی كرۆس بەتانكێكی گەورەوە بۆ قەشەیەكی بێ نـرخ بەدەگمـەن دەبێتـە جـادوویێكی زۆر كاریگـەر، هـەتا ئەگـەر باوەڕیـشت بـەجادوو هەبێت، كە من باوەڕم پێی نییە، بەلایەنی زۆرەوە دەبێ هزر لـەوە، بكەیتـەوە كە نافەریدەیــەكی وا وردە چــەك ئەفـسوناویی دەكـا بــەڵام، بەهــەر حـاڵ، ئـەوان جەنگەكـەیان دۆڕانـد. ئنجـا سـوێندەكەمان خـوارد. قەشـەكە هـەر جارەو چـەند وشەیەكی كەمی لێ دەگوت و سرییەكەمان بەتێكرا دەیانگێڕایەوە، لەكاتێكدا یەكێكمان لەبەردەم سرییەكەدا وەستابوو، سێ پەنجەی لەسەر نووكی شیرە لە كالان دەرهاتووەكەی قوماندار دانا بوو، كە ئەمەشیان بەشێك بوو لە تابلۆكە.

لە مەیدانە كشوماتەكەدا ویزە ویزێكی دەنگان دەنگی دایەوە :

- سوێند بـە خـوا - بـاوكی پیرۆزمـان دەخـۆم - سـوێندی پـیرۆز - كـە مـن لـە هەموو شتێكدا ملكەچانەو دڵسۆزانە بجەنگم و ژیـانی خۆشـم لـەپێناو فۆهـەرو، میللـەت و نیشتماندا بـەخت بكـەم - ئەگـەر داوام لـێ كـرا. هـەر كەسـێكی ئـەم سـوێندە بخـوات - دەبـێ ئـەوە بزانــێ - كـە سـوێندەكە لەسـەر دڵـی دا مـۆر دەكرێـت، جـا ئەگـەر سـوێندە پیرۆزەكـەی بـشكێنێ - ئـەوا ڕەحمـەتی خـوای توانادار لـەگیانی بێـت - چونكە دوای ئەمـە - مـافی ژیـانی نامێنێـت و - هـەتا هەتایێ لەناو ئاگری جەهەنەمدا تووشی ئەشكەنجە دێت - ئامین.

لە پاشاندا سروودی

{دەچلاند، دەچلاند ئۆبەر ئالس، DEUTSCHLANDDEUTSCHLAN ÜBER ALLES - ئەڵمانیا لە سەرووی هەموانە !}مان چڕاند.

بەم جۆرە تەعمید کراین، بەڵام هیچ پاداشتێکی ئەم تەعمیدکردنەشمان پێ نەدرا ڕۆژی پاشتر، کراینە کۆمەڵەی بچووك کە لە پێنج تا پازدە پیاو پێکدەهاتن و کەل و پەلی تازەی مەیدانمان پێدرا. من و چەند کەسانێکی تر، بەدلەی ڕەش و بێرییەی سەربازانی تانکمان پێدرا، بەیانی ڕۆژی پاشتریش لەژێر فەرماندەی ڤیلدوێبلێك چووینە سەربازگەی بیلفیلدت، کە لەوێدا بەگەڵ دەستە سەربازێکیان خستین کە خەریکی ئەوە بوون بچنە بەرەکانی جەنگ و لە شەمەندەفەرە سەربازییەکاندا بار کراین.

- ئـایـا دەبێت ئەم سرییەیە بە زیاتر تاوانباری نەفرەتباری وەک ئێـوە باربکرێـت ؟ شتێکی بێزراوە ! وا مەکەن کەمترین نارێکیتان لێبگرم، ئەگینا دەتان نێرمەوە بـۆ ئـەو بەندیخانەیەی کە دەمێک پێـش ئێستا شیاوی ئەوە بوون کـە تیایـدا بـمــرن، خـــوا بـمـگـرێت ئەگەر وا نەکەم. بەندیخانە شوێنی نموونەی وەکو ئێوەیە.

بەم جۆرە سڵاوەوە لەلایەن قوماندانی سرییەی ژمارە (٥) ئۆبس هاوپتمان میر، چەوسێنەری تازە سەربازان، پێشوازیم لێکرا، بەڵام پیاو لەم جۆرە شتانە ڕاهاتبوو، من خرامە تاقمی ژمارە (٢) لەژێر فەرماندەی لێفتنانت ڤـۆن بـارینگ، ئنجـا ڕووداوەکـان دەستیان پێکرد کە من لە گەڵیاندا ڕانەهاتبووم.

# یەکەم چاو پێک کەوتنمان

((بارنگ)) دەستی بۆ درێژ کردم و بەتوندی بەشێوەیەکی دۆستانە دەستی خستەناو دەستم. ئەمە شتێکە ئەفسەری سوپای پرووسی ناتوانێ بەئاسانی بیکا، بەڵام ئەو کردی، کە کردیشی گوتی :

بەخێر بێی، کوڕە لاوەکە، بەخێر بێی بۆ سرییەی ژمارە (٥)، تۆ هاتووی بۆ لیـوایێکی دۆزەخـاویی ترسـناک، بـەڵام ئێمـە پێکـەوە دەمێـنین و بارتەقاشـی دەکەین، هەر ڕاست بەرەو کامیۆنی ژمارە (٢٤) بڕۆ و خۆت بە ئەنتیرۆفیزەر بیر بناسێنە، ئەو سەرکردەی دەستەی ژمارەی یەکە. ئنجا زەردەخەنەیەکی گەورەو کراوەی بریقەداری هاتێ، زەردەخەنەی کوڕە لاوێکی جوان و دۆستانە.

من بە تەواویی شلەژابووم

هەر زوو کامیۆنی ژمارە (٢٤)م دۆزییەوە و ئەنتیرۆفیزەر(بیر)م بۆ دەست نیشان کرا، لە تەنیشت بەرمیلێکی گەورە دانیشتبوو لەگەڵ سێ کەسی دی خەریکی یاریکردن بوو – کابراییێکی کورتە باڵای لەش پتەوی سی و پێنج ساڵان بوو. سێ هەنگاو دوور لەو ڕاوەستام، پاشنەکانم بەتوندی لێکدان و بەدەنگی بەرز و ئاشکرا خۆمم پێشکەشکرد :

هێر ئەنتیرۆرفیزەر ...... من داوای ......

بـەڵام هیـچی دی قـسەم بـۆ نـەکرا، دووان لـەو چـوار کەسـە لەسـەر ئـەو پەقرەجانـە بازیانـدا کـە لەسـەری دانیـشتبوون و ئەوەنـدە بـە قیتیـی وەسـتان دەتگـۆت لوولـەی تفـەنگن، خۆیـان و پەنجـەکانیان کـە لـە خـوار خـەتی پانتۆڵـەکانیان بـوو، ئـەنترۆرفیزەرو کـابرای چـوارەم بـە پـشتدا کـەوتن و

کاغەزەکانی یاری بەئاسماندا وەربوون وەك پەلك و گەڵای زەردی پایز کە بەر ڕەشـەبای پـایز کـەوتبن، سـاتێك هـەر چـواریان تـێم ڕامـان، پاشـان ئۆبەرگیفریتەرێکی درێژی سەرسۆر گوتی :

- بۆ خاتری خوا، کابرا ! تۆ گیانی ئێمەت دەرکێشا، وەختە بڵێم هتلەر خۆی لە تۆدا حەشارداوە. چ شتێك وای لە قالۆچەیەکی ڕیخی بەرەڵلای وەکو تۆ کرد کە بێی و خۆشەویستی ئاشتیانەی هاوولاتیان لە کاتی ئەنجامدانی کاری بێ زیانیان بشێوێنی ؟ پێمان بڵێ تۆ کێی و تۆ چیت ؟

- هێر ئۆبەرگرفتەر، ڕاپۆرتم ئەوەیە کە من لە لایەن لیفتنانت (ڤۆن بارنگ)ەوە هاتووم و من دەبێ خۆم بە دەستەی ژمارە (١) و بە ئەنترۆفیزەر بیر بناسێنم.

(بیر) و پیاوی چوارەم کە تا ئەو کاتە هەر لەسەر پشت کەوتبوون، قیت بوونەوەو، هەر چواریان بەترسەوە تێم ڕامان، وایان تەماشا کرد دەتگوت ئەگەر من تەنیا هەنگاوێك بۆیان بچم، بە چریکەو هاوارەوە بەهەموو لایەکدا ڕادەکەن، لەپاشان هەموویان پێکەوە دایانە قاقای پێکەنین.

- گوێت لێیەتی ! هێر ئۆبەرگفریتەر. ها، ها، ها، هێرئەنترۆفیزەر بیر، ها، ها، ها، بەم جۆرە ئۆبەر گفریتەرە سەر سوورەکە سەرسوڕمانی خۆی پیشان دا، کە لە پاشان ڕووی لە ئەنترۆفیزەرەکە کردو، بۆی چەمایەوە گوتی " ڕێزدار، جەنابی باویقار، شکۆداری دڵڕاکێش، هێر ئەنترۆفیزەر بیر من تکای ڕاپۆرتدار دەکەم ......

بەسەرسامییەوە یەك یەك سەیرم کردن، بەتەواویی بێ توانا لەوەی تێبگەم کە ئەم گاڵتە نایابە چی بوو. ئنجا کە لە گەشکەی پێکەنین هاتنەوە هۆش خۆیان، ئەنتروفیزەر لێی پرسیم کە لە کوێوە هاتووم، کە پێم ڕاگەیاندن هەموویان بەسۆزەوە تەماشایان کردم.

کابرای سەرسۆر پێی گوتم، بڕۆ خۆت و لاقە تەختە ئاساکانت، بۆ بەتالیۆنی سزادراو لە هانۆڤەر. ئێستا تێگەیشتین کە بۆچی بەو جۆرە ڕەفتارت دەکرد. کە پاشنەکانت بەو جۆرە لێکدان ئێمە وامان زانی گاڵتەمان پێ دەکەیت، بەڵام من بەموعجیزەیەکی خوایی دادەنێم کە تا ئێستا توانای لێکدانیانت هەیە، باشە فەرموون.

بەم وشانە لە دەستەی ژمارە یەکدا پێشوازی کرام، ئنجا پاش یەك سەعات لە ڕێگادا بەرەو (فریبورگ) گلۆر دەبووینەوەو کە لەوێش دەبوایە یەکەیەکی شەڕکەر پێك بهێنین و بۆ مەشقی تایبەت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری ئەورووپای ئاشووب ڕەوانە بکرێین، بەدەم ڕێگاوەو لەکاتی گفتوگۆدا، هەر چوار هەڤاڵەکەم خۆیان ناساند. لەگەڵ ئەو چوار هەڤاڵەمدا ماوەی جەنگم بەسەربرد.

(وولی بیر) بە دە ساڵان لە وانی ترمان گەورەتر بوو، هەر لەبەر هەندێش بوو پێمان دەگوت "پیرەئان". ئەو خێزاندار بوو، دوو زارۆکیشی هەبوون. لە پیشەدا دارتاش بوو، ماڵیشی لە بەرلین بوو. بەهۆی سیاسەتەوە هەژدە مانگی لە کامپی سزادان بەسەر بردبوو، دوای ئەوە (لێبوردنی) وەدەست هێنابوو، ئنجا ڕەوانەی بەتالیۆنێکی سزادراویان کرد. پیرەئان لەسەرخۆ گرژییەوەو گوتی :

- بێگومان هەر لێرەشدا دەمێنمەوە تا ئەو ڕۆژەی کە زۆر بەخێرایی بەرگوللەیەك دەکەوم.

پیرەئان، هەڤاڵێکی خۆسەر بوو، هەمیشە هێمن و لەسەرخۆ بوو، تەنیا جارێکیش لەماوەی ئەو چوار ساڵە پڕ مەترسییەی پێکەوەمان بەسەر برد

نەمدیت تووڕە بێت یان بترسێت. یەکێك بوو لەو گیانلەبەرە سەیرانەی کە هێمنییان لێ دەتکا، ئەو هێمنییەی کە هەموومان زۆر پێویستیمان پێی هەبوو لە تەنگانەیەکی وادا. ئەو، بەتەواویی وەك باوك بوو بۆمان هەر چەندە جیاوازیی نێوان تەمەنمان تەنیا دە ساڵ بوو. زۆریش بوون ئەو جارانەی کە تیایاندا دڵم بەو بەختەم خۆش دەبوو کە منی خستە لای پیرەئان لە یەك تانکدا.

ئۆبەرگیفریتەر جوزێف پۆرتا، یەکێك بوو لەو نوکتە بازە نەگۆڕانە کە هەرگیز نەدەهاتە بەزین. تۆسقاڵێك گوێی لە جەنگ نەبوو، من لەو باوەڕەدام کە شەیتانیش کەمێك لەوە دەترسا کە شتێکی لەگەڵدا بکا لە حاڵەتێکدا ئەگەر خۆیان هەڵخەڵەتێنن، هەرچۆنێك بێت، هەموو ئەفسەرەکانی سەر بەسرییەکە لێی دەترسان، ئەوانەی کە دەی توانی تەنیا هەر بەتەماشا کردنێکی بێ تاوانانە، بە یەك جاریی پێیان لە هاتوچۆ ببڕێت.

قەتیش ئەوەی لەبیر نەدەکرد کە بەوانەی تووشی دەبوون بڵێت من کاتی خۆی (سوور) بووم. ئەو، ماوەی ساڵێکی لە (نۆرانبورك) و (مۆبیت) بەتاوانی چالاکیی کۆمۆنیستی بەسەر بردبوو، لە پای ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٣٢ یارمەتی هەندێ برادەری دابوو بۆ هەڵواسینی دوو ئاڵای سۆشیال – دیموکرات بەسەر تاوەری کەنیسەی میشێلەوە. ئەو کاتە پۆلیس گرتی و چواردە ڕۆژ زیندانی کرد، پاشان کێشەکە لەبیر چووەوە، تا ساڵی ١٩٣٨ کە لەناکاو لەلایەن (گۆستاپۆ)وە گیرا. هەوڵێکی زۆریان لەگەڵدا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە حەشارگە نهێنییەکەی (وێل وێبەر)ی قەڵەوی هەمیشە خەفییەی، سەرکردەی کۆمۆنیستەکان پێ دەزانێت. پاش برسی کردن و ترساندنی بۆ ماوەی دوو

مانگ، هێنایانە بەردەم دادگاو بەتاوانی چالاکیی کۆمۆنیستی تاوانبار کرا. وێنەیەکی فۆتۆگرافی گەورە لەبەردەم دادوەرەکەدا دانرابوو، کە تیایدا دەبینرا پۆرتا بە ئالاّیێکی گەورەوە بەرەو کەنیسەی میشێل دەچوو. بە دوازدە ساڵ کاری قورس حوکم درا بەهۆی چالاکیی کۆمۆنیستی و بێ حورمەت کردنی ماڵی خوا. هەر بەماوەیەکی کورت پێش بەرپابوونی جەنگ وەکو زۆربەی زۆری بەندەکانی تر، ئەویش بەهەمان ڕێگای ئاسایی وەبەر لێبووردن کەوت، بەوەی کە خرایە بەتاڵیۆنێکی سزادراوەوە. پارە و سەرباز یەك حیسابیان بۆ دەکرێت، گرنگ نییە لە کوێوە هاتبن.

پۆرتا بەرلینیی بوو، هەموو بەدخوییەکی بەرلینییانی هەبوو، زمان پیسیی و نەگریسییەکی سەیر، ئەوەندە بەس بوو بۆی کە زمانی بکاتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی لە دەوروپشتی لەبەر پێکەنین گەشکە ببن. بەتایبەتی کاتێك جۆرە خاوییێکی بەدەنگی دەداو لە ڕەفتاردا خۆی وا ڕۆح گەورەو لەخۆبایی پیشاندەدا کەوەك ئەوەی هەر لە خزمەتکاری کۆنتێکی ئەڵمانیی بوەشێتەوە.

لەهەمان کاتیشدا پۆرتا مۆسیقا ژەنێکی بەتواناو خاوەن بەهرەیەکی ڕاستەقینەو سروشتیی بوو، ئەو بەشێوەیەکی ئەفسووناویی وەك یەك هەردوو ئامێری هارپ و ئۆرگەنی لێدەدا. بۆ هەر کوێیەکیش بچووبایە کلارنێتەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد کە ئاوازی ئەفسووناویی پێلێدەدا، چاوە تیژە چلێسەکانی دەبڕییە پێشەخۆی، پرچە سوورەکەشی وەك دەسکە گیا قیت ڕادەوەستا، نۆتە دەرچووەکان لەو ئامێرە وەك بڵێی سەمایان دەکرد جا ئاوازەکەی میللی بوایە یان کلاسیکی، مۆسیقا بۆ پۆرتا زمانێکی نامۆ بوو، بەڵام بەختەوەرانە ئەگەر بە

ڕێککەوت پارچە مۆسیقایەک بێتە پێش ئەوە ئەوەندە بەس بوو بۆ پیرەئان کە ئاوازەکەی بۆ بژەنێت و ئیدی پۆرتا خۆی لێی دەدا، وەکو ئەوەی خۆی ئاوازەکەی دانابێت.

دیسان پۆرتا بەهرەمەندییەکی ڕاستەقینەی حیکایەتخوانیی هەبوو، دەیتوانی چیرۆکێك ڕێك بخات کە چەند ڕۆژێك درێژە بکێشێت و لە سەرەتاوە تا کۆتایی درۆ و هەڵبەست بێت.
وەکو هەموو بەرلینییە ڕێز لە خۆگرەکان، پۆرتا هەردەم دەیتوانی بڵێت لەکوێدا شتێك هەیە بۆ خواردن، چۆن دەتوانیت وەدەستی بخەیت و، ئەگەر هەر جۆرە هەڵبژاردنێکیش هەبێت کامیان باشترە. ڕەنگبێ لەکاتی گەڕاندا بە زەوییە وشك و بەیارەکاندا پۆرتا لەگەڵ خۆیاندا ببەن.
پۆرتا سوورە لەسەر ئەوەی کە سەرکەوتنێکی گەورەی لەگەڵ ژناندا وەدەست هێناوە، بەڵام ڕواڵەتەکەی وات لێ دەکات گومان لە قسەکانی بکەیت. پۆرتا بێ تام درێژ و بەهەمان شێوەش لاواز بوو، ملی هەر لە ملی حاجی لەقلەق دەچوو کە لە یاخەی بەدلەکەیەوە دەرپەڕی بوو، لەو ملەیدا سێوئادەمێکی گەورە هەبوو کە هەر کاتێك قسەی بکردایە پیاوی گێژ دەکرد، چونکە نەدەکرا چاودێری هەڵبەز و دابەزی نەکەیت. سەریشی شتێکی سێگۆشەیی بوو کە مشتێك پنتە خاڵی بەشێوەییێکی هەڕەمەکی بەسەردا کرابوو. چاوەکانی گچکە و برسی بوون، برژانگەکانی سپی و بەمەکرەوە بەرامبەر ئەو کەسەدا دەجوولانەوە کە قسەی لەگەڵدا دەکرد، پرچی سوورێکی ئاگریی بوو، وەك پووشەڵان بەهەموو لایەکدا قیت ڕادەوەستا، کەپووی مایەی شانازیی پێوە کردنی بوو، هەر خواش دەیزانی بۆ، کە دەمی دەکردەوە، یەك ددانت بەتەنیا لە ناوەراستی شەویلگەی سەرەوەیدا دەدیت، ئەو، سوور بوو

لەسەر ئەوەی دووانی تریشی هەن، بەڵام ئەوان ددانە خریٚ بوون و چاکیش شاراوە بوون. لە هەر کویٚشدا بەرپرسی ئازووقە جووتە پێڵاویٚکی بۆ بدۆزیباوە، بەلوغزێکی گەورە دادەنرا، ئەو، دەبوایە پێڵاوی نمرە (١٤) وەدەست بخات.

سێیەمی ئەو گرووپە چوار کەسییەمان، پلۆتۆ، کێویٚکی گۆشت و ماسوولکە بوو، لە ڕوتبەدا ستابس گیفریتەر بوو، ناوی ڕاستەقینەشی گۆستاف ئیکن بوو، سیٚ جاران خرابووە کامپی گرتووخانەوە، نەك بەهۆی سیاسەتەوە بەڵکو تاوانی نا ئابڕووبەر ئەوی ناردبووە ئەویٚ. ئەو، لە کەشتیخانەی هەمبورگدا کاری دەکرد، بەڵام خۆی و هەندێك لە هەڤاڵانی کارێکی باشیان بۆ خۆیان کردبوو بە دزینی شتێك لێرەو شتێك لەو مەخزەن و کەشتییانە، لە پاشان گیران و ئەم گرتنەیان شەش مانگی خایاند. دوو ڕۆژ دوای بەربوونی پۆلیس هاتنەوە گرژی. ئەمجارەیان براکەی پاسپۆرتێکی تەزویرکردبوو، کە لەبەر ئەم تاوانە سەریان پەڕاند، خودی پلۆتۆش ماوەی نۆ مانگان خرایە زیندان بیٚ ئەوەی لیٚی بپیٚچنەوە، ئنجا بەبیٚ هیچ ڕوونکردنەوەیەك پاش لێدانێکی زۆر فڕێدرایە دەرەوە. پاش سیٚ مانگان لە پای شتێکی تردا بانگ کراو دزیکردنێکی بۆ ڕێکخرا کە ئەویش دزینی تەواوی باری لۆرییەکی ئارد بوو، پلۆتۆ هیچ شتێکی لەم بارەیەوە نەدەزانی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تووشی تێهەڵدان بوو، پاشانیش لەگەڵ کابراییٚك ڕووبەڕوویان کرد، سوێندی خوارد کە پلۆتۆ ئەو شەریکەیەتی کە پێکەوە لورییە ئاردەکەیان تالاّن کرد. دادگایی کردنەکە تەنیا (١٢) دەقەی خایاند و شەش ساڵیان بەسەر پلۆتۆدا سەپاند. ماوەی دوو ساڵ لە (فۆهلسبوتل) مایەوە، پاشان ناردیانە بەتاڵیۆنێکی ئاسایی سزادراو، لە ١٩٣٩ دا لەگەڵ ئەوانی تری سەر بە لیوای

(٢٧)ی سزادراو بەناو پۆڵەندەدا ڕەت بوون. هەر کاتێکیش بتەوێ پلۆتۆ بەتەواویی شێت و هار بکەی ئەوەندە بەسە ڕستەیەکی بە گوێچکەدا بدەی کە هەردوو پەیڤی لۆریی و ئاردی تێدا بێت.

چوارەمینیان ئۆبەرگیفریتەر ئەنتۆن ستێیر، هەر بەناوی تیج بانگ دەکرا، چوار پێ و یازدە گرێ و نیو درێژ بوو. لە شاری {کۆلن}ەوە هاتبوو کە لەوێ لە پیشەسازی بۆن و بەرامەدا کاری دەکرد. لە جۆرە شەڕێکی بەهەراوهۆریا لە (بیرستوب) خۆی و دوو هەڤاڵی تری تووشی سێ ساڵ حوکمدان بوون، لە کامپێکی گرتووخانە، دووەکەی تر پێکەوە بوون تا ئەو ڕۆژەی یەکێکیان لە پۆڵەندا کوژراو ئەوی دیکەشیان فیلاری کرد، بەڵام گیراو ئنجا لە سێدارە درا.

بۆ ماوەی شەش ڕۆژ ئەو شەمەندەفەرەی یەکە سەربازییەکانی هەڵگرتبوو بە تەقە تەقەوە بەناو ئەڵمانیادا ڕەت بوو بەرلەوەی بگەینە شوێنی مەبەستمان، کە شارە خنجیلانەکەی (فریبورگ)ی خوارووی ئەڵمانیا بوو، قەت بیرمان بۆ ئەوە نەدەچوو کە بهێڵن ماوەیەکی زۆر لەوێدا بمێنینەوە. پاشەی سوپا شوێنی ئاسایی نییە بۆ بەتالیۆنە سزادراوەکان کە بەپێی ئەرکەکەیان دەبێ هەردەم لەپێشەوە بن و بۆ خۆیان لاپەڕە خوێناوییەکانی مێژوو بنووسن. قسە و باسی وا ناخۆش هەبوون کە دەمان نێرنە ئیتالیا و، لەوێشەوە بۆ لیبیا، بەڵام کەسیش ڕاستییەکەی نەدەزانی. ڕۆژی یەکەم دەستی پێکرد و بە ڕێنماییەکانی لێخوڕین و هەندێك ئەرکی تری دڵخۆشکەر بەسەرچوو. کاتی بێکاری خۆمانمان بە خۆشییەکی تەواوەوە لە خواردنگەی {زوم گولدنەن هرش ZUM GULDENEN HIRSCH} بەسەر برد، کە خاوەنە ئێسك

سووکەکەی بە ئاسایی پێی دەگوترا (شولتن) و بەهەمان شێوەی ئاساییش سەلماندی کە برادەرێکی دێرینی پۆرتا بوو.

زۆری خایاند تا وام لێهات لەو جۆرە چالاکییانەدا بەشداربم و شتی ئەوەندە تۆقێنەر لە ڕابوردوومدا هەبوون کە وایان دەکرد من لە سەرەتاوە هەست بە کۆسپ و تەگەرە بکەم بۆ لە گۆڕنانی ئەو ڕابوردووە، یان هیچ نەبێ بۆ ڕاگیرکردنی بۆ یەك شەو ئەگەر بۆنەکە ئەمە بخوازێت. جا ئەگەر ناو بەناو لەمەدا سەرکەوم ئەوا چاکەکە بۆ پۆرتاو پیرەئان و پلۆتۆو تیج دەگەڕێتەوە. ئەوانیش وەکو من بەتەواوی کەوتبوونە ناوییەوە و دڵرەقی کردبوون، کاتێکیش کە مەشروب و کچ و گۆرانی لەگۆڕێ دەبوو، ئەوا گوێیان بەهیچ شتێکی تر نەدەدا.

له سهرهتادا، کـابرای شـهمهندهفهڕهوان ڕازی نـهبوو، ناشـنال سۆشیالیـستی چاک نابیّ پێویستییهکانی سهربازه تاوانبارهکان جێبهجیّ بکا، بهڵام کـه پۆرتـا شـتێکی دهربارهی شووشه ( ڕم )هکه چرپاند، کابرای شهمهندهفهڕهوان بۆ ماوهیهک له بیری چوو که ئافهریدهیهکی سوپهره. ڕووی کـرده سـهکۆی چێـشتـخـانـهی ( شـۆڵـتز )ه قـهڵـهوی خـاوهن چێشتـخانهکهمان و دوای کهمێک به پرێسکهیهکی گهوره گهڕایهوه و وهکو پێویست دایه دهستی. پۆرتا سهرنجێکی پڕ له خۆش مهشرهبیی دایـیّ. پۆرتـا بهههموو دهربڕینه دڵپاکانهکهی خۆیهوه گوتی :

- تۆ ئهندامێکی حزبی، وانییه ؟

بێگومانم، کابرای شهمهندهفهڕهوان وهڵامی دایهوهو، ئاماژهی بۆ ئـهو نیـشانه جیاکهرهوهی حزب کرد که گیرفانی بهدلهکهی بهری دهرازاندهوه، بۆ دهپرسی ؟

پۆرتا چاوهشینه چنۆکهکانی وێـک هێنانـهوه. بـرادهری خۆشهویـست، مـن وهڵامـت دهدهمهوه.

ئهگهر تۆ ئهندامی حزب بیت ئهوا مل بۆ ڕاسـپاردهکهی فۆهـهر کهچـدهکهی که بهرژهوهندی گشتی پێش بهرژهوهندی تاکه کهس دێت. جا لهبهرئهوه تۆ شـتێکی وهکو ئهمـه لـهم بابهتـهوه دهڵێـی " ئـهی جـهنگاوهره ئازاکـانی بـهتالیۆنی بیـست و حهفتهمینی ئاگرو شمشێر! بۆ ئهوهی پارمهتی بدرێن، زۆر باشتر بۆ فۆهەرو بۆ گـهل بجهنگن، من، وهکو نمهک خواردنێک، ئهو شووشه ( ڕهم )هتـان پـێ دهبهخـشم کـه لهێر جۆزیـف پۆرتـا! سـهرهڕای چـاکه سـنووردارهکهی حـهز دهکـا بـهمنی ناشـایانی ببهخشێت ". نهت دهویست دهقاو دهق ئهمه بڵێی ؟ ئهریّ ئهم وشـانه نـهبوون کـه لهسهر زمانت بـوون ؟ بـرای خۆشهویـست، ئێمـه لـه کانگـای دڵمانـهوه سوپاسـت دهکهین، ئێستاش دهتوانی بڕۆیت.

پۆرتــا بــە شــانازییەکی زۆرەوە دەســتی بــەرزکردەوەو، کڵاوەکــەی بڵنــدکردو بەهاوارکردنەوە گوتی، گروس گۆت ! - سڵاو.

هەر یەکسەر کە شەمەندەفەرەوانە نازییــە بــەد بەختەکــە رۆیــشت و بەتورەییــەوە ددانەکانی لێکدان، پرێسکەکەمان کردەوە.

پێنج شووشە ئارەق و، رۆستی گۆشت بەراز و، دوو مریشکی ســوورەوەکراو و هی تری تێدا بوو.

# سەیرو سەمەرەییەکانی خەڵکی بەڵکان

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: " بەڵام دەبێ ئەوەمان لەبیر بێت کە ئێمە بۆ جەنگ دەچین، جەنگیش ڕەنگبێ تا ڕادەیەك شتێکی ترسناك بێت، لە جەنگدا گوێت لە هەموو جۆرە شتێك دەبێت و خەڵك بەهۆیانەوە دەمرن. گریمان گوللەیەك لەناکاو هات و هەر پێنجمانی بەیەکەوە کوشت، یا گریمان، – دەنگی گۆڕا و بوو بە پستەیەکی ترسناك – گریمان کەسمانی نەپێکا بەڵام ئەو سێ شووشەیەی ئەنگوتن کە شتێکیان تێدا مابوو، ئەمەیان دەبێتە – ئەمەیان دەبێتە ترسی ڕاستەقینەی جەنگ ! "

لەگەڵ ئەوەشدا، شووشەکانمان بۆ کاتێکی دوایی وەلانان.

پاش دەمێکی کەم شەمەندەفەرەکە ڕۆیشت.

– بەڕێ کەوتین ! بەڕێ کەوتین ! .

هەر خوا بۆ خۆی دەیزانێت بۆ ئەم هاوارەمان کرد، چونکە بەتەواویی هەم بۆ ئێمە کە لەناو واگۆندا بووین و هەم بۆ ئەوانەی لە دەرەوەش وەستا بوون ڕوون بوو. دەرگا خزۆکەکان بە هەردوو لادا کرانەوە و ئێمەش لەناویاندا وەستاین و خۆمان بە یەکدییەوە هەڵواسی بوو بە دەنگی گەورەش هاوارمان دەکرد. ئەوەی دەمان دیت لەلامان گرنگ نەبوو، پشیلە بووایە یان مانگا، خۆ ئەگەر ئافرەت بوایە ئەوا هەر هیچ، هاوارێکی خۆشیمان تێدەگرت. لەناکاو پیرەئان گوتی : " پێم بڵێن، ئێمە بۆچی وا دڵخۆشین، ئایا ئەو دڵخۆشییەمان لەبەر ئەوەیە چونکە بەرەو قەسابخانە دەچین ؟ "

پۆرتا لەناوەراستی هەراوهۆریای پڕ لە خۆشییەوە وەستاو بیری لەم قسەیە کردەوە.

- بۆ دڵخۆشین ؟ زۆر چاکە، ڕۆڵە پیسە خۆشەویستەکانم، دەبینن، ئێمە دڵخۆشین، بەڵام بۆ چی ؟ "

بە دەوروبەری خۆیدا ڕووانیە هەموومان.

تیچ گوتی : " وا تێبگەم من دەزانم ".

- باشە، بۆچی ؟

- چونکە، - بەجدی سەیرێکی کردین -، چونکە، قەت شتێکتان لە بارەی جەنگێکەوە بیستووە کە خەڵکی تیایدا دڵخۆش نەبن، ئنجا وەکو بەبیر هاتنەوەیەك هەڵی دایێ و گوتی، کەواتە ئێمە بۆ ئەرکێکی گەورە هاتووین. ئێمە لە ڕێگا داین بۆ یارمەتیدانی فۆهەر، بۆ یارمەتیدانی فۆهەری گەورەمان بۆ دۆڕاندنێکی ڕاستەقینەی گەورە، بۆ ئەوەی ئەم جەنگە پیسە بوەستێت و ئەم دارمانە جوانە لەکۆتاییدا ببێتە ڕاستییەکی شکۆدار.

پۆرتا، تیچی بڵند کرد و هەردوو کوڵمی ماچ کردن و دووبارە دایناوە. پاشان ملە قازییە درێژەکەی بەسەر ئێمەدا درێژ کرد و بۆڕژنێکی پڕ لە شادی بە گوێچکەمان دادا کە بێگومان فۆهەریش گوێی لێبووە بەڵام تێینەگەیشتووە.

بۆم نییە ڕاییێك دەربڕم، بەڵام لە گۆشە نیگای سەربازێکی تایبەتەوە ئەو بەهرە بەناوبانگەی کە ئەڵمانەکان لە ڕێکخستندا هەیان بوو ئەوەندە زۆر دەرنەکەوت، هیچ نەبێت لەو شوێنەی کە گواستنەوەی یەکە سەربازییەکانی تیادا دەکرا. بیرۆکەی پلانی زیرەکانەی ستادی سوپا و ڕێکخستنی ستایشکراو کە سەرباز وەریدەگرێت، لەبەرئەوەیە کە بۆ هەر شوێنێك دەگوازرێتەوە بە پەناو پێچ ببرێتە ئەوێ، بۆ گواستنەوەی هەر سەربازێك لە

خانّی (A) بۆ خانّی (B) به درێژایی هێڵێکی ڕاست و بەبێ وەستان بە درێژایی ڕۆژ له شوێنەکانی بەهەڵکەوت لەناو کێڵگەکانی دەغڵ یان له قەراخی شوێنە زۆنکاوەکان – بە کورتی، بۆ گواستنەوەی ئەو سەربازە بەبێ بەفیڕۆ دانی کات یان سووتەمەنی یەکسانە بە گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە له بەڕێوەبردنی جەنگدا و ئەو ئەنجامە گرنگەی دەبێت، کە پلانە جوانەکانیان تووشی شێوان نابن، ڕاستییەکی تەواو زانراویشە کە سەربازی تایبەت لە هەموو وڵاتاندا دەتوانن باوەڕی پێبهێنن ئەویش ئەوەیە کە کەس ناتوانێت بەدەر لە بێ سەروبەریی جەنگ هەڵبگیرسێنێ. بڕی بێ سەروبەریی و ئەو بە فیڕۆ دانە زۆرەی ژیانی مرۆڤ، خۆراک، کەل وپەل و کاری فیکری کە لە پشت دەربڕینەکانی وەک (پێشڤەچوون بەپێی پلان)ەوە دێن پێویستییان پێیەتی، خۆ ((ڕاستکردنەوەی بەرەی جەنگ)) و ((کشانەوەی جیرانە)) تراژیدیاییێکی ئەوەندە لە ڕادەبەدەرە کە لەهزرەوە دوورە، تەنانەت ئەگەر هەوڵیشی بۆ بدرێت.

وام دێتە بەر چاو کە جۆرە ڕوونکردنەوەیەك بۆ بێ سەروبەریی جەنگ هەیە، لەوانەیە ئەمە بێت، یان ئەمەیان بێت لەناو چەند شتێکی تر، کە ئەگەر بێ سەروبەریی نەبێ ئەوا ڕەنگبێ بکرێ بەرپرسییەتی جێگیر بکرێت. ئەگەر تۆ وا دابنێی کە بێ سەروبەریی ـ بەرپرسییەتیی، ئەو کاتە ڕوونکردنەوەکەم دەبێتە شتێکی ماقووڵ.

ئەگەر جەنگ ـ بێ سەرو بەریی

بێ سەروبەریی ـ بێ بەرپرسییەتیی

ئەوا جەنگ ـ بێ بەرپرسییەتیی

ئەمەش هاوکێشەیەکە کە لەمەودوا زۆرجار بۆی دەگەڕێینەوە.

بەبێ هیچ بەرپرسییەتییەك، بە سنووری سربیادا گلۆربووینەوە کە لەوێدا پێمان گوترا تا پێڕاگەیاندنێکی تر ئێمە بەتالیۆنی هەژدەمی تیپی دوازدەمی پانزەرین و ئێمە نێردراوین بۆ ناوچەیەکی مەشقکردن لە شوێنێکی وڵاتی بەڵکاندا کە لەوێدا مەشق لەسەر بەکارهێنانی جۆرە تانکێکی تازە دەکەین و، دوای ئەوە ڕەوانەی بەرەی جەنگ دەکرێین. کە ئەمەیان پێگوتین، پۆرتا زەردەخەنەیەکی هاتێ و کەیفی هات، گوتی :

– بەم شێوەیەی ئێستا کە دەگمەنە بۆ سیی و چوارساڵی ئایندە وا بمێنێتەوە، سامانێکی باش دەستەبەر دەکەین، هەموومان ئەو کاتە لەڕادەبەدەر دلشاد دەبین و بەجۆرێکی نائاسایی دەوڵەمەند دەبین، پێشتان دەڵێم بۆچی. لە بەڵکاندا کاروبار وادەگەشێتەوە کە لە هیچ وڵاتێکی تری ئەورووپا وانییە، چونکە هەموو جۆرە بازرگانییەك ڕاستەوخۆ دەکرێت، شت لە یەکتری دەدزن کەچی هیچ هەراوهۆریاییێك ڕوونادات، جا سەرباز چییە ئەگەر کاسبکارێکی باش نەبێت ؟ ئێستا سەربازی باش بن و هەرچییەکی فێری بووینە بەبیرتان بێتەوەو بەکاریشی بهێنن، من زۆر ڕەزامەند، دەوڵەمەندو وەك گەنجێکی تێروتەسەل خەڵکی قەشەنگی بەڵکان بەجێ دەهێڵم.

لە زەگرەبەوە بۆ بانیالۆکا، لەوێوە بۆ سەراییڤۆ، ئنجا لەناکاو ڕووەو باکوور بۆ (برۆد) چووین، پاشان دووبارە ڕوومان لە ڕۆژهەڵات کردو لە سنووری هەنگاریا پەڕینەوە بەرەو پێکس (Pecs)، بەم جۆرە بەتالیۆنی هەژدەمین لە گەڕان دابوو، لاسایی کرداره مەزن و لەبیرنەچووەکانی پاڵەوانانی دەکردەوە، هەرچەندە ئەمەیان بەتەواویی بەو جۆرە نەبوو کە تەلگرافەکان لە بەرەکانی جەنگەوە بۆ (نیرۆپا) یان دەگواستەوەو کە بینەرانیان لە سینەمادا تووشی هەناسەسواریی و سەرسوڕمان دەکرد کاتێ فلیمە دیکۆمێنتەکانیان

دەدیت و گوێیان لە مۆسیقای سەربازیی دەبوو. نەخێر، بەتالیۆنی هەژدەمین قەت فلیمی بۆ نەگیراوەو لە فەرمانەکانیشدا ناوی نەهاتووە، تەنیا یەکێك بوو لە بەتالیۆنە نەناسراوە کۆنەکان کە نابووت دەبوو، پێك دەهاتەوە، نابووت دەبوو، پێك دەهاتەوە، ئنجا دیسان بۆ چەند جارێك نابووت دەبوو، پێك دەهاتەوە، چونکە ئێمە نەفرەت لێکراوبووین هەر چەندە ئێمە نەمان دەتوانی وا بەکورت بڕییەکی بێ وێنە هەستی خۆمان وەکو پۆرتا دەربڕین. کە قەت بۆ جرتێك پەکی نەدەکەوت بۆ ئەوەی خاڵێکی پێ لە کۆتایی ڕاپۆرتە نا موحتەمەلەکانی بێژەری ڕادیۆ دابنێ.

پۆرتامان لە دواوە بەجێهێشت لە شارۆچکەی مالیکت لە باکووری ڕۆژهەلاتی پێکس. لە ساتەکانی دواییدا بە هەڵەداوان هات و بەزۆر خزاندیانە ناو کامیۆنەکەوە. دوای دوو دانە دەقیقە، کاتێك بەبەردەم کوخێکدا تێدەپەڕین لە دەرەوەی شاردا، سێ ژنە قەرەجمان دیت کە ئارەزوومەندانە دەستیان بۆ ئێمە ڕادەوەشاند، پۆرتاش هەر بەدەست ڕاوەشاندن وەلامی دانەوەو بۆڕاندی :

– کچۆڵەینە، خواحافیز، ئەگەر هاتوو منداڵتان بوو، منداڵەکەش کوڕ بوو، ئەوا بەناوی باوکییەوە ناوی بنێن (جۆزیف) و بۆ خاتری مەریەمی پاکیزە مەهێڵن ببێتە سەرباز، بەواتاییێکی تر گەواد، ئەمەیان بەڕێزترە.

پاشان پۆرتا بە ئاسوودەیی خۆی لە سووچێکی واگۆنەکەدا خزاند، دەستە کاغەزێکی قوماری زۆر گریزاویی لە گیرفان دەرهێناو ئەوەندەی نەبرد چوورینە ناخی ئەو گەمەیەی کە بە ڤینگت – ئت – ئون (بیست و یەك) ناسراوە، پاش یاری کردنێکی چوار سەعاتیی شەمەندەفەرەکە لە ئێستگەی سنووریی ماکۆ وەستا کە کەمێك لە خوارووی ڕۆژهەلاتی زەگدە.

پێمـان ڕاگەیـەنرا کـە وەسـتانێکی دە سـەعاتیی هەیـە پـێش ئـەوەی بەردەوام بین بۆ ڕۆمانیا، لە واگۆنەکە دابەزین و دەستمان بە پیاسەکردن کرد بۆ بینینی دەوروبەر. هەروەکو عادەتیی، پۆرتا لەسەر بەرپرسییەتی خۆی لێی دا چوو، هـەروەکو عـادەتیش، پاش ماوەیـەکی کـەم سـالان سـالان بـەرەو مـن و پیرەئان هاتەوە، زۆر بێ گوناهانە دیاربوو، بە گوێچکەکانمی چرپاند :

– وەرە !

شارەکە – کە شتێك بوو لە نێوان شارێکی لادێییانە و گوندێك – بە خامۆشیی لە قرچەی گەرمای پاش نیوەڕۆدا لێی ڕاکشابوو. کە لـە شـەقامی سـەرەکیدا، گەرم و ئارەقە کردوو، پیاسـەمان دەکرد جلـەکانمان بە لەشمانـەوە دەنووسا و جووتیـاری شـڕو وریـش لـە سـێبەری درەختەکانـدا لێـی پـاڵ کـەوتبوون و نووسـتبوون. لـە ناکـاو پۆرتـا بەسـەر چـەند شـووره‌یێکدا هەڵگـەڕا و بـەناو پەرژینێکدا چوو، جا ئێمەش خۆمان لە شـەقامێکدا دۆزییـەوە کە خانووەکـان و باخچەکانی بچووك بوون.

پۆرتا گوتی " من دەتوانم شت بۆن بکەم " ئەمەی گوت و دەستی بە ڕاکردن کرد.

ئەنجامەکەشـی ئـەوە بـوو کـە مـن و پیرەئـان لـە ناکـاو خۆمـان لـە پـشت پەرژینێك شاردەوە، هەر یەکەشمان قازێکی خنکاوی بە دەستەوە بوو، کەچی دەرزەنێك ژن و پیاو سەریان لە دوو پۆرتا ناو ئەویش بەڕاکردن خوا خوای بوو خۆی ڕزگار بکات.

بە پەلە بەرەو شەمەندەفەرەکەمان گەڕاینەوە، قازەکانمان لەبەر چاوان شاردەوە، ئنجا گەڕاینەوە بۆ ڕزگار کردنی پۆرتا.

تووشی بووین، به هەنگاوی گەورەوە لەگەڵ ژمارە پاسەوانێکی زۆرەوە ملی ڕێگای گرتبوو کە پێکهاتبوون لە لیفتنانتێکی هەنگاریی و، دوو سەربازی دەورییە بە سونگییەوە، دووان لە پۆلیسی سەربازیی خۆمان لەگەڵ پەنجا کەسێکی هاوار کردوو کە بە دەست و سەر ئیشارەتیان دەدا، هەنگاریی، ڕۆمانیی، سلۆڤاکیی و قەرەج.

پۆرتا هەموو ئەمەی بەو پەڕی هێمنییەوە وەرگرت، پێی گوتین" وەکو دەبینن، بریکاری پاشای هەنگاریا، باشترین دۆستی فۆهەری ئێمە لە وڵاتدا، پاسەوانی شەرەفی بۆ من ئامادە کردووە ".
خۆشبەختانە ئەوەی پێشوازی لەم کاروانە کرد کە گەیشتە واگۆنی سەرکردایەتی سەربازیی مێجەر هنکا بوو، هنکا گەنجێکی ڕوو خۆش بوو، یەکێك بوو لە پشتیوانە تایبەتەکانی پۆرتا، هێمنانە گوێی لە تاوانبارکردنەکانی لیفتنانتە هەنگارییەکە گرت، پاشان کە لیفتنانت لێبۆوە، ئەو دەستی پێکرد :
- بۆ خاتری خوا ئێوە تاکو ئێستا چی بوون ؟ دزیی و هەوڵی کوشتن، ئێوە هەر تەنها قاز دزینتان نەکردووە تا ئەو هەموو خەڵکەمان بەسەردا وەربپێت، بەڵام، خوا بمگرێت ئەگەر پەلاماری سەربازە هەنگارییەکانیشتان نەدابێت، کە هاوچەکمانن و شەقیشتان لە سەگێکی بەنرخ هەڵنەدابێت. ددانە دەستکردەکانی یاریدەدەری مەئموری جێبەجێکردنیشتان نەشکاندبێت، نەشبووبنە هۆکاری لەبەرچوونی دوو منداڵ. بۆ ئەمە چی دەڵێن، هەی مەیموونە پیێ خوارەکان.

ئەم هەموو قسانە بە هاوارەوە بە گوێچکەی خەڵکەکەدا درا بۆ ئەوەی ئەو حەشامەتە سەرسوڕماوە بزانن کە پۆرتا چۆن تێگلاوە.
ئنجا پۆرتا هاواری کرد : هێر مێجەر ئەم کۆمەڵە گێژە و ڕێنەکەرانە درۆزنی ئەوەندە ترسناکن کە ڕۆحی دیندارم لە ناخەوە لە بەریان دەلەرزێت، قەسەم بە داردەستە پیرۆزە گرێدارەکەی (سانت ئەلیزابیت) کە من هێمنانە و بە ئارامیی بە ڕێگادا دەڕۆیشتم بێ گوناهانە خۆشیم لەو دیمەنە جوان و ئەو کەش و هەوا خۆشە وەردەگرت. من تازە کەوتبوومە ناو نوێژێکی بێ دەنگی سوپاسگوزاریی بۆ خوا کە ڕێگەی پێدام لەناو ئەو بەختەوەرانە بم کە بوونە سەربازی فۆهەری گەورە و خۆشەویستمان، بەم جۆرەش ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا ئەو دنیا پان و بەرینە ببینم کە دەکەوێتە دوور لە شارە خنجیلانەکەمان، بەرلین، ئا لەم کاتەدا بوو بە لەناکاوییەکی وا کە بۆ دەمارە هەستیارەکانم زۆر خراپ بوو، من لە تێفکرینە خۆش و دینداریيەکەمدا بەهۆی کۆمەڵێك شەیتانی دڕندە دابڕام کە لەناکاو لە پەنای هەندێك تەڕاشەوە هێرشیان هێنا کە لەوێدا خۆیان حەشاردابوو چاوەڕێی منیان دەکرد. نازانم ئەو ساتە چیم لێکردن، بەڵام ئایا هیچ سەیرێکی تێدایە. کە من لە ترسان هاوارێکم کردو دامە بای غاریێ ؟ تەنیا توانیم ئەوەندە بزانم کە دەیانەوێ بمکوژن، چونکە من قەت هزرم بۆ ئەوە نەدەچوو کە ئەوانە مەبەستیان هەر ئەوەیە شقارتەم لێ بخوازنەوەو وەکو تێبینیشم کرد یەکێکیان سەعاتی لەدەست بوو، بۆم دەرکەوت کە مەبەستیان کات نەبوو.

پاشان هەر کە بە بەرزترین خێرایی سووڕامەوەو لەوێدا یەکێك لە سەربازەکانی ئۆپەرێت وەستا بوو بەخۆی و ئەو پەڕەمووچانەی لەناو کڵاوە گێلانەکەیدا بوون، هەروەها ئەو سندووقە بۆیەی کە بەسەر سنگییەوە بوو،

کاتێکیش ویستی ڕامبگرێ هیچم پێ نەکرا، تەنیا سووکە پاڵێکم پێوە نا، دڵنیاشت دەکەم لەوەی کە هیچ جۆرە کردارێکی بێ ئەدەبییانەی ئەنقەست نەکراوە. من لەو باوەڕەدام کە نەختێك توند کەوتە خوار، بەڵام ئەگەر تا ئێستا هەڵنەستابێتەوە ئەوا بە دڵخۆشییەوە ئامادەم بیبەمە نەخۆشخانە. پاش ئەمە کۆمەڵێك لەم تەیرە پەڕدارانە بە لووره لوور هاتن تەواو وەك کرداری ئەو هندییانەی کە ئامادەی جەنگ دەبوون، بەپێی ئەو پەرتووکە قەشەنگەی – کە بێگومان هێر مێجەر دەزانێ کامەیە – و کە پەرتووکی (دیرسلابەر)ی پێ دەڵێن. جا ئەگەر نەشت خوێندۆتەوە، ئەوا بۆ داپیرەم دەنووسم و لێی داوا دەکەم، چونکە دەزانم پەرتووکەکەی هەیە.
مێجەر هێنکا هاواری کرد، بەسیەتی، پۆرتا، دەکرێ ڕوونکردنەوەیەکم لە بابەت قازەکانەوە بدەیتێ ؟ . پۆرتا گوتی : هێر مێجەر، هاوکات لەگەڵ دڵخۆشی زۆرماندا، فرمێسك بە دەم و چاوە پیسەکەیدا گلۆر بوونەوە، من نازانم ئەم خەڵکە باسی کام قاز دەکەن، بەڵام تۆ خۆت چاك دەزانی من چەندین جار وەبەر هەڵەی خەڵکی تر کەوتووم، من لە هەموو کەسێك بێ بەختترم و دڵنیام لەوەی کە بەلای کەمەوە دوو کەس هەن کە بە من دەچن، داپیرەشم هەر وای دەگوت.

ماسولکەکانی کوڵمی مێجەر هینکا لەرزین، بەڵام هەوڵی دا خەندە لە دەم و چاوی دوور خاتەوە، کاتێکیش ڕووی کردە لیفتنانتە هەنگارییەکە دڵنیای کرد کە پۆرتا سزای شایستە وەردەگرێت لەبەر ئەو دزییەی.
ئەو ئێوارەیە مێجەر هنکاش گۆشت قازی خوارد.

لەسەرەوە و لە خوارەوەی ژمارەیەکی بێپایانی واگۆنی شتومەک هەڵگر خشین تا هاتینە لای یەکێکی گەورەی داپۆشراو کە دەرگاکەی بە مۆری ڤێرماخت مۆر کرابوو. هەم مۆرو هەم قفڵەگەورەکەش شکا بوون، هەر چۆنێک بوو پیرەئان بەخێرایی پاڵێکی بەدەرگاکەوە ناو وەلای نا.

پێی گوتم : تەماشایەکی ئەوە بکەو، پێم بڵێ چییە ؟

ئەو دیمەنەی هاتە پێش چاوەکراوەکانمان بەتەواویی ئێمەی بەرەو دواوە گەڕاندەوە. خودایە ! شتی وا تا ئێستاش هەیە ؟ سەدان تەنەکەی پڕ لە ئەناناس، هەڵووژە، پارچە گۆشتی خاو، ڕانە بەراز، مارچووبە، قرژاڵ، ڕۆبیان، زەیتوون، ماسی سەردین، ژمارەیەک جەرەی زەنجەفیل، خۆخ، قاوەو چای، چوکلێت، جگەرەو ئارەق، ئارەقی سپی - ئارەقی سوور، برەندی، شەمپانیا.

دوکانە بە قاڵیک بەسەر چەرخەوە، هۆزانێک، شانۆگەریەکی ڕۆژهەڵاتیی.

بە هەناسە بڕکێوە تیچ گوتی" خودای مەزن، ئەم کامیۆنە هی کێیە" ؟

پلوتۆ وەڵامی دایەوە "مەبەستت ئەوەیە، ئەم کامیۆنە هی کێ بوو، تەنانەت دەعبایێکی وەکو تۆش دەبێ بزانێت کە خوا هەنگاوەکانتی پاراستووە، خواش ئەمەی بۆ ئەوە نەکردووە کە لەسەر پێیەکانی دواوەت ڕابوەستی و ئەو جۆرە پرسیارە دەبەنگانە بکەیت".

ڕۆژی پاشتر کە گەیشتینە وێستگە گەورەکەی کاڵاو شتومەک لە بوخارست، کە لەوێدا بڕیار وابوو دابەزین، پۆرتا خۆی و جانتایەک ئارەق بزر بوو، دوای ماوەیەکی کەم مەکینەیەک کامیۆنەکەی ئێمەی کێشایە لا ڕێیەکی دوور، کە لەبەر چاواندا دیار نەبوو. پۆرتا تەنانەت ستاب فیلد وێبلێکی وا لێکرد کە فۆرمی بار گواستنەوە بۆ کامیۆنەکە پڕ بکاتەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە بەڕاستی کامیۆنەکە سەر بەبەتاڵیۆنی ( ١٨ ) مینە.

# شکۆدارییەکانی خەڵکی بەڵکان

لەو سەربازخانە ڕۆمانییانە هێنراینە خوار کە کەوتبوونە سەر ڕووباری دۆمبرۆڤیتز کەمێك لە دەرەوەی شارەوە. ئێوارەی ڕۆژێکی شەممە، پۆرتا چووە بۆخارست بۆ ئەوەی لەگەڵ هەندێ لە ڕۆمانییە ئاشناکانی خۆیدا یاری پۆکەر بکـات، لـەکاتی دیـاریکراوی نمایـشکردنی سـەربازیی لـە بـەیانیی ڕۆژی یەکشەممە نەهاتـەوە. بۆ ئـەو هـیچ نـەبوو، بـەڵام بـۆ مـن دەبوایـە لـەکاتی نـاو خوێندنەوەدا بۆ ئەویش بڵێم (بەڵێ).

بـیروڕای (پلۆتـۆ) وابـوو کـە پۆرتـا گـرەوی کـردووە و هـەموو شـتێکی دۆڕانـدووە تەنانـەت جلکەکانیـشی، ئێـستا کـە لەگـەڵ کـچێك دایـە چـاوەڕێی یارمـەتی دەکـات. ئێمـە هـەموومان باوەڕمـان وانـەبوو، چـونکە پۆرتـا لـە فـرت و فێڵـی یـاری کاغـەزدا بلیمـەت بـوو، بـە هـزری ئێمـە، لەوانـەترین و نارەحـەترین ڕوونکردنــەوە ئــەوەبوو کــە پۆرتــا هــەموویانی قــەلۆش کردبــێ و ئــەوانیش پەلاماریان دابێ.

هەر کە نانمان خوارد، یەکسەر ڕوومان لە شار کرد بۆ دۆزینەوەی پۆرتا. بەهەر حاڵ ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە بۆخارست شارێکی گەورەی یەك ملیۆن کەسییە. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو شارەکە ڕووبەرێکی گەورەی هەیە و پڕیەتی لە پارکی گەورە و، شـەقامی پـان و پۆڕی بەدرەخت و کۆڵانی دوور و درێژ کە خانووەکانیان لەناو باخچەکانیان دان.

بەڵام پێویست نەبوو هەراسان بین. لەکاتێکدا کە لە یەکێك لە ناوچە نیشتەنییە هەرە باشەکاندا بەشەقامێکدا دەڕۆیشتین تووشمان بوو بە تووشی گرووپێکی سەیر کە بەرەو ڕوومان دەهاتن، ئەوەندە سەیر بوو، تەنانەت هەموو کەسێك ڕادەوەستاو سەیرێکی دەکرد، چوار پیاو بوون، دووانیان سەربازی ڕۆمانی بوون، یەکێکیان دەرەجەدارێکی ئیتاڵیایی لەگەڵ پیاوێك کە جل و بەرگی تەواوی شەوانەی لەبەر بوو، ئەمانە بەم لاو بەو لادا دەهاتن و تەخترەوانێکی گەورەیان پێ بوو، ئەو کاتەی کە دەڕۆیشتن، بە هەموو هێزیانەوە هاوڕێ لەگەڵ بلوێردا هاواریان دەکرد، بلوێر ژەنەکە نەدەبینرا، لەتوێی دڕندەیەکی وارنیش و ئاوەزێڕدا خۆی حەشاردابوو لەناکاو هاواری کرد :

– کۆیلەکان، بوەستن ! خۆ ئامادەکەن بۆ سەر زەوی ! ئاگاداربی – سەر زەوی !

هەردوو هەڵگری لای پێشەوە، تەخترەوانەکەیان بەزەویدا کێشاو دەنگێکی گەورەی وای لێوەهات کە لە دووریی چەند مێلێکەوە گوێبیستی دەبوون و بەهۆیەوە پۆرتا پەڕییە دەرەوە، کە ئەو، خۆشی کراس و چاکەتێکی ڕەقی لەبەردا بوو، کڵاوێکی لەسەر بوو، تاك چاویلکەیەکیشی لەچاو بوو، بەئیشارەتێك سڵاوی لێ کردین کە لەو جۆرەی بوو کە ڕۆماننووسە فەرەنسییە خراپەکانی کۆتایی سەدە پێیان دەگوت (لەوەسف نەهاتوو)، ئنجا بەدەنگێکی کاریگەرەوە بانگی پیرەئان و ئێمەی کرد :

– ! Cheris ! Mes Feres چەریۆ ! برادەرەکانم ناوم کۆنت دی لا پۆرتایە، سوپاس بۆ یەزدان ئەگەر بەهەڵەدا نەچوویم، کوڕینە، من دەتانناسم ؟

– ئایا کاروباری سوپای ئەڵمان بەباشیی دەڕوات ؟ تکایە با لیستی سەرکەوتنەکانی ئەمڕۆتان ببینم.

تیچ گوتی، بۆ خاتری خوا ئەم سەردانە چی بوو کردتان ؟ ئایا واگۆنە ڕەسەنە ئاژەڵ هەڵگرەکەمان چی تر بەکەڵکی ئێوە نایەت ؟

– من بیر لەوە دەکەمەوە کە خۆم بەهۆی ئەم واگۆنە تایبەتەوە کە ئێستا تەرخان کراوە بۆ باشترین سەرباز لە سوپای ئەڵمانیادا، بگوازمەوە بۆ بەرەی ڕۆژهەلاتی جەنگ. جێمس – کە بەمە مەبەستی من بوو – تۆ دەبێ هەر یەکسەر لەدوای منەوە بڕۆیت و تفەنگەکەمم بدەیتە دەست کە ویستم تەقە بکەم. سەیرکە ئەم باشترین پیاوە ئەڵمانییە کە بەدیقەت نیشانی گرتووە پێش ئەوەی من تۆپەکە بکێشم. ئێمە هیچ جۆرە زیانێکمان لەم جەنگەدا ناوێ.

– ئەدی کوا بەدلەکەت ؟

– جوامێرینە، ئەم جەنگە، جەنگی جوامێرانە، منیش بەدلەی جوامێرانەم لەبەرکردووە. سەرەرای ئەم تەختەرەوانە و ئەم چاکەتە بێ عەیبانە من (٢٣٠٠) تاجە گوڵینە و سندووقە مۆسیقایەکی زۆر جوانم بردۆتەوە کە دەتوانم ئێستا بۆتانی لێبدەم.

پۆرتا خۆی لە قووڵایی تەختەرەوانەکە رووکرد و ئنجا لەگەڵ سندووقە مۆسیقایەکی نەخشراوی جوانەوە دەرپەڕی، کە ماوەی چەند دەقیقەیەك مۆسیقای ژەنی لەکاتێکدا دوو کچە شوانی لە فەرفووری دروست کراو سەمایان دەکرد. بێگومان پارچەیەکی بە نرخ بوون. پاش دوو ڕۆژان پێشکەشی باجگری ترامی کرد.

– ئنجا لە پاشان منیش دۆستێکم دەست کەوت – بەخۆی و ڕان و هەموو شتێکی ترییەوە.

– بەچییەوەی ؟

پۆرتـا دەنگـی دایـەوە "بەچیەوەی ؟" منداڵینـە، نـازانن دۆسـت چـییە، بووکە شووشـەی کۆنـت و باڕۆنەکانـە. ڕان و مـەمك و سمتـی هەیـە. ئەمەیـە کـە ئێوە گەمەی پێدەکەن. دەتوانن لـە شوێنە گرانبەهاکاندا بیکرن کـە شـامپانیای تیادا دەخۆنەوە کاتێك کە مۆدێلەکان دەپشکنن. ئەمـەش پێش ئەوەی بکەوێتـە جووڵـە بەچـەکە پارەیـەك قـوڕمیش دەکرێـت، هەڵبـەزو دابـەز دەکـات تـا مانـدوودەبێت، پاشـان بـەهۆی چـەکە پارەیـەکی تـرەوە قـوڕمیش دەکرێـت، جـا ئەگەر ژمارە چەکە پارەیەکی زۆرتان هەبێت ئەوە قەت ناوەستێت.

پۆرتـا شووشـە شـەرابێکی دا بـەو چـوار کەسـەی کـە هـەڵیان گرتبـوو، ئنجـا بۆڕاندی :

– فەرموون، کۆیلەکان، ئەمە بەنزینە ! بیخۆنەوە و خەم بە باکەن !

پاشان جووتە شووشە شناپێکی پێداین و بە فیزێکەوە گوتی :

– با گۆرانییەك لە ستایشی پیرە خواوەندی چاکدا بچڕین.

بلوێرەکـەی خستە سـەر لێوەکـانی و دەسـتی بـە ژەنین کـرد، هـەر چـوار هـەڵگرە دڵخۆشەکەشی بۆی بوون بە کۆرس :

– ئێستا کاتی ئەوەیە لەگەنی پڕ بە تاڵ بکرێ،

ئێستا بە پێی ڕەهاوە بۆشایی کردن لە زەوی بدەین،

ئێستا لەگەڵ جەژنی سالی دا بۆ ڕازاندنەوەی وێنەکانی خوداوەندەکان، هاوڕێیانم ! .

من گوتم : " شەیتانینە، ئەم هۆرەیە لە کوێ فێر بوون ؟ "

پۆرتا بێ شەرمانە وەڵامی دایەوە کە هێلەکان خۆی کێشاونی.

پیرەئان بە هەوەسەوە لێی پرسـی " بەڕاسـت تـۆ ئەمـەت کـردووە ؟ من قـەت نـەم دەزانی تۆ وا پیری. ڕۆمانـەکان وا ڕاهـاتبوون کـە دوو هـەزار سـاڵ لەمەوبـەر ئـەم گۆرانییە بچڕن " .

کۆیلەکانی پۆرتا وەسفێکی ئاشکرایان لە بابەت ڕووداوەکانی ئەو شەوە پێدایین. پۆرتا یاری کاغەزی لەگەڵ بارۆنێکی گەنجدا کرد. هەردووکیان ئەوەندە بە ئاشکرا فێڵیان دەکرد کە منداڵ هەستی پێدەکرد، لەدواییدا پۆرتا هەموو شتێکی بردەوە، تەنانەت جل وبەرگی سەر بارۆنەکەش. دوای ئەمە خۆی و هەر چوار گەنجەکە بۆ خۆراك خواردن چوون. ئێستاش وا هەڵیان گرتووە بۆ بازاڕ لەگەڵ ئەو جوانە کچەی کە لە بارۆنی بێ بەختی بردبۆوە.

پاشان پرِیان دایە تەختەڕەوانەکە و بەملاو بەولادا بە ڕێگادا دەهات و دەچوو، لەکاتێکدا ئێمە لەوێدا وەستابووین و دەستەکانمان دەهەژاند و بەقایمی شووشە شناپەکانمان گرتبوون.

درەنگانێك لەو پاش نیوەڕۆیەدا هەر چوار کۆیلەکە، پۆرتا و بلویَر و هەموو شتیان لە تەنیشت دیواردا لە دەرەوەی سەربازگەکەدا دانا. هەوڵماندا رای بکێشینە ناوەوەو یەك لە دکتۆرە تازەکان بەرتیلخۆر بکەین بۆ ئەوەی ڕێی پێ بدرێت بخرێتە نەخۆشخانەوە، کە لەوێدا دوو شەو خەوت. ئێوارە پۆشاکی بۆنە فەرمییەکانیمان خستە بنی ئەو جانتایەوە کە بەدرێژایی جەنگ لەگەڵ خۆیدا گێڕای. لە بۆنە خۆشەکاندا – یا هەتا لەو کاتانەدا کە وای بۆ دەچوو بۆنەیەکی شادمانیی هەیە – لەبەری دەکردن، تەنانەت لە بۆنەیەك زیاتر ئەوەی لەناو خەندەکەکانیشدا کردووە.

ڕەنگبێ ئەو تەختەڕەوانە ئێستاش لە تەنیشت دیواری سەربازگەکەدا مابێ لە دەرەوەی بوخارست وەك جۆرێك لە یادگاریی جەنگی ئاشتییانە. ئەگەر وابێ ئەوا بێگومان ڕۆمانییەکان بە میهرەبانیی زیاترەوە سەیری دەکەن لەوەی کە

سەیری ئەو کەلاوانە دەکەن، کە یادگاری ڕاستەقینەی سوپای ئەڵمانین کە لە پاش خۆی بەجێی هێشتوون.

ئەگەر بهاتبایە، پۆرتای زیاترو بەشێوەیەکی دیار (هاپتمان میر)ی کەمتر هەبوونایە، ئەوا گومان لەوەدا نەدەبوو کە دەمانتوانی خەڵك ژێر دەستە بکەین، دوژمن ڕاوەدووبنێین و بیکەین بەدۆست و برای هەمیشەییمان. دەمانتوانی دوژمن ڕاوەدووبنێین نەك لە جەنگی خوێناویدا بەڵکو لە پێشبڕکێییەکی خواردنەوەدا کە قەت بە کارێکی زەحمەت دانانرێ و، قازانجێکی وای هەیە کە هۆکارەکان هەموو کەسێك ڕازی دەکەن، کە چی هەر زۆر ئاسانترە پیاو لەسەرخۆشیی چاك بێتەوە لەوەی کە قاچێکی بێتە پێکان.

ئێمە نەهاتبووینە ڕۆمانیا وەك گەشتیاری پێشوازی لێکراو بەڵکو وەك هاوڕێی چەك میواندارییمان کرا، بۆیە ڕۆژنامەکان ئاشکرایان کرد کە ئەڵمانیا و ڕۆمانیا هاوپەیمانی لەیەك نزیکن و وەك برا پێکەوە و شان بەشان بۆ مەبەستێکی گەورە دەجەنگن. خەڵکانی وەکو پۆرتاو پیرەئان و، گەلێکی تر لەوانەی بەکاری قورس حوکم دراون لە ناو سوپای ئەڵماندا، بەلای ڕۆمانییەکانەوە خۆشەویستتر بوون لەوەی کە مرۆڤ بیری بۆی دەچێت، بەڵام بەدلەکانمان وانەبوون، ئەوانیش هەر بەدلەکانمانیان دەدیت. ئەوان هەر وایان دەزانی ئێمە هاوپەیمانین لەگەڵ گاردی ئاسنین، لەگەڵ بارۆنەکان، لەگەڵ ئاسامییەکان، لەگەڵ جەنەراڵی دکتاتۆر ئایۆن ئەنتۆنیسکۆ، لەگەڵ ئەو ئۆرستوکراتانەی کە زەوی و زاریان بەزەبری تارژانگی پەرەسەندنی ژێرخاندا داگیر دەکرد.

لە ڕاستیشدا، زۆر زەحمەتتر بوو کە لە خاکی ڕۆمانییە، براکانماندا برایەتی لەگەڵ خەڵکدا ببەستین یا هیچ نەبێ لەگەڵ چینی تایبەت لەو خەڵکە لەوەی کە لە زۆر لەو وڵاتانەی کە سوپای ئەڵمان داگیری کردوون وەك دوژمن. ئێمە لەو چەشنە هاوڕێیانەی چەك بووین کە کەس هیچی پێمان نەبوو تەنیا بێ باوەڕیی قووڵ نەبێت. شتێکی زۆر نموونەییش بوو کە پۆرتا چووە ناو دڵی ڕۆمانییەکان بەهۆی باڕۆنێکی فاسقەوە. چینە بەرزەکان تەنیا ئەوانە بوون کە دەیانتوانی شتێك لەگەڵ ئێمەدا بکەن. بێگومان ئێمە کە هاتبووینە ئێرە بۆ ئەوە بوو بەرگری لە پارە و پوول و مافە مەدەنییەکانیان بکەین، بۆ ئەوە بوو بەرگری لەوان بکەین نەك هەر لە دژی سۆڤییەت یان سۆشیالیزم، بەڵکو لە دژی کرێکارە ڕۆمانییە بەد بەکاربردە و ناڕازییەکان و وردە جووتیارەکان کە پێویستە بەدەستێکی ئاسنین سەرکوت بکرێن. ئەو خەڵکە پێخواستە، کەم خۆراکە، زۆرلێکراوە، یاخیبووە، یەکسەر بیانیان ناخەنە ناو دڵی خۆیانەوە، هەر چۆنێك بێت ئەوانەی لە تۆبکەن ڕەنگبێ بڵێن ئەمانە برا و هاووڵاتی یەك جۆرن، چونکە هەردوو لامان تازە – ئەورووپایین و ژیانی ئەو کاتە لە ڕۆمانیا کەم یان زۆر وەك بۆی دەچم لە ژیانی ئێستای ئیسپانیای دەکرد، ئەو ژیانە لەبەر باوەڕ نەکردن بە کەس و بەهیچ شتێك دژوار بوو، لەگەڵ بوونی ململانێیەکی ناوەکیی لەژێر پەردەدا، کە ئەوەندە لێیەوە نزیك بوو، پیاو کۆرە دەبوو بۆی نەدەدۆزرایەوە.

بێبەختانە، ژمارەیەکی زۆر لەسەربازە ئەڵمانەکان هەم کۆرە و هەم کەڕیش بوون. ئەوان پەیوەندیی نێوان شتەکانیان پێ نەدەدۆزرایەوە، هیتلەر کۆرە و گۆبلزیش کەڕی کردبوون. ئەوان باوەڕیان بە هەموو شتێك دەکرد، جا لەبەرئەوە لەوە نەدەگەیشتن کە لەبەرچی ڕۆمانییەکان وەك پاڵەوانی زاڵبوو

پێشوازیان لێنەدەکردن. ئەوان پێیان خۆش نەبوو، ئەوان ئازار درابوون. هەندێکی تریشیان ئامادەبوون کە بۆگەنیی هەموو شتێك بۆن بکەن، بەڵام ئەوانە لە ناخەوە ئەوەندە شێوێنراو و ترسێنراو بوون کە نەیان دەتوانی ڕووبەڕووی گرفتەکە ببنەوە، وازیان لە شتەکان دەهێنا بۆ ئەوەی ڕێرەوی چەوتی خۆیان وەربگرن و نەیان دەوێرا سەیری یەکتری بکەن - کەمتر لەوانەی کە هاوڕێی چەکمان بوون.

پۆرتا سوودمەندێکی دڵشاد بوو، ئەو، بارۆنێکی ڕووت کردبوو، ئێوارەیەکی تەواوی لەسەر قازانج ڕابوارد و ئنجا پاشماوەی دەستکەوتەکەی پێشکەشی باجگری ترامێك کرد، ئەو، باشتر لە ئێمە هەوڵی دا. ئێمە کەم یا زۆر خۆمان بە خۆشگوزارییە دیدییەکانەوە ڕازی دەکرد، بە جوانیی دیمەنەکانەوە، بە خەفەتە لەبن نەهاتووەکانی بۆستزاوە، بە پان و پۆڕیی و فرە بە پیتیی زەوی و زاری بە گەنم چێنراوی ڕۆمانییەکانەوە و هەرێمە شاخاوییە دڵڕفێنەکانەوە، بە وێستگەنشینە نوستووەکانی نیوەڕۆیان و بێداربووەکانی ئێوارانەوە، بەو مێگەلە مەڕانەی تاکە شوانێکیان لەگەڵدا ڕەودەکات بە چاکەتی سپی و زبر و کڵاوی پێستە مەڕەوە، کە مەشکۆڵەیەکیان بە داوێك بە سەر شانەکانیانەوە هەڵواسیوەو، لە ملاو لەو لادا کۆمەڵە مێرد منداڵی لاواز و منداڵی چاو گەورەی سەقەت دەردەکەوتن. بوخارستیش، ئەو شارە سپییە نایابە بەخۆی و گەڕەکە نیشتەجێبووە مەزنەکانییەوە، ئۆتۆمبێلە گرانبەهاکانییەوە، دەوڵەمەندە ڕوح گەورە و جووتیارە هەژارە لەخۆبێزارە جلشڕە ناشادە خۆتێهەڵکوتەکانییەوە بە جل و بەرگە نەتەوەییە ڕەنگاو ڕەنگەکانییانەوە.

بەلای ئێمەوە، ژیانی ئەو خەڵکە تەنیا بۆ ئەوە بوو کە تێڕامینێین نەك بەشداری تێدا بکەین، مەگەر کابراییێکی بەدبەختی شایانی لە سێدارەدانی وەك پۆرتا نەبێت. تەنیا ناوبەناو یەك لە ئێمە بەهۆی بەکارهێنانی پلەی جیاوازی بێ هێزی ئاوازی دەنگیی و ڕەفتارییەوە لە وەدەستهێنانی بڕێك سۆزدارییەتی بێدەنگدا سەردەکەوێت - کە قەت بە وشە ناهێنە دەربڕین - لەگەڵ کەسانێك کە لە وڵاتەکەیاندا خۆمان لەژێر سەختترین باروودۆخدا بینی - کە ئەویش بریتی بوو لەوەی ئێمە برادەری ناخواستە بووین. ئێمە بۆمان نەدەکرا ببین بە هیچ شتێکی تر، چونکە ئەو کۆنە چیرۆکە بوو کە : ئێمە هاتووینەتە ئەم وڵاتە لەژێر پەردەی بەرەنگاربوونی دوژمنێکی هاوبەشەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئێمە زیادە هێزێکی پێویست بووین بۆ هێزی پۆلیسی ئەو وڵاتە. لەژێر پەردەی پاراستنی گەلی ڕۆمانیا لە پەلاماری سۆڤییەت ئێمە تەنیا و پێش هەموو شتێك هاتووین کە بیرەکانی نەوت، کانەکان، ئیمتیازی هێڵی ئاسنین، مۆڵکە گەورەکان و شەراب و شقارتە و، چنین و، شەکرو، کاغەزو، مادەکانی جوانکاریی و مۆنۆپۆلە بێ کۆتاییەکانی تر بپارێزین، لە ڕاستیشدا بۆ ئەوەبوو کە سەرو سامانی وڵات بەدانیشتوانی هەژارییەوە لەوەبەرگرتنی ڕێگای خراپ بپارێزن کە خۆماڵی کردنە.

ئایا میللەتێك چ مافێکی لە نەوتەکەیدا هەیە ؟

هیچ - تا ئێمە لە ڕۆمانیادا مابین لەگەڵ هەنگاری و ئیتالی و (برادەرە) بیانییەکانی ترمان کە بۆ یارمەتیدانمان هاتبوون، دەوڵەمەندەکان بەشێوەیەکی ناماقووڵ دەوڵەمەندبوون، هەژارەکانیش نا ماقووڵانە هەژاربوون - ئۆردووی گیراوەکان .... ئۆە، هەموو شتێك ناماقووڵ بوو.

لەوێدا، لە بەڵکان بوو، وا تێبگەم من ئەوەم زانی کە پێویستیمان نەك هەر بەشۆڕشێك هەیە بەڵکو بەشۆڕشێکی ڕێکخراو هەیە لە دژی جەنگدا. من گەیشتمە ئەنجامێکی وا کە جەنگ ئەوەندە بێ سوود نییە، وەك لە هەندێ کاتی بیرکردنەوە و هەڵچووندا جاروبار هەستی پێدەکەین.

سوودەکەی ئەوەبوو کە ئێمە دەبوایە هەندێ شابەڕووی تایبەت لە ئاگردا ڕابکێشین، جا کە ئەوەمان کرد، ئەو کاتە دەمانتوانی بزانین کە ڕەنگبێ نەتوانین لەسەر خۆڵەمێشدا بژین.

ئەم بیروڕایانە تا ئەو کاتە لە مێشکی مندا ڕوون نەبوون بەڵام هەشبوون. من تا ئەو کاتە نەمدەزانی دەریان ببڕم. من هەر بۆ ئەو ساتە دەژیام و قەتیش زۆر بیرم نەدەکردەوە. دەبوایە وەکو پێویست زاڵ بم بەسەر ئەو دۆخەی کە تیایدا بووم پێش ئەوەی بتوانم دەست بە هیچ شتێك بکەم بەو وردییەی وەك کاری بیرکردنەوە پێویستی پێی هەیە.

هەر لەو کاتەوە کە لە فرێبورگ لێک جودابووینەوە گەلێک نامەی ئاسکمان بۆ یەکتری ناردبوو، بەڵام لە هەموو نامەکانی ئۆرسوڵادا، هەستم بەتێبینی وردە دابەزێن دەکرد، کە هەندێ جار بەتەواوی بەهۆی نەگبەتی ئەو خۆشەویستییە یەکلایەنەوە و لە ئەنجامی ئەو ئارەزوومەندییەوە کە بتوانم بیخەمە سەر ئەو باوەڕەی کە بەهەڵەدا چووەو منی خۆشدەوێت، تەنیا هەر ئەوەندەیە کە خۆی باوەڕی پێناکات.

وەڵامی تەلگرامەکەی من ئێوارێ گەیشت :

لە ڤییەنا بم بینە. لە چێشتخانەی پلە یەکدا چاوەڕێ بکە. ئۆرسوڵا.

# ئۆرسۆلا

ئۆرسۆلا لەویٚ نەبوو، حەتمەن شەمەندەفەرەکەی دواکەوتووە، هەر ئێستا دەگات، لەلای مێزێک دانیشتم کە لەوێوە چاودێری دەرگاکەم دەکرد، لێشاوێکی بەردەوام لە خەڵک دەهاتن و دەچوون، جاروباریش لە یەک کاتدا ئەوەندە زۆریان دەهاتنە ژوور کە نەم دەتوانی هەموویان بە یەک تێڕوانین ببینم، بۆیە وەک نیمچە شێتێک دەمامەوە.
کاتژمێرێک زیاتر بەسەرچوو.

نامەکانی ئەوم لە گیرفانێکی ناوەوە دەرهێنان و بۆ جاری هەزارەمین دەستم بە خوێندنەوەیان کرد، دێڕێکم دەخوێندەوە و چاوێکم لە دەرگاکە دەکرد. لە ناکاو هەراسان بووم : گریمان لەو کاتەی چاوم لەسەر نامەکان بووە ئەو لەویٚ بووە، گریمان ئەو لەویٚ وەستا بووە و تەماشاییەکی دەوروبەری کردووەو منی نەدیتووەو گەڕاوەتەوە، سواری شەمەندەفەرێک بووە و بەرەو میونیخ چووەتەوە.
پاش ئەوەی بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لەویٚ دانیشتم، چوومە دەرەوە و پرسیم ئاخۆ شەمەندەفەرەکەی میونیخ دواکەوتووە. پێیان گوتم یەک کاتژمێر پێش ئەوەکەی من گەیشتووە. کابرا زۆر بەئەدەب و دۆستانە بوو، بەڵام بەتەواویی لە گرفتەکەی من بێباک بوو، منیش هیچم لەبارەیەوە پیٚ نەگوت، بەڵام بێگومان لەسەر دەموچاوم دیار بوو، هەموو کەسێکیش هەستی پێدەکرد.

لەگەڵ هەست کردن بەبۆشایی و بیٚ ورەیی، هەڕەمەکییانە ملی ڕێگام گرت. بۆ خاتری خوا من بۆچی هاتمە ڤییەنا ؟ گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم لە

ڕێستۆرانتەکە و لەوێ دانیشتم، لەخەڵکی ڕادەمام، هەوڵم دەدا بیربکەمەوە، خۆشەویستی بکەم، لەناخەوە بگریم، ڕق وکینە هەڵڕێژم، گریمانە دروست بکەم، پلانی داهێنکار بۆ دۆزینەوەی وی دابڕێژم، ناڕووداوی پەسند بدۆزمەوە کە ڕەنگبێ ڕووی دابێ، لە کاتێکدا دەنگەکان لە دەوروبەری مندا گێژەیان دەهات، تەقەی هێمارە گڵێنەکان، دوو ئامێری پارە ژمێر پڕەیان دەهات و دەخیلەکانیان دادەخران و دەکرانەوە، هەموو کەسێک سەرقاڵ بوو، یان خەریکی خزمەتکردن بوو، یان خواردن، یان جگەرەکێشان و قسەکردن، پێکەنین - بەلاّم هەموویان دەژیان، من تەنیا کەسێك بووم کە کەس نەیدەناسی، لەبەرئەوە نەمدەتوانی بژیم، بەلاّم دەبوایە هەر دابنیشم و زیاتریش بێ تاقەت ببم، لەو کاتەی کە ژینی ناوەوەم شێوەی خەیاڵی زیاتری بەخۆیەوە دەبینی، من پێم وایە هیچ مرۆڤێك لەو کەسە نائاساییتر نییە کە دانیشتووەو چاوەڕێی خۆشەویستەکەی دەکات. سێ کاتژمێر تێپەڕین ئۆرسۆلا نەهات، بۆ من دیوانەییەکی پڕ ئازار بوو، کە ڕەنگبێ قەت لێی چاك نەبمەوە ئەگەر بێت و ئۆرسۆلا نەیەت.

بەلاّم ئەو هات، ئەوەندە نازك و باوقارو خڕوپڕ بوو دەتگوت گڕی ئاگرە. پەنجەکانم ئەو جگەرەیان وردوخاش کرد کە هەڵیان گرتبوو، لایە سووتاوەکەشی کەوتە ناو لەپم، بەلاّم مێشکم گوێی لە هاواری ئەو ناو لەپەم نەبوو کە دەسووتا، چاوەکانم بەهۆی تەماشاکردنیانەوە هاوارەکەیان خنکاند، هەر تەماشاو هەر تەماشا، تەماشای بەدلە قاوەییەکەی، پێلاوە ڕەحەتەکەی، زەردەخەنە زوو چووەکەی، هەگبە قاوەییە بچکۆڵەکەی بە پیتە زیوینییەکانی US و ئەو دەستەی کە هەڵیگرتووە، کە هەر بۆ ئەوە دەست دەدات کە دەست لەملانێی پیاوێکی پێ بکا.

– داخم ناچیّ، به شەمەندەفەرێکی هەڵە هاتم.

ئۆرسۆلا پەڵپی گرت، بەڵام سەرەڕای ئەمە، دەستیم ماچکردو مێزەکەم بۆ پێش پاڵدا بۆ ئەوەی بتوانیّ بێتە تەنیشتمەوە.

– ئازیزەکەم.

– لاوەکەم، پێشەکی بنێرە هەندێك خواردن بۆ خۆشەویستەکەت بیّ، نا، نا، پیاوی چاك بە، شتێکی خۆشم بۆ بانگ کە لەگەڵ شووشەیەك ئارەق، ئنجا پێت دەڵێم کە دوایی دەبیّ چی بکەین.

ناردم مریشکی بە بیبەری بۆ هات و لە لیستی ئارەقیش ژمارەیەکم دەستنیشان کرد، من تا ئەو کاتەش هەر پەشۆکاوو نائاسوودە بووم بەڵام ئەوەندە زەین ئامادەییم هەبوو کە بتوانم پەیڤەکانم بۆ ماوەی چارەکە سەعاتی داهاتوو لە وشەی (ئازیزەکەم)دا کۆبکەمەوە. دانپیانانێکی ڕاستگۆیانە بوو بەوەی کە لە مێشکدا تەواو دروست نیم، تەنیا هەر ئەم جۆرە دان پیانانەش دڵی خۆش دەکردو لەلای پەسند بوو.

لەماوەی یەك کاتژمێردا، دەچین بۆ هۆشفیلزن.

من ئەو جێگایەم زۆر پیّ خۆشە، کاتێکیش کە بروسکەت بۆ لێدام و پێت ڕاگەیاندم کە مۆڵەتت وەرگرتووە و دەتەویّ بێیی و، کە مۆڵەتەکەشت، پێنج ڕۆژە من بیرم بۆ ئەوەچوو کە ئەمە ئەو جێیەیە کە بۆی دەچین، تۆ حەز لە شاخ و داخ دەکەی، وانییە ؟

– ئازیزەکەم.

– تۆ بەتەواوی دژواری. دەبیّ ئارەقێکی زۆر بخۆیەوە، دەبیّ دووبارە ئاساییت بکەینەوە. من نامەویّ لەگەڵ گەمژەیەکدا سەفەر بکەم نەك لەبەرئەوەی من خۆم لە مێشکدا تەواوم. من خۆم دووچاری چی کرد ؟

پەرداخەکەی خۆم هەڵمژی و ئنجا هی ئەو و هی خۆشم پڕ کردەوە. خواردنی خۆم دەست لێ نەدا، بەڵام ئەو، مریشك و ساسی بیبەر و برنج و نانی راماڵی و دەستی بەچەنەبازی کرد و چالاکییەکی زۆری دڵنەواییکەری نواند. من کەمێك لەوە نائومێد بووم کە پێی نەگوتم دەبێ بخۆی، چونکە ئەو هەمیشە ڕاهاتبوو کەوام پێ بڵێ. هەمیشە وا ڕاهاتبوو بڵێ تۆ زۆر لاوازی و دەبێ چاك بخۆی. بەڵام ئەمجارەیان وای نەگوت. شتێك لەم کچەدا گۆڕاوە. بەڵام من دڵنیا نەبووم لەوەی کە ئەو ئەوەندەی من تووڕە نییە، لەوەی کە ئێمە لەوێدا دانەنیشتبووین تاکو لە دەوروبەری دەرەوەی یەکتردا بگەڕێین، دوور لە یەکترییەوە.

وەڵامم دایەوە : " تۆ خۆت دووچاری مانگی هەنگوینی کرد، مانگە هەنگوینی خۆمان".

ئۆرسۆلا پێکەنی، پاشان بۆ ماوەیەك دانیشت و بە برۆ گرژەکانییەوە بیری لە داهاتووی دەکردەوە، لەناکاو دەستی گرتم و بەتوندی بە ڕوومەتییەوە نا، بەم جۆرە دانیشتین بەناو ڕستورانەکەدا تەماشای دەرەوەمان دەکرد.

ئۆرسولا گوتی " من هیچ لەم بارەیەوە نازانم، هیچی لێ نازانم. بەڵام چونکە تۆ تەنیا پێنج ڕۆژت هەیەو، چونکە لەوانەیە قەت ....... بۆیە دەتوانی بە ئارەزووت بگەی، دەتوانی، تۆ دڵخۆشی ؟

ئەم قسانە بەتەواوی سەرسامیان کردم، وایان لێکردم شێتانە بەهیواییێکی گەورەوە تەماشای بکەم، بەڵام خۆی ئەو جۆرە هیوا گەورەیەیان پێنەدام، ئەو تەنیا هەر دەیلاواندمەوە، چونکە دەیویست لەگەڵمدا بەبەزەیی بێت.

پێم گوت " ئارەزووی من نییە کە دەمەوێت، بەڵکو هی تۆیە ...... تۆ دەتوانیت ئارەزووی خۆت بەدی بهێنیت. بچین بۆ ئەو شەمەندەفەرە ؟ "

لەو کاتەی بەناو گۆڕەپانەکەدا دەڕۆیشتین، دووبارە دەستی گرتمەوە، وەستاو تەماشای کردم.

- بگەڕێوە بڕۆ شوشەیەك کۆنیاك بکڕە.

کە کاپتنی ستافەکە ئێمەی بەیەکەوە لەناو واگۆنەکەدا دیت، ژنێکی ڕێك و پێك، شوشەیەك کۆنیاك و سەربازێکی شڕی سەر بەبەتاڵیۆنێکی سزادراو یەکسەر لەسەر پاشنەکانی وەرچەرخاو دوای ماوەیەکی کەم پۆلیسی سەربازیی دەرکەوتن. لەو کاتەی من بەڵگەنامەکانم پێشکەش کردو بلیتە ئیزافییەکەی پلە دووی خۆمم پیشاندا، ئۆرسۆلا بەبێزارییەکی بێدەنگی توندەوە وەڵامی چاو تێبڕینەکانی دەدانەوە. شتێکی چاك بوو کە هیچی نەدرکاند. کاپتنەکە لە لینز دابەزی، سەفەرەکەی خۆش نەبوو، چونکە تەنیا بۆ چرکەیەکیش نیگای ئۆرسۆلا وازی لێنەهێنا. دوو کەسە مەدەنییەکەش لە سیتزتاڵ دابەزین، بەم جۆرە واگۆنەکە بەتەنیا بۆ ئێمە مایەوە. هاوڕێ لەگەڵ سەرسامیمەوە ماچێکی دوورو درێژو بەردەوامی وای دامێ کە هەناسە بڕکێی پێوەنووسا.

بەدەم هەناسە بڕکێوە و لەو کاتەی لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی دەکرد گوتی " هەرچی گەرەکتە دەتوانیت بەدەستی بخەیت ". ڕووی لە من کرد، تا ئەو کاتەش چاوەکانی تووڕە بوون " ئەوەی تۆ ڕێت پێدەدرێت سنووردارە، ئەگەر دەشتەوێت، بۆت هەیە ئێستا وەدەستی بخەیت ".

شتێکی باش بوو کە بتوانیت پێ بکەنیت، بەتەواویی پێ بکەنە. " گوێ مەدە قسەکانیان. ئێمە گوێیان پێ نادەین. ئەوان بچکۆڵە و نامەردن. هەندێ جار

پیاو بەسەر یەکێکیاندا ڕەت دەبێت، پاشان پێڵاوەکانی باش دەسڕێتەوە و دەڕوات. پێڵاوەکانت خاوێن بکەوە کچۆڵەکەم، ئێمە نیازمانە بڕۆین ".
شوشەکەم کردەوە.
- دەکرێ بخۆینەوە تا پێڵاوەکانمان خاوێن ببنەوە ؟
لەدەرەوە چیایەکان لەبەردەم پەنجەرەدا ڕێچکەیان بەست بوو، هاوڕێ لەگەڵ باران و ستوونەکانی تەلەگراف و زەردەی خۆرەتاودا. لە پاشان تاریکی داهات، دەرەوەی داگرت و لەوێ مایەوە ئێمەی وا لێکرد کە پێکەوە بین. کە بێداریش بووینەوە، کات سێی بەیانی بوو، کە دەبووایە کاتژمێر دوانزەو چارەکێك لە هۆشفیلزن دابەزیبایینایە.
بڵند گۆی گۆڕەپانی وێستگەکە بە هاواری, ئنسبورگ، ئنسبورگ، ئنسبورگ بێداری کردینەوە.
خۆمان گلۆرکردە دەرەوە، خەواڵوو، کاتێکیش کە ئۆرسۆلا چوو بۆ خۆڕێکخستن من تەلەفۆنم بۆ ئوتێلەکان کرد.
کە یەکتریمان دیتەوە پرسی، ژوورت بەدەست کەوت ؟
وەڵامم دایەوە, ئوتێلی جاگەرهۆف.
- زەحمەت بوو ؟ ئێستاکە سەرمامە.
تەلەفۆنم بۆ بیست و سێ ئوتێلی جیاجیا کرد، بەڵام پێم گوت کارەکە ئاسان بوو، دەنگە پیاوانە ئاوازدارەکەی منیان ڕەت نەکردەوە. هۆڵی گەورەی ئێستگەکە چۆڵ و هۆڵ و لە نیوە تاریکیدا بوو. یەکێك لەلایەکدا تەقە تەقی لە پەقرەجێکەوە دەهێنا، لە نزیکیشەوە، کابرایەك بە گەسکێکی پانی نەرمەوە بەشێوەیەکی ڕێك و پێك ئاردە تەختەی چەوری لەسەر کاشییە ڕەنگ خورماییەکان ڕادەماڵی.
ئۆرسۆلا گوتی : " کەواتە ئێمە لە ئنسبۆرگ بەسەر دەبەین. تۆ پەشیمانیت ؟ "

- نەخێر، لێرەش شاخ و داخ هەن. با جانتاکەت هەڵگرم.
ئەو گۆڕەپانەی بەردەم ئێستگەکەش چۆڵ بوو. باران باری بوو بایەکەشی سارد بوو. ئێستا چی بکەین ؟ ئوتێلی جاگەرهۆف لە کوێیە ؟ .
گوتم، تۆزێك چاوەڕێ بە، گەڕامەوە وێستگەکە بۆ ئەوەی کەسێك ڕێم نیشان بدات یان تەلەفۆن بۆ تاکسیەك بکەم، گیانلەبەرێك لەوێ نەبوو، بەلاّم لە تەنیشت کوشکی ڕۆژنامە فرۆشتنەوە تەلەفۆن هەبوو، خەریك بووم دەرگا بکەمەوە.
- یەك تۆز !
دەسکی دەرگاکەم بەرداو وەرسوڕامەوە، دەرگاکە بە جیڕەوە لەسەر خۆ داخرا.
- دووام بکەوە.
ئۆفیسی سەربازیی زۆر ڕووناك بوو، دەستم بە ئارەقە کردن کرد، ڕووناکییەکە زۆر سپیش بوو تا ئێستاش ڕووناکی سپی ئارەقەم پێدەکات.
دەرەجەداری بەرپرس بە هێمای پرسەوە تەماشای ئەو دوو کەسەی کرد کە منیان بردە ژوورەوە، پاشان تێم ڕاما.
گوتی : " چی بووە ؟ "
هەردوو کەسەکە بە ئاگادارییەوە قیت ڕاوەستان " لە هۆڵەکەدا تووشی ئەم کابرایە بووین " .
کابرای تر سەیرێکی منی کردەوە. " بەم کاتەی شەو لەوێ چیت دەکرد ؟ "
بە ئاگادارییەوە وەستام " ویستم، تەلەفۆن بۆ تاکسیەك بکەم، من و خێزانەکەم بە ئێکس پرێسی شەو لە ڤییەنناوە هاتووین تا مۆڵەتەکەم لێرە بەسەر ببەم، فەرموو بەڵگەنامەکانم " .
تەماشاییێکی کردن " مۆڵەت بۆ سەربازێکی خەتابار، ئەمە شتێکی سەیرە " .

تەماشای یەکتریمان کرد، لە شوێنێکی ژوورەکەدا مێشێك گزەی دەهات، گزەو هەر گزە، لەو کاتەی کە بەناو ژوورەکەدا دەخولایەوە.

- کوا ژنەکەت ؟

- لە دەرەوە وەستاوە لەلای دەروازەی سەرەکییەوە.

تەماشای یەك لە دوو کەسەکەی کرد " بیهێنە "

گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی پیاوەکەی دەرەوە گرت، چاویشم لە مێشەکە بڕی، دەرەجەدارەکە لەناو کورسییەکەیدا هاتە هەژان. دەرگایەکی لاوەکی کرایەوە و سەرێکی خەواڵووی لێدەرکەوت. سەعات چەندە ؟

- سێ و نیو ؟

سەرەکە کشایەوە.

- جارێ با بلیتەکەت ببینم.

ئەم داواکارییە ڕای چڵەکاندم. دەکرێ پێی بڵێم فڕێم دا ؟ ئنجا ڕەنگبێ بپرسێت ئایا بلیتی گەڕانەوەم نییە بۆ ڤییەننا، هەروا لەوانەیە داوای بلیتەکەی ئۆرسوڵا بکات. لێ دەرچوونی بۆ نییە.

- ئەم بلیتە هەر تا هۆشفلزنە. چۆن ئەمەم بۆ ڕووندەکەیەوە ؟

- هەردووکمان کەوتینە خەو و، هەر لێرە لە ئینسبورگ بەئاگا هاتینەوە.

- مەبەستتە بڵێی لە هۆشفلزنەوە تا ئێرە هاتوون بێ ئەوەی پارە بدەن ؟

- بەڵێ، کاتمان بە دەستەوە نەبوو بۆ پارە دان. زۆر بەپەلە لە شەمەندەفەرەکە دەرچووین، بەڵام شتێکی ئاساییە، بەخۆشییەوە پارە زیادەکە دەدەم.

وەڵامی نەدایەوە، زەنگی تەلەفۆنەکەی لێیدا. دەنگوەرگرەکەی هەڵگرت. " ئێرە وێستگەی پۆلیسە، کێیە ؟ تۆزێ بوەستە. " پەنجەی بەسەر لیستێکدا هێنا کە بەتەنیشتییەوە لەسەر دیوارەکە هەڵواسرابوو. " نەخێر، وەرمان نەگرتووە ...... دەبێ هەڵەیەك هەبێت ..... بەڵێ، هەمان ئاژاوەیە. ئەوان

هەمیشە لەوێ شتەکانیان بێ سەروبەرە ..... بەخۆشییەوە دووبارە سەیرێکی دەکەمەوە، بەڵام نابێ هیچ شتێکی لێ ئاشکرا بکەیت.

ئۆرسۆلا هاتە ژوور. تەماشای منی کرد، دەترسا، کەوتینە چاوەڕێ کردن. مێشەکە گزەی هات. بەتالیۆنی سزادراو – بەتالیۆنی سزادراو. خەتابار، خەتاباریی، خەتابار، کابرای لای مێزەکە لە تەلەفۆندا پێکەنی و دەنگوەرگرەکەی داناوە.

کە چاوی پێمان کەوت داوای بەڵگەنامەکانی ئۆرسۆلای کرد، ئێمەش پێمان لێنا کە ژن و مێرد نین. ئۆرسۆلا گوتی : " تا ئێستا نا، نەك تا بەیانی. " لەناکاو ئۆرسۆلا دانی بەخۆیدا گرت. گوتی : " ئێستاکە گوێ بگرە، وازمان لێ بێنە بڕۆین. هەموو شتەکە برییتیە لە هەڵەیەکی بێ بەختانە و ئەگەر لەخەودا نەمابایینەوە، ئەوا لەو شوێنەی مەبەستمان بوو، دادەبەزین و هیچیش لەو شتانە ڕوویان نەدەدا. تۆ خۆت دەزانی چەند زەحمەتە بۆ پیاوێك لە بەتالیۆنێکی سزادراو بێ و مۆڵەتی پێ بدرێ. مێردەکەم مۆڵەتی وەرگرتووە. هیچ شتێکی هەڵەشی نەکردووە. هەڵەکە هی من بوو کە کەوتینە خەو. تێگەیشتی، ئێمە ماوەیەکی زۆر درێژ بوو یەکتریمان نەدیبوو، منیش ویستم بیکەم بەچاوپێکەوتنێکی خۆش، ویستم بەڕاستی هەموو شتێکی بۆ خۆش بکەم. پاشان شتێکمان خواردەوە. شووشە کۆنیاکەکەی کەمێك درێژ کردو – خەتای منیش بوو وام کرد بیخواتەوە و هەروەها ..... بکاو ..... بکا. "

– بەڵێ.

ئۆرسۆلا کچێکی شکۆدار بوو، لە تووڕەییاندا سووڕ هەڵگەڕابوو، چاوەکانی ئاگریان لێ دەباری، بروسکەیان دەکرد. یەکسەر دەچووە دڵی پیاوەوەو وەکو ئەو ژنانەی کە بێ بەش بوون لە بنەما ڕەوشتییەکان.

– دەبینی، فارگۆنمان بۆ خۆمان گرتووە، دەمێکیشە من ئەوم نەدیوە، ئەویش وەك سەربازێکی چاك ڕەفتاری کردووە.
ئــەم تێبینییــەی دوایــی جوولەیــەکی بلیمەتانــە بــوو. کــابرای ســەرمێزەکە بەڵگەنامەکانی پێ دایەوە. " دەتوانن بڕۆن ". پاشان ڕووی لە من کرد.
– بەردەوام بە لەسەر ڕەفتارت وەك سەربازێکی باش.
کە دەرگاکـەمان لـە دوای خۆمـان داخـست، پیاوەکـان لـە ژوورەوە دەسـتیان بـە قاقای پێکەنین کرد.
ئۆرسـۆلا پـاڵــی پێوەنــام و بــە نیمــچە ڕاکردنێکــەوە بــە گوێــچکەڵەکانیدا چـرپـانـدم، بـا دوور کەوینەوە " من دەترسم ".
کە هاتینەوە ناو گۆڕەپانە چۆڵە بە باران تەڕبووەکە، تەماشام کرد دەم و چاوی سپی هەڵگەڕابوو، نێوچاوانی لـەژێر پرچە ڕەشەکەیدا بە دڵۆپـە ئارەقـە داپۆشرابوو. ناڵاندی " وابزانم خەریکە لەخۆ دەچم " .
ئــا لەوێــدا وەســـتام، شووشــەیەك بەدەســـتێکمەوە و جانتایــەکیش بەدەستەکەی تـرو ئۆرسـۆلاش لـە باوەشـم. بـەخێرایی جانتایەکـەم دانـاو ئـەوم هـەڵگرت تـا بـڕۆم لەسـەر یـەك لـە پێپیلکـەکان دام نـا. پـێم گـوت " سـەرت بەناو چۆکەکانتدا شۆڕکەوە جووڵە مەکە، بەماوەیەکی کەم بەسەر دەچێ " .
کە هاتەوە هۆش خۆی، گوتی، ئێستا باشم. ئەرێ تۆ زۆر تووڕەی ؟
– لەبەرچی ؟
– لەبەر ئەو جۆرە لە هۆش خۆ چوونەم ؟ من ئەوەندە بە کەڵك نایەم.
– من ئەوەم پێخۆشە ! ئەگەر تۆ هەڵوێستەکەت بەسەر نەبردبایە، قـەت نـەت دەزانی لەوانەیە چۆن پەرەبسێنێ. هەر چۆنێك بێت ئـەو ماوەیـەی ئـەوان لـە ئیفادەکـەی منیـان پێـچایەوەو هـەموو لایـەنێکیان لێك دایـەوە، مـن تـا دەمـە دەمــی بــەیانی لێــی دەربــاز نــەدەبووم. ئــەم جــۆرە شــتە کــاتێکی ترسـناك

دەخایەنێ و، پیاو ناتوانێ لە ماوەی یەك چارەكە سەعاتدا نداییکی تەلەفۆنی بۆ بۆخارست بەدەست بێنێ، من دەتوانم دڵنیات کەم. وا بزانم تۆ شکۆدارو ئازا بوویت .... دەبێ زۆر خراپ ماندوو بوو بیت. پێویستە هەوڵبدەم تاکسییەك بێنم.

– نا، نا، ئێمە نابێ هیچی تر یەكدی بەجێ بهێڵین، من لەگەڵت دێم. ئەگەر من تەنیا دوو دەقیقەی تر دانیشم، ئەوا ئەو کاتە پێکەوە دەڕۆین و بەدوای تاکسییەکدا دەگەڕێین ...

بۆیە بۆ ماوەیەك دانیشتین، ئۆرسوڵا بەخۆ وێك هێنانەوە خۆی لە من نزیك کردەوە. پاشان لەرزێکی هێنایە خۆی. " سەرمامە ".

– وەرە. با بڕۆین.

عارەبانەیەکمان دەست کەوت لەوانەی ئەسپ ڕای دەکێشێت و بەرەو ئوتێل ملمان نا. ئوتێلەکە گەورەو سپی و هێمن بوو، دەرگای باڵکۆنەکانی کراوە بوون و ڕێڕەوێکی بە چەو داپۆشراوی هەبوو کە وای کرد لە ناکاو ئەسپەکە لەسەرخۆ بڕوات. کاتێك من ناوی ئۆرسوڵام نووسی دەرگەوانە پیرەکە لە تۆمارگەکەی سرپیەوەو بە ئاوازێکی دۆستانە پێی گوتم پێویست ناکات ناوی خێزانەکەت پێش شووکردنی بنووسیت. بە زەردەخەنەوە وتی " بزانە تەنیا هەر وتەی " لەگەڵ ژنەکەی " دادەنێین " ئەمە بەسە ". ئەوەندەی گوڵی نیسان سووڕ هەڵگەڕام تەنانەت هەستمان کرد کرێکاری نەفەر سەرخەرەکەش گرژییەوە و من لەو کاتە بە توندیی بیرم لە داهاتووم دەکردەوە، لەو کاتەی ژنە بەردەستەکە نوێنەکانی ڕادەخست، ئۆرسوڵا چووە دەر بۆ سەر باڵکۆنەکە و منیش دەنگم دا و گوتم " حم " ئنجا چوومە ناو گەرماوەکەوە، دوای کەمێك بەتەنیا لە ناوەڕاستی ژوورەکە وەستابووین، تەماشای یەکتریمان دەکرد.

- کەواتە، با بفەرمووین ! جگەرە ؟ "

گەمەکە دەستی پێکردو، دەستەکانی بەسووکی کەوتنە لەرزین.

بەشێوەیەکی ترسناك شێوا بووین. وشکە هەوای ناو ژوورە نامۆیەکەی ئوتێل، کە هەموو شتێك تیایدا خاوێن و نائاسایی بوو. ورووژانە سۆزییەکە، ئایا هەموو شتەکە بریتی بوو لە وروژانێکی سۆزیی ؟. ماندووبوونەکە، هەستم بە شەکەتیی و چوار پەل قورسییەکی وەکو هی پاش مانۆری سەربازیی کرد، ئەویش لەوێدا وەستابوو بەشانی شۆڕبووەوە و چاوی قاوەییەوە. هیچ چاوێکیش ئەوەندە لە ڕادەبەدەر خەمبار و ماندوو نین بەقەدەر چاوی قاوەیی، هیچ کامێکمان نەی دەزانی بەلایەنی کەمەوە چی لەوی تردا پێشبینی دەکات، یان وا بیری دەکردەوە کە ئەوی تریان پێشبینی دەکات، ئایا ئێمە دەتوانین، دەمانەوێ بیکەین، یان دەبێت ئێمە هەردووکمان بەشێوەیەکی هەست پێکراو خۆمان ماندوو بکەین بۆ ئەوەی یەکتری ڕازی بکەین بێ ئەوەی بزانین شتە ڕاستەکە کامەیە بۆ ئەوەی بیکەین ؟ یان بەهەڵە بیکەین ؟ گرژبوونی ماسوولکە نادروستەکان و ئنجا لە دواییدا هێنانە گۆی پێویستییە بەرگرکرەکە، ئەشکەنجەدراو بەهۆی ماندوویەتیی و هزرکردنەوە ؟

- ئێستاکە دەچمە سەر باڵکۆنەکە و جگەرەکەم تەواو دەکەم تا تۆ خۆت ڕووت دەکەیتەوە.

ئەمە شتێکی زۆر بەد بوو. هەتا زاتی ئەوەشم نەکرد بڵێم " نوێن ".

ئەرێ شتێك هەیە ئەوەندەی شەو ئارام بێت ؟چیایەکان لە تاریکیدا چەند شتێکی گەورەو مەزن بوون، چاوەڕێی ڕۆژیان دەکرد بۆ ئەوەی ئەوە پیشان بدەن کە لە چی دەکەن. چیای گەورە، چیای مەزن، سبەی دەتبینم، ئۆرسۆلاش

دەتبینیٚ، بۆ بەیانی ئێمە تێر خەو دەبین، نانی بەیانیشت لەگەڵدا دەخۆین و، قسەش لە بارەی سەردانی کردنت دەکەین، ئەمشەو تاریکەو، هیچیشت نییە پیشانمانی بدەیت.

– ئێستا دەتوانیت بێیت.

لە ژووری گەرماوەکەدا پەرداخێك تا نیوەی کۆنیاکی تێدا بوو. ئەوی تریان بەتاڵ بوو، بەڵام بەبۆن زانیم کۆنیاکی تێدا بووە. شووشەکە بەتاڵ بوو، پڕم دایە پەرداخەکە.

ئەگەر بڵێم ئێمە زۆر ماندووین، لەوانەیە بیری بۆ ئەوە بچێت کە من بوومەتە مرۆڤێکی هەستیار، لەبەر ئەوە ئەویش دەڵێ، بەڵێ، جا دەکەوینە بارودۆخێکی وەستاوەوە و هەردووکیشمان وامان لێدێت لەوە بترسین کە کامەمان یەکەم کەس دەبین بکەوینە خەو. هەروەها لەوانەشە ئۆرسوڵا کەمێك نائومێد بێت، هەتا ئەگەر بە هۆی ماندووبوونیشەوە بمرێت، یان ئەگەر من بڵێم ...... .

لە ڕاستیدا شتێکی ئاسان نییە لە بابەت جۆری شتەکەوە بزانیت، ئەو گا مرۆڤانە و ئەو ئەسپە خەسێنراوانەی ناو ڕۆمانە ئەمریکییە دڵڕەقەکانەوە، پاڵەوانە سێکسییە هەستیارەکانی هەمەنگوایی خۆیان و دڵە پڕەکانیان ..... ئا لەو ساتە یەکلاکەرەوەدا من حەسوودیم پیٚ دەبردن، بەڵام نا، هیچ ساتێك لە پێش مردن یەکلاکەرەوە نییە.

بەدەنگێکی بەرزەوە هاوارم کرد : " فەرموو پێڵاوەکان پاك بکەوە " ئنجا پەرداخەکەم هەڵلووشی لە ژوورەوە، بەدەنگێکی ناسکەوە ئۆرسوڵا گوتی: " تۆ

خۆشـی ". سـەریم خـستە سـەر شـانەکانم و ئنجـا لێفەکـەم ڕاکێـشایە سـەر مەمکەکانی، گوتم :

– بـەیانی دەبمـە یـەك لـە بەسـۆزترین پاڵەوانـە سێکـسییەکانی هەمـەنگوای، چیایەکە داوای لێکردم پێت بڵێم بەیانی هەموو شتێکی خۆیمان پیشان دەدات کە هەیەتی. ئێستاش، توخو ، دەمەوێت بنووم.

بەپێکەنینەوە گوتی : " تۆ خۆشی ".

من زۆر چاك لەمەیان دەرباز بووم.

دوای کەمێك هەڵیدایێ و گوتی : " سوپاس، خۆشەویستەکەم ".

ئۆرسۆلا سەری خستەسەر بالیفەکەی خۆی، باسکی چەپەمی نوشتاندەوە و باسکە ڕاستەی خۆی تێهەڵکێشا، بەم جۆرە کەوتینە خەو. خەوێکی، قورسی، چـاکی، کۆنیاکانـەمان لێکـەوت، پـاش چـەند سـەعاتێك لـە یـەك کاتـدا بـەئاگا هاتینەوە، لە هەمان شوێنیشدا، چیایەکەش هەموو شتێکی نیشان داین، ئێمە هەردووکمان پێکەوە سەر چیایەکە کەوتین و لە پاشان لە سەری حەساینەوە.

تۆ تەنانەت دەبێ هەر لەسەری بخەویت.

" تۆم خۆش دەوێ، بەهەموو دڵمەوە خۆشم دەوێی ".

فرمێسکی ڕوون و گەورە لەسەر برژانگە درێژەکانیدا دەدرەوشانەوە و بەسەر کوڵمەکانیدا دەهاتنە خوارێ. چاوەکانی بە داخراوی هێشتنەوە.

# ڕۆژانی دوایی

خۆری بەیانی لە دەرگا کراوەکەی باڵکۆنەکەدا بەسەرماندا هەڵات. هەر یەکەمان لەسەر کورسییەك دانیشت و دەستمان بەخواردنی نانی بەیانی کرد کە کارەکەرەکە بۆی هێنایین. ئۆرسوڵا پارچە نانێکی باشی بە ڕۆنەکەرە چەور کراوی هەڵگرت :

– دەبێ شتێکی زیاتر بخۆی.

– گوتم : " ناتوانم ئەوەندە زۆر بخۆم، من دەمێکە لەوە ڕاهاتووم کە زۆر نەخۆم. ئەمە بۆیە ".

– پێویستە لە خووە خراپەکانت دوورکەوییەوە. زۆر کەمت خوارد. کوڕە بۆ خاتری خوا ئەتۆ هەر پیست و هێسکی.

تەماشاییێکی خۆمم کرد. ڕاستی دەکرد. باسکەکانم ئەوەندە باریك بوون بەجۆرێك دەمتوانی بەقەفەی دەست بیانپێوم. بۆ خاتری خوا، چی لە کابراییێکی وەکو من دەویێ ؟ ئەو، ژنێکی پۆشاك چاکی، چاپوکی تێك چەقیوی باوقار. پاشەڵ گەورەی بەهێزو چاك تێکسمراو. ببووە سەنتەری لاوانی خۆربردوو، گۆشتنی تازە پێگرتوو، کوڕانی پرچ درێژ و کچانی دەم بەپێکەنین بەردەوام دەهاتنە ژوورەوە و داوای شتێکیان دەکرد بۆ خواردن و ئنجا دەچوونە دەر. دەبوایە پیاوێکی زەبەلاحی، درێژ ئێواریێ بێتەوە ماڵ، ورچە پیاوێك، پیاوێکی مەزن. نەك من.

– بخۆ، دامەنیشە پەرۆش بۆ خۆت بخۆی. تۆ وا بەم جۆرەت زۆر باشی. کە لێبووینەوە چاوەڕێی شتی زۆرت لێ دەکەم. شتی زۆر. بەڵام دەبێ لەپێشا بخۆی. دەبێ دوو هێلکە بخۆی و ئەو کاتە دەبیە ڕۆژهەڵاتییەکی ترسناك.

بەلاسارییەوە گوتم : " تۆ ناتوانی وام لێ بکەی " نانەکە لەناو دەمم ئەوەندە وشك بوو، هەر ئەوەتا دەهات و دەچوو.

- تۆ ناتوانی چی ؟

- ئا لەوێدا بەسەرساردیی و هێمنییەوە دانیشە، بخۆو چاوەڕێی داهاتوو بکە.

- تــۆ تــەنیا هــەر بوەســتە و چــاوەڕێی داهــاتوو بکــە. ئێــستاکە بخــۆ، خۆشەویستەکەم.

فەرموو پەرداخێك شیر بخۆوە، ڕەنگە تینووت بێت. ئەگەر بێت و من خۆم لەتۆدا بئاخنم، ئەوا تۆ دەربازت نابیٚ تا پف دەدرێی. نابیٚ ئەوەش لەبیر بکەی کە من دکتـۆرم و مـن وای دەبیـنم کـە تـۆ تووشـی دەردە ئینگلیـزی بـووی. تـۆ بەدەست کەمیی ڤیتـامین و گـەلێك کـەمیی تریـشەوە دەنـاڵێنی، تەنانـەت ئەگـەر ڕۆژهەلاتییەکی کارامەش بیت.

- من زۆر زۆر کارامەم.

- ئـەم هـەمووە لـەکویٚ فێـر بوویـت ؟ زۆر پیـاو هـەن تـەنیا هـەر تونـدو تیـژن و وادەزانن ئەمە کارامە بوونە.

- کـە تەلگرافەکـەی تـۆم وەرگـرت مـن مەشـقم لەسـەر نـۆ هـەزار ژنـدا کردبـوو، دەهۆڵ ژەنێکی تورکیش تایبەت لە (کونستانزا) بانگ هێشت کرابوو.

ئۆرسـۆلا بـە ئاواتەکـەی گەیـشت، مـن هـەموو شتێکم خـوارد و هەرچـی پێیـدام خواردمـەوە، ئنجا من و ئـەو زۆر زۆر کارامـە بووین. وریٚنەکردنـە ئەگـەر بڵێین تـەنیا پیـاو (شـتەکەیان) دەوێـت، پیـاو هـەمان شتیان دەویٚ وەك ژنـان : ئەوان ئـەو شتەیان دەویٚ کە ڕەگ و ڕیشە و خـواردنی هـەموو ڕۆشنبیرییەکە : زانین.

دوای ئەمـە بـە چیایەکاندا ڕۆیـشتین یەکـسەر بـۆ دێرێکـی بـچکۆڵە، کـە قەشەیەکی سەرسپی بەتەواویی هەمووی پیشانداین. لەوێدا هەموو شتێکی ناو

چیایەکانمان دیت. لە شوێنێکدا چاومان بەمێگەلە بزنێك و گاوگۆلکێکی نیمچە ڕەنگاو ڕەنگ کەوت کە گاوانێکی جوانی ڕدێن پڕی کەوش ئەلپیی چاودێری دەکردن. دوای ئەمە، بۆ ماوەیەك دانیشتین و سەیری گوندێکی بچووکمان کرد لەخوار خۆمانەوە، بە کۆڵانە پێچاوپێچ و ڕەنگە زەقە منداڵانییەکانییەوە. جووتە کچێك گۆرانییان بۆ بۆڕژنی دڵخۆشکەری چێڵ و چواڵەکان دەگوت.

لە سەرووشەوە وەڵامێك هات : هالیدۆرۆ ! .. هالیدۆرۆ. داڵێکیش لە سەرەوە لە ئاسمان بوو، داڵێکی ڕاستەقینە، گیانلەبەرێکی زیندوو، نەك ئەو داڵە ئارمەی کە هەموو ئەورووپای لەناو چنگە خوێناوییەکەی خۆیدا گرتووە.

دیمەنێکی وا بە ئاشکرا ساکار و دڵخۆشکەر لەوانەیە بەرگەنەگر بێت. دیمەنەکە زۆر جوان، زۆر ڕوون بوو. لوتکە بەفراوییەکان زۆر هێمن بوون، لەگەڵ گیانی ناڕەحەتی مرۆڤدا نەدەگونجا. پیاو دەبێ یان هەستێت و بڕوات، یان لەناو هەرای بێ شوماری هەست ورووژانی بۆنداردا بخەوێ.

ساکارییەکە بەردەوام بوو. منێکی سەرباز، بە ساکاریی و سادەییەوە بارکرابووم و لە کاتێکدا دانیشتبووین و جەمە خواردنی باشی چیاییمان دەخوارد و ئارەقی (ڕاین)مان بە دۆلکەی بەردینی زەردی سووورباو نۆش دەکرد. منیش دەستەکانم لەناو ڕانەکانی شۆڕکردەوە، تا لەبەر ختوکە خۆی دوورخستەوە. جا لەناکاو ترس و بیم و پێشهاتی ناخۆش ڕایانگرتم : تەنیا دوو ڕۆژمان ماوە.

لەناکاو ئۆرسۆلا گوتی : " تێفکرە، جارێ دوو ڕۆژی تەواومان ماوە ".

ئابەم جۆرە ئەمەی گوت. لە هەمان کاتیشدا دەگریاو ئەوەندەی منیش خەمبار بوو. خاوەن میوانخانەکە گوتی : ((گروس گۆت = سلاو)) و بەکەسەرەوە سەیرێکی کردین کاتێ کە ڕۆیشتین. کە ماوەیەکی کورتمان بڕی ئۆرسۆلا وەرسوڕایەوە، دیتی کابرا هەر لەناو دەرگاکەدا وەستاوەو، بەکەسەرەوە خواحافیزیمان لێ دەکا.

ئۆرسۆلا گوتی : " پیاوێکی چەند ڕۆح سووك بوو ".

– وانەبوو.

ئۆرسۆلا باسکی منی خستەسەر شانییەوە. " کوڕە، تۆ تێناگەیت، کە ئەگەر بکەومە داوی خۆشەویستی تۆوە ئەوا جەهەننەمم بۆ دەکرێتەوە ".

– بەسەرسامییەوە گوتم " بکەوییە داوی خۆشەویستی منەوە ؟ " وام دەزانی کەوتوویتە داوییەوە "

– بەلام من هەمیشە پێم گوتوی کە نەکەوتوومە ناوییەوە " تۆ تەنیا ناتەوێ باوەڕ بکەی. بەلام ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە. من تەنیا نەمدەتوانی نەیەم. ئەتۆ ... ئەتۆ جۆرێکی کە ژنان لێی ڕانەهاتوون. نەك من، بەلای کەمەوە " چونکە لەوانەیە من بە تایبەتی ......

– تۆ، زۆر زۆر، ئەمەم گوت و دەستم شۆڕ کردەوە بۆ ئەوەی مەمکی بگرم، بەلام ئەو لایبرد و دووبارە خستییەوە سەر شانی.

ئۆرسۆلا گوتی : " نا، وا مەکە قسە لەم بارەیەوە بکەین، ئەم قسانە تەنیا وامان لێدەکەن کە بشێوێین، بەلام ...... من نازانم چی بلێم ".

گوتم : "من دەزانم، تۆ دەتەوێ بلێیت کە منت خۆش ناوێ. ئۆرسۆلا وا مەکە وشەی گەورە بەکار بهێنین، من دەزانم کە خۆم لەم بارەیەوە تاوانباربووم، بەلام بۆ ماوەیەکی درێژ تۆ منت وا لە خۆت دوورخستووەتەوە، بەلام ئێستا وا

نییە، لەبەرئەوە لە ڕاستیدا زەحمەتە کەسێك خۆی بەشێوەیەکی بابەتیی و ڕاستەوخۆ دەرببڕێت " .

– تۆ زۆر لاوازیت و بەتوندیش مامەڵەت لەگەڵدا کراوە. ئایا دەزانی لە خەودا دەگریت ؟ "

– بەڵێ دەزانم، بەڵام بەپێچەوانەوە من چاکم.

– لەوانەیە، بەڵام شتەکان بۆ من دۆزەخن.

لەناکاو ئۆرسۆلا بەتەواویی بووە دڕندە. خۆی کوتایە ناخی من و دەستی بە هەنسك کردن کرد.

" تۆ نابێ من بەجێ بهێڵیت، وا نییە ؟ هەنسکی هاتنێ. " ئەوان نابێ تۆ لە من جیا بکەنەوە، وایە ؟ "

گوتم " نا، نا: نا، نا " هەر پێم کرا ئەوەندە بڵێم، دەستم لە پشتی داو چرپاندم " نا، نا، من سەرم لەمانە لە هیچی دەرناچێت ".

ئەو ئێوارەیە، ئۆرسۆلا پۆشاکێکی سادەی پڕ بەپڕی لەشی کردە بەرخۆی لەگەڵ ملوانکەیەکی مۆرووی سەوزو ڕەش، کە زۆر گرانبەها بوو. من ئەوەم دەزانی کە بەدلە ڕەشەکەی سەر بەیەکەی تانك جۆرە جوانییەکی ترسناکی پێ بەخشیوم کە بەوە دیاربوو من هیچ (ئایرن کرۆس)، یان شریتێکی ترم نەبوو، تەنیا نیشانەی یەکە سەربازییەکەی خۆمم هەڵگرتبوو. ئەمەش جۆرە هەست بە شانازی کردنێکی پێ بەخشیم کاتێ دیتم خەڵکەکە تەماشامان دەکەن لەو کاتەی دەچووین بۆ سەر مێزەکەمان.

لە کاتێکدا نانمان دەخوارد، لێفتنانەك بە بەردەمماندا ڕەت بوو، خۆی لە مێزەکەمان خشاند، پارچە کاغەزێکی نوشتاوەی لەبەردەمی مندا خستە خوارەوە کە دەتگوت بە ڕێکەوت بوو، بە شڵەژاویی هەڵمگرتەوە و خوێندمەوە :

" ئەگەر بەبێ مۆڵەت لێرەی، خێراکە بڕۆ دەرەوە، پۆلیسی سەربازیی لە دەرگای تەنیشتمانن. ئەگەر پێویستیشت بە یارمەتی هەیە من لە هۆڵەکەدام ".

تەماشاییێکی ئۆرسوڵام کرد و ئەویش هەروا. هەردووکمان پێمان وابوو کە دەبێ من بچمە دەرێ سوپاسی بکەم بۆ ئەم ئاگادارکردنەوەیە و پێی بڵێم هەموو بەڵگەنامەکانم تەواون.

دیتم لە سوچێکی هۆڵەکەدا وەستاوە جگەرە دەکێشێ. دوای کورتە خۆ پێشکەشکردنێك، سوپاسیم کرد و گوتم : دەکرێ بپرسم هۆکاری ئەم دڵسۆزییەت چی بوو ؟

– تۆ لە یەکەی تانکدا سەربازی، برایەکەشم هەروا. تۆ ((هۆگۆ ستیك)) دەناسی ؟

پێم ڕاگەیاند کە ((ستیگ)) یەکێك بوو لە باشترین برادەرەکانم لە سرییەکەماندا.

لێفتنانت بەخۆشییەوە گوتی : ((ئەدی بۆ وا ناڵێی؟)) ئەمە، ئاهەنگێکی پێویستە. دەکرێ تۆ و دۆستەکەت. ئەم ئێوارەیە ببنە میوانم ؟ جێگایەکی خۆش پێدەزانم کە دوای خواردن دەتوانین بۆی بچین.

پێکەوە گەڕاینەوە لای ئۆرسوڵا. خۆی بەناوی (پاول ستیگ) لە یەکەی ئەندازیاریی، پێشکەش کرد. دوای، شەوێکی خۆش، لە دەرەوەی ئوتێلەکەمان یەکتریمان بەجێ هێشت و داوای کرد ئەگەر هەر شتێك ڕووی دا و پێویستی بە یارمەتی ئەو بوو، تەلەفۆنی بۆ بکەین.

لەسەرەوە، لە ژوورەکەماندا بە بێزارییەوە خۆمان کوتایە ناو کورسییەکانمان و بەبێ دەنگیی دوایین جگەرەمان کێشا. لە دەرەوەش تا دەهات ڕووناك دەبوو، بۆیە هەستام و پەردەکانی دەرگای بالکۆنەکەم لێکردنەوە. ڕادیۆکەم کردەوە.

ئاسایی لەو ساتانەدا مۆسیقای خۆش لێدەدرا، پرۆگرامێک بەناوی ((پرۆگرامی بەرەی جەنگ)) ئۆرکێسترا سمفۆنیاییێك، کە بێگومان فیلهارمۆنێکی بەرلین بوو، کەم کەم ڕێی بەرەو فەراهەم کردنی پێشەکی مۆسیقای لیزت گرتبووەبەر. هتیلەرو گۆبلز تەنانەت ئەم پارچە مۆسیقایە وروژێنە ڕۆمانسییەشیان تێکدابوو، کردبوویانە مۆسیقای پرۆگرام بۆ جەنگە نەفرەت بارەکەیان : ببووە شتێك کە وەك باك گراوندێك بەکاری دەهێنا بۆ فلیمە خەبەرییەکانی هێرشە ئاسمانییەکانی بە فرۆکەکانی (لۆفت وێف). هەر ئەو (لۆفت وێف)ە بوو کە ڕێگەی بۆ تانکەکانمان خۆش دەکرد، هەر (لۆفت وێف) بوو بەبێ موبالەغە گەرەکی جوولەکانی لەوارشۆ بەسێ شەو و سێ ڕۆژان وێرانکردو لەگەڵ زەویدا تەختی کرد. کاتێکیش کە هێمنیی گەڕایەوە و دووکەڵەکە ڕەوییەوە لەو گەڕەکە گەورە و پانەدا هیچ شتێك نەمابوو تەنیا پێنج پێ بەرزایی نەبێ. تەنیا چەند کەسێك لەو چەند سەد هەزار جوولەکەیە نەبێ کە بە زیندوویی بەناو گەمارۆی سەربازە دەم بە پێکەنینەکانی یەکە سەربازییەکانی (SS)دا ڕایان کردبوو. مشتێك جوولەکە و چەند ملیۆن مشکێك.

دەنگی مۆسیقای ڤیستیڤاڵی (لیزت) دەهات.

ئۆرسوڵا گوتی : ناکرێ بیکوژێنینەوە ؟ ئەم پارچە مۆسیقایە کار لە دەمارەکانم دەکا.

کوژاندمەوە و خۆم ڕووت کردەوە.

– چ ڕۆژێکی خۆش بوو، سەیرکە، هەر ئێستا ڕووناك دەبێ. عەیبە نووستن.

– وا بزانم نووستن خۆش دەبێ، بەهەر حاڵ بۆ چەند سەعاتێکیش بێ ئێمە چاك ماندوو بووین.

– پێویستە ژیان هەردەم وەکو ئێستا خۆش بێت. شت چەند زۆرن کە بەڕاستی پیاو پێیان دڵخۆش دەبێ! خۆراك خواردن کە برسی دەبێ. خواردنەوە و خواردنەوە و ئنجا کەمێك سەرگەرم و بەهەوەس ببی. چاوت بکەیتەوە و ئنجا تەواو ئاگادار بی، چونکە ڕۆژێکی تەواوکراوەی پڕ لە سروەی خۆش چاوەڕێت دەکا. بەشێوازێکی ڕاستەقینە ماندوو ببی. من بەشێوازێکی ڕاست ماندوو بوویم. هەر لەو ساتەدا داوای هیچ ناکەم.

ئنجا داکەندنی ملوانکەکەی، پاشان تاکە پێڵاوەکەی، ئنجا کردنەوەی زنجیرەکەی، بەڵێ زنجیرەکەی، ئای ... زنجیرەکە ... لەوێ.

– دەستەکانت چەند هێمنن. زۆر شت دەزانن. کەی تاکە پێڵاوەکەی تر دابکەنم ؟ نا، ئێستا ئەوانە نا ! ئەوانە دوایی.

– نەخێر، ئەوانە ئێستا.

– تاکە پێڵاوەکەشم لابرد.

– ئاگادار بە تۆڕەکە لەسەر نینۆکت جێگیر نەبووە، دوایین جووتی جوانە کە هەمە. ئاه، ئەدی نەتگوت بەتەمای نووستنین.

هیچ وەڵامم نەداوە. من بووکە شووشەی خۆمم هەیە گەمەی لەگەڵ دەکەم. بووکە شووشەیەکیشم پێدا بۆ ئەوەی گەمەی پێ بکا. بۆیە هەردووکمان بێ دەنگ بووین، ئارامییەکی هێمن و قورسمان وەدەست هێنا، ئەو لەسەرخۆییە بێ ڕادەیەی کە هەورەکان پێی کەڵەکە دەبن، گەورە، لەئاسمانێکدا کە گەورەییەکەی تێرایی هەموو جۆرە بروسکەیەك، گرمەیەك، ڕمبەیەك دەکات و ناکاوە بارانی پێش تۆفانیش بەسەر سەردا دێتە خوار.

پیاو چاوەڕێی ئەو هەموو شتە زیادانە دەکات و، چونکە زیادن بۆیە پیاو نائارام، بێ قەرار، توند، پێداگر دەبێ و لەو میانەدا هەورەکان بۆناو سەرتدا

دەڕەونەوە و تێدەپەڕن و تۆ تەنیا هەر بەشێوەیەکی ترسناک تووشی شڵەژان دەبی.

بەڵام کاتێک شتەکە شتێک بێت زیاد نەبیٚ، ئەوا بەجورئەتەوە چاوەڕێی دەکەی و وادەکەی شەپۆڵە بچووکەکە تەواو ئامادە بێت، بۆ ئەوەی بەرەزامەندی بخشێت و وابکات کە ئارەزوومەندییە گەورەکەی بەدوادا بێت.

– ئێستا کە وا من تۆم خوارد ! .

بۆ تەماشاکردنی جووتە چاوێك، کە شەپۆلێك تیایدا دێت و دەچێت. لەپێناو بوون بە برادەری واچاك لەگەڵ خۆتدا کە خواوەندەکان هەستەوەری خۆیانیان پێداوی و تۆش دەتوانی ئەوەندەی میللیگرامێك فشار هەست پیٚ بکەی، گۆڕانی ئەوەندەی کەرتە میللیمەترێك. ئەمە بۆ ئەوەیە جەستە و گیان یەك بگرن.

بە نەرمیی گوتم : ((تۆزێك بۆ سەرەوە بجوڵیٚ)) ئیٚ باشە.

– زۆر چاکە ... ئەدی ئێستا چی ؟ "

پێویستیم بە وەڵامدانەوە نەبوو، شەپۆڵی گەورە لەخۆیانەوە هاتن و بەسەر دەم و چاوماندا ڕەتبوون.

لەناکاو ئۆرسوْلا خۆی خستەسەر تەنیشت و پشتی لە من کرد. ناوناوە بە ڕێکی موچڕکی پێدا دەهات، منیش هەروا. هەردووکمان لەناخەوە هەژاین، هەردووکیشمان کەوتین. هیچ یەکێکمان قسەی نەکرد. شتێك نەبوو قسەی لە بارەیەوە بکەین. بەرلەوەی سەرمامان بێت لێفەکەم لەسەر زەوییەکە هەڵگرتەوە.

من ئەوەم وەکو بیرەوەرییێك نووسی، وەکو بیرخستنەوەیەك کە من ئەوەی پێی دەڵێن کامەرانیی تەواو، وەدەستم هێنا، پێش ئەوەی دووبارە ڕادیۆکە بکەمەوە :

" .... سوپای ڕووسیای سۆڤیەت لە هێرشەکەدا بەشداری کرد. پەلاماردانەکە لە ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوورەوە هەڵگیرسا تا دەریای ڕەش، ڕاپۆرتی بەردەوامیش دێن باس لە پێشڤەچوون و سەرکەوتنەکانی هێزە یەکگرتووەکانی ئەڵمانیا، ئیتالیا و ڕۆمانیا، دەکەن " .

نیگایەکم گرتە ئۆرسوڵا، یەکسەر خزامە سەر نوێنەکانم، بە نەرمیی بانگم کرد، ئۆرسوڵا نوستبوو سوپاس بۆ خوا.

هەندێ کەس دڵنیان لەوەی کە هەستیان بریندار کراوە، هەندێکی دی لەوانەیە بەقێزەوە زەردەخەنەیان بێتێ، زەردەخەنەی گەورە بە بیرەوەرییەکانم، بەڵام، ئەمانە، وەك بۆت دەردەکەوێ، کەسانێکن کە تا ئێستا پابەندن بە بیرۆکەی پەیوەست بە ڕۆح و ماددە، جەستە و گیان، ئەوەشیان وەکو دەڵێن لەسەر ئاستێکی بەرزترە لە ئەوی تر. وازیان لێ بێنە با بڕەنجێن یان زەردەخەنەی گەورەیان بێتێ. ئەو ڕۆژەی کە خۆیان دەکەون، ئەو کاتە شتەکە هەمووی چاکتر تێدەگەن.

ڕۆژی پاشتر لە دێرە بچکۆلانەکەدا بووینە هاوسەری یەك. پاول ستیگ ئۆرسوڵای بۆ گواستمەوە. تاجە گوڵینەیەکی گوڵە باخی سپی بۆ ئۆرسوڵا هێنا کە کاری تێکرد. قەشە سەر سپییەکە پێی خۆش نەبوو لەیەکمان مارە بکا چونکە دەیزانی من کێم، بەڵام ئێمە زۆرمان لێکرد و کە بیستی من لە نەژادی دانیمارکی مەجەڕیم و ئەوەندەی ڕەگەزنامە هەڵگرێکی سکەندناڤی باشم، ڕازی بوو. " من چەند ساڵێکی لاویەتیم لەو وڵاتە بچکۆڵەی باکوور بەسەر برد. مێرگوزارێکە لە ناوەڕاستی ئەورووپا. با هیوای ئەمە بخوازین پارێزراو بێت، ئەگەر هیواکەشمان هاتەدی، هەرچی زووترە بڕۆن لەوێدا نیشتەجێ بن."

بۆ دیاری بەیانی ئۆرسۆلا گەنجینەییێکی ڕۆمانی وەرگرت : شەوانە پۆشاکێکی ئاوریشم بەدانتێلی ڕاستەقینە، دوو تاقمە جلی ژێرەوەی تەنکی ژنانە، پێنج جووتە گۆریەی ئاوریشمی ڕاستەقینە لەگەڵ ئەنگوستیلەیەك کە پۆرتا پێی دابووم. ئەنگوستیلەیەکی زێڕ بوو، یاقوتێکی سەوزی گەورەی لە ناوەڕاستی چەند پارچە ئەڵماسێکی بچووك تێدا بوو. ئەمانە هەموو بەیەکەوە سامانێکی باشیان لە بازاڕی ڕەشدا دەکرد.

من تەنیا هەندێ بیرەوەری زۆربەی ڕۆژی دواییم لە بیرماوە : ئێمە چیمان داوە لەم جەنگە سەخیفە ؟ ئێمە دەزانین بوورینەتە هی یەکتر.

– نا، نا، نا، دەبێ بەڵێنم پێ بدەی، ئەگەر هەر شتێك ڕوویدا. دەبێ بەڵێنم پێ بدەی کە لێی دوور کەوییەوە. ئێمە دەبێ چاوەڕێ کەین تا جەنگ کۆتایی دێ، ئەو کاتە بزانین وڵات چی بەسەر دێ.

– خۆشەویستم ! لەبیرتە، لەڤییەنا هیچت نەگوت تەنیا (خۆشەویستم) نەبێ. ئێستاش منم دەڵێم (خۆشەویستم) و تەنیا هەر خۆشەویستم.

– بەڵێنم پێ بدە کە زۆر ئاگاداری خۆت دەبی. لە خۆبەخشینت بۆ هەموو شتێك بوەستە. بەڵێنم پێ بدە کە جارجار نامەم بۆ دەنووسی. ئای، سڤن، سڤن! .

– نا، نا، نابێ ئێستا بگری. نا ... نا.

– خواحافیز، سڤن. ئەرێ بەبیرت هاتەوە کە ....

ئۆرسۆلا، ئۆرسۆلا. ڕووییێکی سپی هەڵگەڕاو، خێراتر و خێراتر، ئێستاکە پاشەکشە دەکات. ئۆرسۆلا، ئۆرسۆلا. ئۆر–سۆ– لا، دم – دەدم –دم – دەدم، چەرخەکان، چەر – خەکان.

ستوونەکانی تەلگراف بەپێچەوانە دەڕۆیشتن. فارگۆنەکە پڕو پڕ ببوو. خەڵکەکە هەر قسەیان دەکرد، ئەوان باوەڕیان بە ڕاپۆرتەکانی سەرکەوتن هێنابوو. هەر ئەوەش بوو ڕەنگبێ وای لە من کردبێت کە زیاتر هەست بەدڵتەنگیی و نامۆیی بکەم لەوەی کە بەهۆی لەیەك جودابوونەوە هەستم پێ دەکرد. بۆ کام لەم گیانلەبەرە چەنەبازە، بێ مێشکە، خراپکارانە دەتوانم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە ماکینێکی تەواوی جەنگیی وەك ئەوەی هی جەنەراڵە ئەڵمانەکان ماوەیەکی درێژە بەرەو کۆتایی ناسۆری دەچێت ؟ بەکامیان دەتوانم بڵێم لە قۆناغی یەکەمدا تەواوییەکە ئەوەندە تەواو نەبوو، کە هەر تەنیا کاردانەوەی مەرجداری لەخۆیدا دەگرت کە سەر بە تەواوییەکەیە : توانای وەستان لە ئامادەباشیدا، کە بەهەر حاڵ نەمافی هیچ ڕێز لێگرتنێك دەدا، نە ئەو زیرەکییەیان هەیە بۆ داواکردنی هەر شتێکی زیاتر لە تەواوییەتی وەستان لە ئامادە باشیدا. ئەوەی کە بەتەواوەتی پێویست بوو بریتی بوو لە توانای زانین و نرخاندنی ئەو ڕێگایەی کە پیاو بە هەنگاو دەی بڕێت، پێت دەگوترێت بەم ڕێگایەدا بڕۆ کەچی تۆ بەو ڕێگایەدا دەڕۆیت.
ماکینەکە ڕووە و دوژمنێك دەچوو کە هۆکاری سەرکەوتنی لە دەستدا بوو : ورە بەرزیی.

دەمتوانی هەر تەنیا بە کەسانی وەك پیرەئان و پۆرتا بڵێم کە ئێمە هەر کۆنە قۆندەرەی بۆگەنین، بەڵام خۆ، خۆشیان ئەوەیان چاك دەزانی، دەبوایە لەو ساڵانەدا ئەو جۆرە شتانە هەر لای خۆت هەڵگری.

پیرەئان وەڵامی دایەوە " مۆڵەتێکی خۆش بوو لەگەڵ ژنەکەم و منداڵەکانم. جوانە - بەڵام چەند ڕۆژێکی کەم چ سوودیان هەیە ؟ ژنەکەم بووە شوفێری ترام لەسەر ڕێگای (١١)دا. ئەمە هەمیشە باشترە لەوەی ببیتە پارە وەرگر. بەشی دۆزەخ بێ ئەو کەسەی دەگەڕێتەوە ناو ئەم پیسییە. ئەگەر پیاو تەنیا ئەوەندە بەختەی هەبوایە کە یەک لە قاچەکانی بپەڕیبایە، ئەو کاتە لەکۆڵ ئەم جەنگە نازییە بۆگەنە دەبووییەوە.

پۆرتا هەڵیدایێ " ئەگەر دەستێکی بێت باشترە ".

گوتم : " ئێمە تەنانەت تا ئێستا تێی نەکەوتووین " . " بەڵام، خوای گەورە، دەشکرێ بە سەلامەتی لێی دەرچین ".

پیرەئان دەموچاوی لەناو دەستەکانیدا شاردەوە، چرپاندی " وا تێبگەم چاک تێکەوتووین. من داوای هیچ شتی زیاتر ناکەم، من پێویستیم بە سەرکەوتنی مەزن نییە، پێویستیم بە ئاشتییە، بەسەلامەتی لێی دەرچم! کێ هیچی پێ لەگەڵمانەدا دەکرێت کە بە سەلامەتی لێی دەرچین ؟

کەس نا. تەنانەت خۆشمان نا، خوا لە ناوی بیات.

پۆرتا بلوێرەکەی خستەوە ناو جانتاکەی. لێی نەدا.

## پشووەکەی پۆرتا

- ئەوان دەتوانن ڕاپۆرتەکەیان ببەن و ..... بکەن، پێش ئەوەی بگات من لە بیابان دەبم، زۆریشم پێخۆشە بیان بینم لەوێ شتێك بۆ من بکەن، هەر لەبەرئەوەی کە شەمەندەفەرەوانێکی بێ میزاج شاپێکی شایستەی تێهەڵدرا.

پۆرتا فنی کردە ناو پەنجەکانی و چڵمەکەی بە دیوارەکەدا کێشا و بەو ئاگادارییەی دادا کە لێی نووسرابوو تفکردن قەدەغەیە.

من بەد بەختیم لەگەڵ پشووەکەم پێنەکردبوو. تازە پێم خستبووە ناو دەرگاکەوە کە پیرە ژنێکی جادووکەر لەسەرەوە بە هەڵەداوان دابەزی و منداڵێکی پێ بوو، بەبێ شەرمییەوە یەکسەر بە ڕووە بێگوناح و قەشەنگەکەی مندا چرپاندی کە من باوکیمە. من بەشێوازێکی شارستانانەوە پێم گوت کە ڕەنگبێ هەندێ هەڵەی ئەسەفبار هەبێت و کە ئەو دەتوانێت بچێت لە باخچەکەدا ____ .

بەلەعنەت بم، ئەگەر ئەو ماکەرە نەمباتە مەحکەمە - ئەو کاتە دەبێ بچم و لەبەردەم دەعبایەکی هاوارکردە بوەستم، کە لە پشت مێزێکی درێژ دانیشتووە و وڕێنە دەکات و ئەوە دەردەبڕێ کە من باوکی ئەو بەرهەمە زشتە فاحشە دواکەوتووەم.

زۆر بە هێمنیی و لەسەرخۆ ڕاستییەکەم پێ ڕاگەیاند، کە هەموو کەسێك دەبێ ئەوە بزانێ کە بەتەواویی لە ڕووی سروشتییەوە ئیمکان نییە کوڕە

لاوێکی قەشەنگی وەك من ببێتە باوك بۆ منداڵێکی وەك ئەوە، ئیشارەتیشم بۆ ئەو منداڵە کرد کە پیرە ژنە زشتەکە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی.

مشتومڕێکی زۆر لە بارەی تاقیکردنەوەیەکی خوێن هەبوو. کەسێکی چاو خێلەش کە سوور بوو لەسەر ئەوەی دکتۆرە ئەم لایەنەی ڕێکخست و، منیش دڵخۆش بووم، چونکە ئێستا هزرم بۆ ئەوە دەچێت کە هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە، بەڵام شتەکە تەنیا ئەوەی دەرخست کە پیاو نابێ باوەڕ بە دکتۆران بکا چونکە، شەیتان بۆ خۆیم ببات، ئەگەر لەپاشاندا نەڵێن کە من دەبێ باوکی ئەو منداڵە بم.

- بەڵام، پۆرتا، ناتوانن شتی وا بکەن ! ئەگەر کونییەی سەربازیت ئەوە ڕوون بکاتەوە کە تۆ لەو کاتە لە بەرلین نەبووی ئەوا ناتوانن .....
- ئەوان دەتوانن هەموو شتێك بکەن، هەرکە من لە تەواوی چالاکیی خۆم دابووم و ماڵئاوایی ناسکم لە پیرە کەسێکی خۆشەویستم وەردەگرت و هەموو سوور هەڵگەڕابوون و ددانەکانیان دەگرساند، ئنجا مالۆسێکی شەت و گێڕ هات و منی ئاگادار کردەوە کە وا خەریکە دەزێت.

گوتم " زۆر چاکە، بەختەوەریت بۆ دەخوازم. فۆهەر زۆر شادمان دەبێ. سڵاو بۆ پیاوەکەت و لەمنەوە پێی ڕابگەیەنە کە پێویستە هەموو ڕۆژێك زبڵدانەکە بباتە خوارێ تا ئەمە هەمووی بەسەر دەچێت ".

- بێگومان، شتەکە ئەوە نەبوو کە پەیوەندی بە منەوە هەبێ، بەڵام لە دواییدا یەك خووی ئەوی تر دەگرێت. جا بۆیە کەمێك لەگەڵ ئەو ماکەرە دوام دەربارەی ئەو دڵخۆشییە گەورەیەی کە چاوەڕێی دەکا و، هەر بۆیەش پێویستە بزانن کە کریسمس بوو، ئێمە چووینە ژوورەکەی تر و پێکەوە هەندێك شیرینیمان خوارد..

– من، گەمژە بووم، بیرم لە هیچ نەدەکردەوە، تا ئەو ماکەرە بە گوێچکە گەورەکانیدا چرپاندم : " تۆ باوکەکەی، ئازیزەکەم، دڵخۆش نیت ؟"

هاڕاندم " دڵخۆش ؟ " "دیارە تۆ بە تەواویی وڕێنە دەکەی !"

جا بۆیە بەبێ پیرۆز کردنی من لەبەر چاوان ونبوو. پیاو هەر هەندە تووشی بێبەختی بێت. من نازانم بۆ کەسانی تر چۆنە، بەڵام بۆ من هەر ئەوەندە پێویستە ژنێك لە کۆشم دابنیشێ و ئیتر تەواو.

پیرەئان هەڵیدایێ و گوتی: "دەبێ هەوڵبدەی قۆپچەکانی پانتۆڵەکەت دابخەی"

– پۆرتا، پیاوانە پێم بڵێ، ئەتۆ لە ماوەی هەموو ئەو دە مانگەی پێشوو لە بەرلین نەبووی ؟

پۆرتا گوتی: "تۆ خۆت دەتوانی سەیری کونییەی سەربازیم بکەی"

– بەڵێ، بەڵێ، بەڵام ئەوەی لە کونییەی سەربازییە شتێکە و ئەوەی تیاشی دانییە شتێکی ترە.

– Et tu, Brute تۆش، پۆرتا گوتی: "من دە مانگ لەمەوبەر لە بەرلین بووم – بەڵام، خۆ تەنیا بۆ نیو ڕۆژ لەوێ بووم"

پیرەئان گوتی: " ئەوە گرنگ نییە ئەگەر لەسەر ڕانی بووبیت "

هەر ئەوەندە لێم گەڕێ دەست بنێمە بینی ئەو هۆنەرەی کە نووسیبووی
دەریای ناوەڕاست شین و جوان و دەم بە زەردەخەنە بوو.

# شوێنی مەبەست: باکووری ئەفریقیا

بەلاقــە شــۆڕبووەکانیانەوە بەســـەر کامیۆنــە ئــاژەڵ هەڵگرەکانیانـــەوە بەتالیۆنی (١٨) مین بەناو ڕۆمانیاو هـەنگاریا و نەمسادا تێپـەڕی و، لەوێشەوە بەهات و باتـەوە ڕێمـان کرد بەرەو خوار بە ئیتالیـادا. پێنج جاران (پۆرتـا)مـان هێنا بەلای دەرگاوە بۆ ئەوەی تەماشای کێڵگەی (ماکارۆنی) بکات. ئەو قەت بەڕاستی باوەڕی نەدەهێنا کە ماکارۆنی ڕووەك نییە.

ئێمە لە ناپۆلی دابەزێنراین، (تانك)ی تازە بابـەتمان پێدراو بەدلـەی وامـان بۆ دابینکرا کە لەگەڵ ناوچەی خولگەییدا بگونجێ. پۆرتا ڕازی نـەبوو کە کۆنـە بێرییە لبادە ڕەشەکەی بە کڵاو خوودە بگۆڕێتـەوەو، بۆیـە جۆرە دەمەتەقێیـەك لـەنێوان ئـەو و فیلـدۆیبلی بنکـەی مەشقکردنەکە پەیـدابوو کـە هاتووهاواریـان لەسەر چیای (ڤیسۆڤ)ەوە دەبیسترا. ئەنجامەکەشی کارێکی سازشکارانە بوو: پۆرتـا کـڵاو خوودەکـەی پەسـندکرد، بـەڵام فێلدوبیلەکـە بێرییەکـەی بەدەسـت نەکەوتەوە.
هەر بەرلەوەی باربکرێین، پـەتاییەك بەناو بەتالیۆنەکەماندا بڵاوبۆوەو لـە مـاوەی چـەند ڕۆژێکـدا ئەوەنـدەمان لەدەسـت دان، کـە ناچـار بـووین ماوەیـەك لـە شـوێنەکەی خۆمانـدا بمێنینـەوە تـا ئـەو کاتـەی قـەرەبووی زیانـەکانمان لـە ئەڵمانیاوە بۆ هات.

لـە دواییـشدا کـە بـارکراین، پێنج بـەتاڵیۆن بـووین. پێنج هـەزار سـەرباز بەسەر دوو کەشتیدا دابەشکراین. کە لـە پێشاندا کەشتـی نەفەر هـەڵگر بـوون.

کە کەشتییەکەمان لە بەندەرەکەوە دەرچوو هاواری خۆشیمان لێ هەستا، خۆمان بەسەر ڕێل و ساریە و گوریسە تایبەتەکانی کەشتییەکەدا شۆڕکردبۆوە، هاواری خۆشیمان دەکرد و دەکرد.

هەر یەکێکمان پشتێنەیەکی ڕزگاربوونی پێدرابوو، فەرمانی توند هەبوو کە نابێ قەت دایبکەنین، پشتێنەکان بالیفی باش بوون بۆ ئەوانەی کە فەرمانەکەیان جێبەجێ دەکرد. بەلەمەکانی ڕزگاربوونیش بەم لاو ئەو لای کەشتییەکەدا هەڵواسرابوون. تۆپی جۆری (AA) لەسەر کەشتییەکەدا دانرابوون و، ئێمەش لەلایەن سێ بەلەمی تۆرپیدۆی ئیتالییەوە پاسەوانیمان دەکرا کە دووکەڵێکی ڕەشی چەور لە دووکەڵکێشە کورتەکانییانەوە دەردەچوو. کەشتییەکە بەتوندیی بەم لاو بەو لادا دەچوو، کەس نەیدەتوانی لەخوارەوە لەبەر بۆنی بۆگەنی ڕشانەوە لە عەنباری کەشتییەکەدا بمێنێتەوە. پۆرتا، پیرەئان و من، خۆمان لە پاڵتۆکانمان لوول داو لە پەناگەی کەشتیەکەدا لێی پاڵ کەوتین. بەبیرم نایەتەوە باسمان لە چی دەکرد. بەڵام چاک دێتەوە بیرم کە بەتەواویی لە جەماعەتەکەمان ڕازی بووین.

وا دەزانم ئێمە تەنیا هەر جگەرەمان دەکێشاو هێمنانە بەگشتی لە بارەی شتەوە دەدواین، لەکاتەکانی هۆشیاریدا هەندێ تێبینی پڕ لە بیرۆکەمان لێ دەردەچوون، ئێمە زیاتر وەك ئەو کرێکارانە دەدواین کە لە ماوەی پشووی نانخواردنی نیوەڕۆدا لەسەر ڕۆخی کەندەکێك دادەنیشتن. بۆ ماوەیەك وەکو کەسانێك گیرابووین کە شایانی لەسێدارە دانن کە بەشێوەیەکی ئاساییش هەروا بووین و، پۆرتا تەنانەت وای لێ هات کە هیچی تر گفتوگۆیەکانی بەو وشانە نەڕازێنێتەوە کە باس لە ئەندامەکانی سێکسی مرۆڤ دەکەن، هەروەك ئاسایی جاران دەیکرد. تەنانەت ئەو، زۆر ئاسایی ڕەفتاری دەکرد. من خۆم

بینی کە ئارەزووی ئۆرسۆلا دەکەم بۆ ئەوەی ڕاستییەك بەسەر ئەو ئاشتییەدا بپۆشم کە تامێکی زۆر خێرای ئەومان کردووە لەناو ئەو کەشتییە سەربازییەی کە بە سەربازو بەتانك بارکراوە.

پۆرتا هەستی بەوەکرد کە ئارەزووی مۆسیقا دەکا، بەڵام بۆی دەرکەوت جانتاکەی نەماوە. هاواری کرد، بمگەنێ .. بمگەنێ ! مردم ! کوژرام ! دزان ... پیاو کوژان، کۆمەڵە نازییەکی نەفرەت لێکراو ! تاڵان کرام ! دزرام ! شمشاڵ و چاکەتەکەم !

ڕازی نەبوو هێمن ببێتەوە، تەنانەت کە دڵنیاشمان کردەوە کە دەتوانێ لە تەرابلوس شمشاڵێکی تازە بکڕێت. هیچ شمشاڵێك لە تەرابلوس ئەوەندەی کۆنە شمشاڵەکەی خۆی باش نابێ.

وردە وردە کەوتینە خەو.

بەهۆی گرەگرێکی زۆر گەورەوە کە لەو تاریکەدا بەسەر سەرمانەوە دەهات بە ئاگاهاتین. لەئاسمانەوە زمانە گڕە ئاگری سووری کینەدار لێی دەداین. دەنگی هاوارو فیکە پەردەی گوێمانی دەدڕاند. لێدان و شەقەی توند لە پلێتە ئاسنەکانی ڕۆخی پاپۆرەکەمانەوە بڵند دەبوو. تۆپەکەی ئێمەش زمانی لەو تاریکییەوە دەرهێنابوو لە بۆمب هاوێژە پەلاماردەرەکانی دەگرت. بووم، بووم، بووم، ڕەشاشەکانیش شێتانە دەیان لووراند.

لەسەر پشتی کەشتییەکەدا ڕەق ڕاوەستاین هەم ترساوو هەم بەخۆشییەوە دەلەرزین– ئەمە، دوای هەموو شتێك، یەکەم جار بوو کە دەکەوتینە کار – لە کاتێکدا هەوڵمان دەدا کە شتێك لە ڕووداوەکە بزانین.

ئێستاش، فڕۆکەکان گەڕانەوەو لەکاتی خۆتێرووکردندا هاڕەیان دەهات.

پاشان ناڵەیەك بەسەر هاوارەکەدا کەوت، پیرەئان پاڵێکی پێوەنام و هاواری کرد:

لەخوارەوە ! ئەوەتا

ئنجا گرمەکە هات و کەشتییە گەورەکە هەژا. دیسان گوێمان لە هاوارێکی ترسناک بوو، بەلاّم ئەمجارەیان کەشتییەکەی تریان مەبەست بوو. لەگەڵ وردوخاش بوونەکەدا چەند ستوونە ئاگرێك بەسەر ئەو ناوەدا بەرزبوونەوە و لەبەر ڕۆشناییاندا دەم و چاوی یەکتریمان دیت. لە ماوەی چەند چرکەیەکدا کەشتییەکەی دیکە بووە دەریاییێکی پڕ لە هاواری گڕ و کڵپە. زمانەی سوور و زەرد لەناو دووکەڵی چڕدا بەرز دەبوونەوە و گرمەیان وەکو گرمەی تۆپ بوو. فڕۆکەیەك بەربۆوە سەر پێشەی کەشتییەکە و لەوێدا کەوت، ئنجا لە پاشان گڕی ئاگر دەورەیان دا. لەناکاو وام زانی پەردەی گوێچکەکانم دڕان. گوێم لە هیچ نەدەبوو، وەکو فلیمێك بوو کە تۆماری دەنگەکەی تێکچوو بێت. هەستامەوە و تەماشاییێکی ئەو دەریا تاریکە سوورەم کرد، بەلاّم لەناکاو تێهەڵدرامە سەری و ئەوەندەم زانی کە دووبارە گوێیەکانم کرانەوە. سەرچاوەی ئاگرو ئاو بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە. لەناو کەشتییەکەوە تەقینەوە دەنگی دەدایەوە، یەك لە سێ دووکەڵکێشە گەورەکانمان فڕی و ئنجا لەسەرخۆ بەکەوانەیی لەو تاریکییەدا کەوتە خوارەوە. ئەمەیان بەڕاستی دیمەنێکی سەیر بوو.

" کەشتییەکە وەرگەڕا ! "

ڕمبەی ورد و خاش بوون تا ئەو کاتەش لەناو کەشتییەکەدا هەر دەهات. لەوێشەوە هەزاران هاواری ترس لەو کەسانەوە بەرز دەبۆوە کە لە عەنبارەکانی کەشتییەکەدا بوون، بەپەشۆکاوییەوە سەیری یەکتریمان کرد، ئنجا خۆمان تێهەڵدا.

ئاوەکە لەخوارەوە ئەوەندە لێم دوور بوو کە وام دەزانی قەت نایگەمێ، بەلاّم لەناکاو ئاوەکە پێچامییەوە و هەر نقووم و هەر نقووم دەبووم، وام هەست

دەکرد کە هەموو گیانم تێك دەشکێت، گوێچکەکانم هاڕەو هاشەیان لێوە دەهات و لەناو سەریشمدا شتێك خێراو خێراتر، گەورەو گەورەتر تەپەی دەکرد. لە کۆتاییدا هیچی تر خۆم پێڕانەگیرا. نائومێد بووم، وام زانی وا دەمرم و، لەو ساتەدا دەمم لە ئاوەکە دەرچوو، سییە ژان کردووەکانم هەوڵی هەوا گرتنیان دەدا بەڵام لەناکاو کەوتمەوە ژێر ئاوەکە. شێتانە بە هەموو تواناوە بە دەست و پێ هەوڵم دا تا پێم دەکرێت لە کەشتییە نقووم بووەکەوە دوور کەومەوە بۆ ئەوەی لە نقووم بوونیدا منیش لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچ نەکات. هەموو ڕەنگەکانی پەلکە زێڕینە لەبەر چاوەکانم دەهاتن و دەچوون. هیچ بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئایا بەئاراستەی دروست مەلە دەکەم یان نا، بەڵام وای بۆ دەچم کە دروست بوو، چونکە بە بیرم نایەتەوە چ ئاراستەیەکم گرتبووە بەر. تەنیا لەپێناو خۆشەویستی ژیاندا بەرگریم دەکرد، لەکاتێکدا ماسوولکەکانم لەبەر ژان هاواریان بوو، دەپاڕانەوە کە ئەو کارەی دەیکەن ڕابگیرێت، مردنیان پێ پەسندتر بوو. غەریزەی گیان پاراستن لەلای من بەهێزتر بوو لە ماسوولکەکانم و لە سییە هانك پێکەوتووەکانم و یان لە ئارەزووم. کاتێکیش بەلەمی ڕزگاربوون لەناکاو دەرکەوت من تەنیا نیمچە ئاگاداربووم.

سەرئاو بووم، باسکەکانم لەسەر بەلەمی ڕزگاربوونەکەدا حەسانەوە. شەپۆلە داپۆشراوەکان بەکەفی ڕەش وەك مووشەك منیان فڕێ دەدا تا بەگێژیی لەسەر لوتکەی کێوێکی ئاو دانیشتم، بەترسەوە سەیری گزەگزی ئاوی نێوان دوو شەپۆلەکەم دەکرد. چەند جارێك لەناو ئەو جۆرە نزماییەدا نقوم بووم. شێتانە هاوارم دەکرد.

لە دوورەوە کڵپەیەك ئاسمانی سوورێکی ئەرخەوانی کردبوو، جگە لەمە هیچ شتێکی تر نەبوو تەنیا ئاوو ئاو، ئاوێکی دڕندەی گەورەی بەترس و شەوێکی تاریکستان نەبێ.

ماسی شارك ! چی له بارەی شارکەوە دەزانی ؟ ئایا ماسی شارك له دەریای ناوەراستدا هەن ؟ بەڵێ ! هەن. شێتانه بەرگریم کرد، بەڵام هەر زوو ماندوو بووم و ناچار بووم بوەستم. پاشان بیرم له پیرەئان و پۆرتا کردەوە، چاوم بڕییه ئەم لاو ئەو لاو لەو تاریکستانەدا هاواری ناوەکانیانم کرد.

پیرە – ئان ! پۆر– تا ! پۆر– تا

تەنیا لرفەی شەپۆلەکان وەڵامیان دایەوە، دیسان شێتانەو نائومێدانه گریام. لەترسی خۆم هاوارم بردە بەر دایکم و بەر ئۆرسۆلا.

هاوارم لەخۆم کرد " کوڕە ! خۆت ڕاکێشه " ئنجا دەستم به پێکەنین کرد. وام دەهاڕاند دەتگوت کەمتیارێك بە تەنیشتمەوەیە، دەنگی وا شێتانەم لێدەردەچوون دەتگوت دەنگی من نییە، لەپاشان هاتمەوە هۆش خۆم و دەستم به گریان کردەوە. بەدرێژایی شەو شەپۆلەکان تێیان هەڵدەدام، دەردە دەریام پێوە نووسابوو، دەڕشامەوە و دەگریام.

ئەری ئەوە کەسێکه هاوار دەکا ؟ گوێم ڕاگرت. بەڵێ، کەسێك لەو تاریکستانەدا هاوارییەتی. ئەوەتانێ ! بێگومان. بەبێ هۆشیی. هەموویان مردوو بوون. کەس نییە. هەندێ جار تۆش له تاریکیدا دەمریت. هەموو کەسێك مردووە. ئەوان شتی تریان هەیه بۆ بیر لێکردنەوە. کەس نییه بیر له تۆ بکاتەوە. ئەوان بەدو ساردو سڕن. ئەگەر تۆش هیچ شتێك له خەڵك چاوەڕوان بکەی ئەوا تۆ کابراییێکی پێکەنین ئاوەری.

بەڵێ، بەڵام دەبێ کەسێك هەبێ، نابێ پیاو هەر لەئاودا ڕاکشاو له بیر بکرێ. کاتێکیش ئەوان بەلیستەکاندا دێنەوەو دەزانن کێ بزربووە، ئەو کاته هەموو کەسێکی بەردەستیان دەنێرن بۆ ئەوەی له تۆ بگەڕێن ؟ تۆ ؟ سەربازێکی تاوانبارکراو! ها ! ها ! ها

ورده ورده دنیا ڕووناك بۆوه. ئەریٚ ئەوە شتێك نییە لەلای ڕاست ؟ ئەریٚ ئەوە زەلامێك نییە لەسەر بەلەمی ڕزگاربووندا خۆت ئاسا ڕاکشاوە ؟
تۆ شتان دەبینی. شتانێك کە دەتەویٚ بیانبینی. تۆ گێلی ، شتانێك دەبینی کە لەویٚ نین.

بەڵام خۆ ئەوە پۆرتا بوو، بە زەردەخەنەییێکی پانەوە، بێرییە ڕەشەکەی لەناو چاکەتەکەیەوە دەرکێشاو، لەسەری ناو ئنجا وەکو شەپقە بڵندی کرد.
کوڕی خۆم ! ڕۆژێکی باش بۆت، ئەوا تۆش لەکەنار دابەزی ؟ من کەمێك قاچم تەڕ بووە، بەڵام خۆشۆردنێکی بە ڕێکەوت ئازارت نادات.
بەدڵخۆشییەوە هاوارم کرد، پۆرتا !. ئای، سوپاس بۆ خوا، تۆ ئەی ڕیخ بڵاوکەرەوەکە ! من کەمێك تێکچووبووم و، لە چاوانی ئەویشدا ئەو شتەم دیت.
" کوا پیرەئان ؟ "
پۆرتا بە ڕاوەشانی دەستی وەڵامی دامەوە " لە شوێنێکە لەناو ئەم گۆمە، بەڵام لێم مەپرسە ئایا لووتی لەناو ئاوە یان لە دەرەوەی ئاوەکەیە ".
هەردووکمان بەلەمی ڕزگاربوونی خۆمانمان لێك بەستن بۆ ئەوەی لەیەك جودا نەبینەوە.
پۆرتا گوتی: " ڕەنگبیٚ تۆش چاوەڕێی هەمان ترام بکەیت، گەورەم ؟ "
– ئەدی بۆ خاتری خوا تۆ بۆچی وا لاوازی ؟ پۆرتا ئەمەی گوت و بەنیگاییێکی برسییانە سەیری کردم. تەنانەت تۆزە گۆشتێکت پێوە نییە. بەڵام لەوانەیە شتێکی سەیر بیٚ کە پاش سەد ساڵی تر من بەنەوەکانم بڵێم کە چۆن جارێکیان من گیانی خۆم لەگەڵ مشتێك ئێسك و پروسك ڕزگارکرد کە ناوی سڤن بوو.
جێی شانازی نییە بۆت کە ژیانی پڕ لە پاڵەوانییەتی خۆت بەوە بەکۆتا بێنی

کە ببیە جەمێك خۆراك بۆ یەكێك لە باشترین سەربازەكانی هتلەر ؟. كە دەگەمەوە ماڵەوەش ئەو كاتە دەبینم بوویتە پەیكەرێكی یادگاری. كامیانت پێ باشترە، گرانیت یان برونز ؟

لەناكاو هاوارێكی دەرهێناو ئاماژەی بۆ پاپۆرێك كرد لە دوورەوە.

- ترامی ئێمە !

بانگكردن و هاتووهاوارمان دەست پێكرد، بەڵام پاپۆرەكە بزر بوو.

هەركە پاپۆرەكە لە ئاسۆ ئاوا بوو، پۆرتا نەڕاندی " چاك بوو ڕۆیشتیت، بەسەلامەتی بەجێمان بهێڵە، ئێمە هیچمان لە تۆ نەكردووە ! "

ئەو بەیانییە خەمناكە هەوراوییەمان بە گفتوگۆ بەسەربرد. خۆرەكە ناوبەناو لەناو پەڵە هەورەكاندا دەردەكەوت، سووتێنەر بوو، لەدواییدا من بەهۆی ماندووبوونەوە نیمچە بێ هۆش كەوتم، بەڵام پۆرتا لەبەر خۆیەوە بەردەوام بوو لەسەر قسەكردن.

- ئێستاش جووتە باڵندەیەكی نەورەسی وەك ئەوە، دەتوانن بەهەموو شتێك پێبكەنن، هیچ شتێك ڕوونادا ئەگەر ئێمە دوو باڵمان پێوە بوایە، بەڵام لەجیاتی ئەمە ئێمە وا لێرەین و پاشەڵمان لەناو پێشۆر دایە. ژیانێكی زۆرمان بەسەربرد كە تیایدا گەلێك ئاگادار بووین نەبادا زۆر لە دەریای مەلعوونەوە نزیك ببینەوە، كەچی بێگومان سوپای ناپاك یەكسەر بردینییە ناو ئەو دەریایەوە. قسەكەی من هاتە جێ كە دەم گوت : " قەت هیچ چاكەیەك لە بوون بە سەرباز چاوەڕێ ناكرێت، بەڵێنم پێ بدە كە هەرگیز نەبییە جەنەڕاڵ، كوڕەكەم ! ئەگەر ئێرە وا تەڕ نەبوایە".

- پۆرتا ...... پێت وایە بە سەلامەتی لێرە دەردەچین ؟

- لێی دەرچین ؟، نەخێر، دەتوانی سوێند بخۆیت كە لێی دەرناچین، بۆیێ، كوڕی خۆم، سەری خۆت دانەوێنە، بەڵام ئەگەر هاتووهاوار بكەیت یەكێكی وات

بە دەم و لووتدا دەکێشم کە قەت لە بیری نەکەیت. پێویستە دەمە ناشیرینەکەت بگریت، ئەگەر وات کرد ئافەرینت لێدەکەم. لەو سەین و بەینەدا بۆ خۆت دڵخۆش بە کە لە پەناگەییێکی بۆگەن لێی نەکەوتووی لەگەڵ کۆنسێرتی ڕەشاشە گەورەکان. بێگومان، ئەو کونە بچووکانەی ناو زەوی بێلایەن بۆ ئەو کەسانە باشن کە ئارەزووی قەبزیی دەکەن، بەڵام ئەمەیان باشترە، دەبینی، ئەمەش بەختێکی بێ هاوتا و ناشایستەیە کە لێرە نیگەرانی کردووی، لێرە تۆ نەک تەنیا هەر جلەکانی ژێرەوەت پیس ناکەیت بەڵکو هاوکات چاك دەشووریێت. تۆ ناتوانیت ئەمە لە پەناگەدا بکەیت.

– پۆرتا ....... تۆ باوەڕت بە خوا هەیە ؟

– بە کێ، بە ئەو ؟ ئەگەر مەبەستت ئەو کەسەیە کە پیاوانی ئایین وەعزی بۆ دەدەن، دەتوانیت بچیتە نیشتمانەوە بۆ لای قەشەکەی خۆت و پێی ڕابگەیەنیت کە باشترە بۆ ئەو واز لە کۆمەڵەکە بێنێت و کەسێکی باشتر بدۆزێتەوە کە بانگەشەی بۆ بکات.

– منیش وای بۆ دەچم کە کەنیسە و هەرچی پەیوەندی پێیەوە هەیە شتی نزم و پڕو پووچن. قسەکانم سەیرن. " ئەمە بیروڕای منە ". من قەت بە ئاسایی قسەی وا ناکەم.

– زۆر چاکە ! کەواتە تۆ بەتەواوی شێت نەبوویت. من زۆر لەوە دەترسام کە من لێرەدا پاڵ کەوتوومە چەشە لە خۆشییەکانی خۆشوشتن وەردەگرم لەگەڵ کەسێکی عەقل دواکەوتوو کە دەیەوێ بەلای کەنیسە و ئاییندا ڕام بکێشێ. بەڵام تەڵەکەیە – ئەمەش دەوەستێتە سەر ئەوەی چۆن سەیری دەکەی. هەر چۆنێك بێت، توانای خۆت لە سوکایەتی کردن بە ئایین بەفیڕۆ مەدە، ئەوەندە ناهێنێ. لێ گەڕێ با خەڵك باوەڕی پێ بهێنن ئەگەر پێیان خۆش بێ، مادام بەم باوەڕەیان گرفتارم ناکەن ئەوا هیچ بایەخێکی بۆ من نییە و ئەگەر لەمەشدا

خۆشی دەبینن، زۆر چاکە، بەختەوەرییان بۆ دەخوازم. من خۆم وام پێ باشە کە بیرو هۆشم بە ئارەق و بە کچە ڕەبەنەکانەوە خەریک بکەم، دەتوانم دڵنیات بکەم لەوەی کە ئەگەر بۆ جارێک سۆراخی ڕەبەنخانەت بکردبایە قەت لە ئایین نائومێد نەدەبووی.

پۆرتاش، بێگومان، وەختێک کوڕی باخچەوانی ڕەبەنخانەیەک بووە. من وەک پێویست گوێم بۆ قسە خۆشەکانی گرت دەربارەی کارە بەرجەستەکانی، لەکاتێکدا بیرو هزرەکانم خۆیان پتر بەو پرسیارەی دەربارەی خوای توانادار و زانا و بەرزەوە خەریک بوو.

پۆرتا گوتی: " کوڕە، وا دیارە تۆ گوێت ڕاناگریت " ئنجا لەناکاو بێدەنگ بوو. ئەو بارودۆخەی تیایدا بووین لەڕاستیدا یارمەتی ئەوەی نەدەدا سەرپێیانە قووڵتر لەسەر بابەتی خۆشییەکانی ژیان لە ڕەبەنخانەکاندا بدوێین. ئەو وای دەدیت. بەڵام لە پاشان دووبارە دەموچاوی گەشایەوە.

– تەنیا شتێک هەیە کە کەنیسە بە منی بەخشیوە و درۆ نییە.

– ئەو شتە چییە ؟

– ئۆرگۆنە. ئەگەر هەر تەنیا دانەیەکمان لێرە هەبوایە، باوەڕ ناکەم من لێرە پاڵ کەوتبام و قاچەکانم بەم جۆرە تەڕ ببوونایە و لە سەرمان بمردبام. من جارێکیان ئۆرگۆنژەنێکم ناسی و، فێری ئۆرگۆن ژەنینی کردم. بەڵێ، وەکو دەڵێن نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو شتێک لە بارەی نوێژکەرانەوە و هەروەها چۆن پێویستە هەژاران دڵخۆش بن چونکە دەچنە بەهەشتەوە تەنیا هەر چاو بەستنە و بەس، هیچ شتێکیش بۆ (دادی) لێرەدا نییە. دیمەنێکی نەفرەتباری جوانە کاتێک کە مێواندارییەکی تایبەت بە

مەسیح لەگەڵ درەختی کریسمس و هەموو ئەو شتەی کە هەتە دەکەیت. کاتێکیش گۆرانی تێهەڵدەکەن و مۆسیقای کەنیسەش دەژەنن، دەتوانم بڵێم کە لەبەر هەڵچوون لەسەرخۆ دەست بەگریان دەکەیت، کاتێکیش گوێت لە مۆسیقایان دەبێت بە ئاشکرایی ئاو بەدەمتدا دێتە خوار.

تێنوێتی هەراسانی کردبووین و، بەبێ دەنگ لێی کەوتین.

هەر یەکسەر دوای خۆرهەڵاتنی ڕۆژی دوایی فڕۆکەیەکی ئیتالیایی لە نزمییەوە بەسەرمانەوە فڕی و بەلەمێکی لاستیکی فڕێ دایە خوارێ کە تەنیا لە دووریی بیست یاردەیەك لێمانەوە کەوت. ئێمە پێکەنین و گریاین، پۆرتاش هاواری کردە فڕۆکەکە :

سوپاس پیرە سپاگیتی خۆرینە، تا نەوش برە چاکەیەکتان تێدا ماوە :

دەرکەوت هەم سەوڵ لێدانی ئەو بیست یاردە بۆ گەیشتن بە بەلەمەکە و هەم بۆ چوونە ناوییەوە زەحمەتتر بوو لەوەی بیری لێ دەکرایەوە. هەریەکەمان چووینە لایەکی، من لە پێشدا هەوڵم دا و تەقەللام کرد و سەراو بن دەبووم و ژێر ئاو بووم و خەریك بوو خۆم بخنکێنم، چونکە لەبەر ماندووبوونی تەواو دەستم بە پێکەنین کردو خۆم پێ ڕانەگیرا، بەڵام لە دواییدا هەردووکمان گەیشتینە ناو بەلەمەکە و تەوقەمان لەگەڵ یەکتری کرد.

- ئێستا ئێمە تەنیا پێویستیمان بە دەستەیەك کاغەز هەیە.

پێمان پەیدا نەکرا، بەڵام تانکییە ئاوگرەکە هەندێ قوتییە شیر، گۆشتی وشك کراو، بسکویت و چوار شووشە (شناپسی) تێدا بوو. دەستمان بە خواردن و خواردنەوە کرد، لە پاشان لە دواوەی بەلەمەکە و لە ژێر چارۆکە هەڵدراوەکەیدا لێی ڕاکشاین و نووستین. لە نیوەی شەودا سەرما بە ئاگای هێناین. دەستمان بەیەکتر لێدان کردو بەهۆی ئەمەو بەهۆی دوو قومی باش لە

شناپس هەر زوو گەرم بووینەوە، بۆیێ دووبارە لێی پاڵ کەوتین و نووستین. دەوروبەری نیوەڕۆی ڕۆژی پاشتر بەدواگەڕانێکی ترمان لە تانکییە ئاوگرەکەدا کرد و ئەمجارەیان سندووقێك ڕۆکێت و قوتووە شلەییێکی زەردمان دۆزییەوە. ئەوەی دواییان بۆ ئەوە بوو بیڕژێنیتە سەر ئاوەکەوە، کە لەدواییدا ئەوەمان کرد و، ئەوەندەی پێنەچوو ئەو شتە چەورە بڵاوبووەوە و پارچەییێکی گەورەی ڕەنگی زەردی درەوشاوەی پێکهێنا کە بە ئاسانی لە ئاسمانەوە بە دی دەکرا. دوو ڕۆکێتمان هەڵدا و هاواری خۆشیمان بۆ کردن، کە وات دەزانی ئاهەنگی ناو باخچەیە. لە پاشان گۆرانییێکی ئەڵمانی، یەکی ئینگلیزی و، یەکێکی فرەنسیمان چڕاند، نموونەگیریمان لە پاشماوەی ئازووقەکە کرد، خۆشییەکی زۆرمان لە فێڵکردن لە یەکتری وەرگرت، بەڵام لە کۆتاییدا وەکو برای ڕاستەقینە دابەشمان کردو، بەهۆی برسییەتیمانەوە ئەوەی کەوتە بەر دەستمان خواردمان، جگە لە چەند دانە پسکویتێك نەبێت.

دەستمان کرد بە باسکردن لە بارەی ئەوانی ترەوە ، کە زۆربەیان بە تەئکید مردبوون .

پۆرتا گوتی: کە گەیشتینە کەنار دەریاوە، بەنامە نووسینەوە خەریك دەبین بۆ هەموو ئەو دایك و دەزگیران و ژنانە.

ئۆرسۆلا.

بەیانی پاشتر، دوایین پاشماوەی (شنابس)مان خواردەوە و دوایین پسکویتیشمان خوارد.

میواندارییەتی پاشتر بە بووتەکانمان دەبێ. تۆ پێت خۆشە ئەوەکەی تۆ چۆن بێ، لەگەڵ کوارگ کرابێ یان بە دۆشاوی ڤانیللا ؟.

دوای کەمێك تووشمان بوو بە تووشی لاشەیەکی سەرئاوکەوتوو بە کەمەربەندی نەجات. بەزەحمەتییەکی زۆرەوە هەوڵمان دا بیگەینێ. لاشەکە هی

(ئەنتیرۆفیزەر)ێك بوو كە قاچ و زگی خراپ سووتا بوون. دەفتەرێكی تێبینی لە گیرفان بوو كە پڕی بوو لە یادەوەری و ناوونیشان، هەروەها كونییە سەربازییەكەی و دەفتەرێكی گیرفانمان لادۆزییەوە. لەمەوە زانیمان كە ناوی (ئەلفرێد كۆنیگ) بوو، كە لە فەوجی تۆپخانەی ژمارە (١١٦) ئەنترۆفیزەر بوو، ماوەی سێ ساڵ سەرباز بووە، تەمەنی بیست و دوو ساڵان بوو، (ئێرما بارتێلس)ی بەرلینی تەمەن بیست ساڵیی هاوسەری بووە. دەفتەرەكەی گیرفانی ژمارەیەك وێنەی فۆتۆگرافی خۆی لەگەڵ كچێكی پرچ كاڵ تێدابوو.
شتەكانیمان لای خۆمان گلدایەوە و ئەومان بە دەریا دادایەوە.

پۆرتا گوتی: سڵاو بۆ هەموو ئەوانی تر كە لەناو دەریادان لەوێ. من نامەیەكی جوان بۆ (ئێرما) دەنووسم و پێی ڕادەگەیەنم كە تۆ بەسەربەرزیی و بەتەنیایی وەك پاڵەوانێك مردی، ماوەی چوار ڕۆژ هێزێكی گەورەی پەلاماردەرت لە كەنداو ڕاگرت تا ئەو كاتەی گوللەیەك لە دڵی دای و كەوتیت و یەكسەر مردی. بەڵێ من دەزانم چی پێویستە بۆ ئەوەی ئێرمای خۆشەویستت بە شانازییەوە بەدەستە خوشكەكانی بڵێ كە (ئەلفرێد)ەكەی بەشێوازێكی ڕێك و پێك گیانی لەدەستدا لە كاتێكدا لەپێناو نیشتمانە مەزنە پیسەكەی دەجەنگا. لەوانەیە ئێستا كە ئێرمای خۆشەویستت لە بەرلین لێی ڕاكشا بێت، بیر لە هیچ نەكاتەوە، تەنیا ئارەزووكردنی ئەلفرێدەكەی نەبێت. ئەو، چەند جارێك، دوایین نامەت دەخوێنێتەوە كە تیایدا گوتبووت من زۆر باشم و دڵسۆزم بۆ ئێرماو زۆریش بیری لێ دەكەمەوەو، كەواتە تۆ خەون بەوەوە نابینی كە لووتت یان هەر شتێكی تر لە شتە هەڵخەڵەتێنەرەكانی ناپۆلی بڕەنی. ئنجا ئێرما دلۆپە فرمێسكەك دەسڕێتەوەو ڕێگا بە كابرای گازەوان دەدات كە بڕوات بەبێ ئەوەی هیچ كارێك ئەنجام بدات تەنیا خوێندنەوەی ئامێری پێوانەی گاز نەبێ. ئەمەش ژیانە بۆ ئێرما. هەموو ڕۆژێكیش ئێرما ئەوەی مەبەستییەتی دەستی ناكەوێ،

چونکه فۆهەر ئەمەیانی لێ سەندووەو ڕەوانەی بنی دەریای کردووە، ڕۆژێکیش دێ ئیرما پۆستکارتێکی لە سوپاوە پێ بگات، سادە، کورت، سەربارزانە :

*" ئەتترۆفیزەر ئەلفرێد کونیگ "ی سەر بە بەتالیۆنی (١٦١)ی تۆپخانـە لـە ٣٠ ئەیلولی ١٩٤١دا کوژرا کە پاڵەوانانە لەپێناو فۆهەر و نیشتماندا دەجەنگا.*

لەژێر ئەمەش ئیمزای ناشیرینی نەخوێنراوەی هەندێك ئەفسەری پێوە بێت. لەخوار ئەمەش بەپیتی جوانی ئەڵمانی کۆن کە دەتگوت لە ئینجیلەوە وەرگیراوە نووسرابێت :

فۆهەر سوپاست دەکا – هایل هتلەر

پۆرتا باییێکی گەورەی بەرداو ئەو ڕێکییە خامۆشەی دەوروبەرمانی پشکنی .

– بۆ ماوەی دوو ڕۆژێك ئیرمای بچکۆڵە بەچاوی سوورهەڵگەڕاو دەمێنێتەوە و ئەو کارتەشی لە جانتاکەیدا دەمینێ، هەندێ کەسیش بۆی بەپەرۆش دەبن، بەڵام نەك زۆر کەس، چونکە ئیرما تاکە کەس نییە وای بەسەر هاتبێ و ئەگەر پیاو بۆ هەر هەموویان بەپەرۆش بێ ئەوا وای لێ دێ بارتەقا نەکات، نا، لە کوێ من دەتوانم نیو کیلۆ کەرە بەفرتوفێڵ بەدەستم بخەم ؟ جاری دووەمین گازەوانەکە، کە هاوار دەکا لە خوێندنەوەی گاز پێومەرەکە زیاتری پێدەدرێ و، هەر بەم جۆرە لە دەستدانی ئەلفرێد دەگۆڕێ بۆ شتێکی باش، چونکە ئەلفرێد ساڵی جارێك دەهاتەوە، کە چی گازەوانەکە هەموو چارەکە سەعاتێك دێ و، لەپێناو فۆهەر و نیشتمانیشدا نابێتە قوربانی، چونکە قاچەکانی لە تەختەن .... خوا دەزانی، لەوانەیە ئێمە لە ئەسپانیا کۆتاییمان بێ، ئێستاش شتێکی جوانی پرچ ڕەشی بچکۆڵە خۆی و گوڵە قەنەفلێك لە پشت گوێچکەیەوە، تۆ .....

من تێنوویەتی هەراسانی کردبووم و تەماشام کرد بەردەوامیی پۆرتا لەسەر زشتیی خەریك بوو دەبووە شتێکی وروژێنەر. بەبێزارییەوە پێم گوت: "هەی

بەران، دەمت داخە، چۆن دەتوانی بیر لەکچان بکەیەوە لەکاتێکدا ئێمە وا لێرەدا ڕاکشاوین و ئەوەندە نەماوە لەبەر برسیەتیی و تێنوویەتیی بمرین".

بمرین ؟ تۆ شێتی ؟ هزرت بۆ ئەوە ناچێ کە هێزی شاهانەی ئاسمانی ئیتالیا ئەم بەلەمە لاستیکییە جوانەی پێشکەش بە ئێمە کردووە کە بەهۆیەوە خۆمان دەگەیەنینە ئیسپانیا، بۆ ئەوەی نەمرین ؟ خێرا کەن بە ناوەراستی میدترانەی شاهانەی ئیتالیایی – ئێوە بێ عەقڵینە، لەوانەیە بێتە سوکایەتییەك بۆ پاشای ئیتالیا لێ ڕاکشان و مردن لێرەدا، تێفکرە ئەگەر شایەکان مریشکی وایان هەبوایە کە هێلکەی زێڕیان بۆ بکردبانایە ؟

پۆرتا پانتۆڵەکەی داماڵی و پاشەڵی لەسەر پاشەی بەلەمەکە دانا. ناوبەناو شەپۆلێك بەرز دەبووەوە و شرقەیەکی لە پاشەڵە ڕووتەکەیەوە دەهێنا.

– ئاە، چۆن ختۆکەییکە ! بەڵام کارێکی تەندروستییە، دەبێ بەکاری بهێنیت. لە شێوازەکەی پاشای ئیتالیا تەندروستیترە.

– پۆرتا، تۆ هیچی تر پێکەنین ئاوەرنیت.

چالاکییەکەی، منی سەرسام و ماندوو کردبوو، وەکو دیوارێکی سپی وابوو لەبەر خۆری نیوەڕۆدا. ئێستاش هەر کاتێك هەست بکەم کە حەز دەکەم قوڕگی بگرم چاوەکانی ڕام دەگرن. لەچاوەکانیدا سەرەڕای هەموو ئەو گاڵتە جاڕییە نائومێدییەدا دەتوانم ئەوە بەدی بکەم کە ئێمە هەر لەهەمان باردابووین.

بەڵام لە پاشان هەتا ئەمەش کاری کردە سەر دەمارەکانم و، ئەگەر هەر لە پێش داهاتنی تاریکیی لە دوورەوە پاپۆڕێکمان بەدی نەکردبایە، باوەڕ دەکەم لەو شەوەدا کوێرانە و بەکینەیەکی شێتانەوە پەلاماریم دەدا. هاوارمان کردو دەستمان ڕاوەشاندو ڕۆکێتیشمان تەقاندو، بەم جۆرە ئێمە لەلایەن نافشکەنێکی (مودەمرەییکی) ئیتالیایی هەڵگیراینەوە، بە ئاوی گەرم، چەوری پاپۆڕە نقوم بووەکەمان لەسەرو پرچی خۆمان شوشت. خراینە ناو نوێنێکی

وشك و گەرمەوە، دنیاییێك (سپاگیتی)مان دەرخوارد دراو، دوو لیتره ئارەقی سووورمان بەسەرداکرد، ئنجا وەکو بێ هۆش لێی نووستین. ڕۆژی پاشی کەشتییەوانەکان پێیان ڕاگەیاندین کە ژمارەیەکی باش لە دوو سەرنشینانی کەشتییە سەربازییەکە ڕزگارکراون و هەموویان براون بۆ ناپۆلی، کە ئێمەش هەر بۆ ئەویٚ ڕەوانە دەکرێین. پزیشکی کەشتییەکە هاتە لامان و سەیرێکی کردین، چاك و چۆنی لێکردین و بەبێ ئەوەی هیچ بکات بەجێی هێشتین، ئێمەش دەستمان کرد بە باسکردن لە بارەی ئەوانی ترەوە. پۆرتا بەکەسەرەوە ئاهێکی هەڵکێشا.

– خۆش نییە نامە بۆ هاوسەری پیرەئان بنووسرێت، کە مۆڵەتم هەبوو چووم سەرێکم لێدان و، پیرەئان و هاوسەری و پیرە باوکی و من پێمان وابوو کە لە ماوەی شەش مانگدا لە ماڵ دەبین، چونکە تا ئەو کاتە جەنگ بەسەر دەچێت و ئێمەش دەگەین بە کۆتایی شۆڕش. جەهەننەم ! هیوادارم یانەی پایرەتی شاهانەی سەر بە سپاگیتی خۆرەکان ڕاویان کردبێت و ئێستا لە خانێکی ناپولی لێی پاڵکەوتبێت، ناوو ناوبانگە پاکەکەی خۆی لەگەڵ هاوڕێیەتی سەرخۆشان، قوماربازان و ژنانی فاحشە بزەڕێنێت، بەلام بۆ خاتری خوا ! لەپێناو چی ئێمە لێرەدا لێی پاڵکەوتووین و گریە و زارمانە ؟ بێگومان پیرەئانیان ڕاو کردووە، ئەگەر نا ڕۆمێل لە باکووری ئەفریقیادا چی دەکات ؟ ئەو قەت ناتوانێت بەبێ پیرەئان ئیدارە بکات، هەتا ئەگەر ئێمەش یارمەتی بدەین.

کە گەیشتینە ناپولی پێمان چەقاند و بەداد و بێدادەوە ڕێمان گرت.

– من تۆزقاڵێك باکم نییە کە تۆ مێجەر بیت. ئێمە سەر بە هیچ سوپاییێك نابین تا نەزانین پیرەئان لەکوێیە. بۆ خۆشیی خۆمان نەبوو کە ڕێگەمان دا بەر

تۆرپیدۆ بکەوین و لە پاشاندا لێرە لێی پاڵ کەوین، ئنجا بەبەردەوامیی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ماسییە شارکەکانی دەریای ناوەراست ماچ بکەین، هەروا بۆ ئەوەش نەبوو کە ئێمە بەپێی چەسپیو لێرەدا بوەستین بۆ خاتری لیستەکانی ئازووقەی بۆگەن و وەرگرتەی جل و بەرگەکانت. پیرەئان دۆستی ئێمەیە و تا شتێکی لە بارەیەوە نەزانین تۆ نە مێجەری و نە شتێکی دیکە مادام ئێمە نیگەرانین. ئێمە لێرە دانیشتووین و لە شوێنی خۆمان ناجوڵێین، بۆیێ دەتوانن ئاگر بارانمان بکەن یان بمان خەنە زیندانەوە، یان هەرچییەکی ئێوەی نەفرەتیی پێتان خۆشە.

بەبێ زێدەڕۆیی، سەر و مێشکمان تەواو نەبوو. کاردانەوە بوو. زیاتر بارتەقامان نەدەکرد. خۆشبەختانە هەستیان بەو حاڵەتە کرد کە ئێمەی تێدا بووین و، بەختەوەرانە مێجەریش پیاوێکی هەستیار بوو، هەتا توانی چاکەی لەگەڵدا کردین و ئێمەش کە زانیمان لە کەشتییە سەربازییەکەی تردا بووە و ئەویش بەتەواویی تێوە گلابوو، ئەوەندەی تر ملمان کەچ کرد.

کاتێکیش فیلدوێبلەکە لە عەمباری جل و بەرگدا چاوی پێمان کەوت دەستی بۆ پۆرتا درێژ کردو زەردەخەنەیێکی گەورەی هاتێ. کاتێکیش سەربوردەی ڕزگاربوونی خۆمانمان پێراگەیاند و پرسیمان کە هیچی لە بارەی پیرەئانەوە نەبیستووە، داوای لێکردین چاوێکمان لە شتەکانی خۆمان بێت تا ئەو دەچێت شتێك بەشتێك بکات. لە ئۆفیسە بچووکەکەدا ونبوو، پاش ماوەیەکی کەم هاتەوە دەرێ و داوای لێکردین لەوێ بچینە ژوور و چاوەڕێ بکەین. لە ماوەی دە دەقیقەدا دەنگ و باسمان بۆ دەهێنێت. عارەقی شناپس و جگەرەی پێدراین و داوای لێکردین بەدرێژیی باس لە لەدەستچوونی کەشتییەکان بکەین، بەڵام ئێمە تەنیا شتێکمان پێراگەیاند، چونکە ئێمە زۆر

ئارەزوومەند بووین و وامان دەزانی ئەو دە دەقیقەیە زۆر دەخایەنن تا تەواو دەبن، وات دەهاتە هزر کە پیرەئان لەویٚ بێت بەلاّم ماوەی پێنەدرێت بمانبینێت، هەر جارێکیش تەلەفۆن لێی بدایە بەم شێوەیە خۆی لیٚ دەرباز دەکرد.

" هەلۆ ..... بەلیٚ .....لە کویٚ ..... سوپاس ".

فیلّدوێبلەکە ڕووی لە ئێمە کرد، من تا ئێستاش زەردەخەنەیەکەیم لە بیرە.

– ئەو وا لە یەکێك لە سەربازگەکانی هێزی دەریاییە لەنزیك بەندەرەکەوە.

من هیوادارم کە فیلّدوێبلەکە لەوە گەیشتبێت کە سپلّەیی و دلّڕەقیی نەبوو من و پۆرتای وا لێکرد لە ئۆفیسەکەوە دەرپەڕین بەبیٚ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەین. بەلاّم لە مەیدانی جەنگدا برادەر، گیانداریٚکی زۆر تایبەتە. لە سەرەتادا پیاو لە گۆشەگیرییەکی پڕ لە سەدا، لە تەنیاییەکی دژواردا دەژیت، پاشان برادەرێك دەدۆزیتەوە، بەردەوامیش ئەوە دەزانیت کە ڕەنگبیٚ ئەو برادەرەت لە چرکەی داهاتوودا لەناو بچێت و تۆش دووبارە لەناو سەداو لە گۆشەگیریدا بەبیٚ هیچ شتێك بمێنیتەوە.

ئەو چوار پێنج ڕۆژەی پاشترمان بە سووڕانەوە بەسەربرد بەبیٚ ئەوەی هیچ بکەین. بێگومان، سەرێکمان لە شاری پۆمپی دا و سەرکەوتین بۆ سەر ڤیزۆڤ، کە بەشێوەیێکی سروشتی زارکی گڕکانەکەی قوربانییەکی ئاشکرای ڕەوانبێژیی پۆرتا بوو.

پاشان بەیانییەك لە فڕۆکەی بارهەلّگردا کە پێیان دەگوتن ئەنتیجۆز بار کراین و فڕین، دوازدە فڕۆکە بوون لە شێوەی (V) دەفڕین و بە فڕۆکەی جەنگیی پارێزگاری دەکران. دەریای ناوەڕاست لە دوامانەوە بزر بوو،

لـەخوارەوەش لــە دوورەوە هەنــدێ چـیای ڕەش دیــار بــوون. نــاوە نــاوەش دەریاچـەیەك یـان شـارێكمان دەدیـت. بـەر لـەوەی بگەینـە شـاری (وپرتـال)ی ویـستڤالی كـە شـوێنی مەبەسـت بـوو، دوو جـار نیـشتین، لـەوێش، بـەناو شـاردا بەپێ بەرەو سەربازگەكان چووین لە ئەلبەرفیلد لە دەرەوەی شار. لـەوێ لـە سـێ سرییەدا ڕێكخراینـەوە، كـە ژمارەمـان هـەر بەشـی ئەوەنـدەی دەكـرد. دوای ئەمـە ئێمەیان ناردە بەرەی ڕۆژهەڵاتی جەنگ و خراینە بەتالیۆنی (٢٧)ەمی زرێپۆش.

پیرەئان بێباکانە سەری ڕاوەشاندو گوتی :

- هانز، ساویلکە مەبە، تا ئەو کاتەی تاکە ئەفسەرێک هەبێت کە دڵسۆزی نیزام بێ ئەوا ئێمە هێمنانە، هەنگاو و ئاراستەمان دەپارێزین. تۆ تەنها سەیر بکە کاروبار لە ۱۹۱۸ دا چۆن بەڕێوە دەچوو. هەتا تەواوی شتە خوێناوییەکە نەرما لاوەکان لە مەیدانی جەنگدا شۆڕشیان نەکرد. بەڵام، خوا ئێمە لە شۆڕش بپارێزێت. شتێکی بێ سوود، بێ ئامانج و گەمژەییە. نەخێر، کوڕی خۆم، ئەڵمانە سۆسەج خۆرە بچکۆڵەکە ئەوەندە لە هەموو شتێک تۆقیوە کە جەسارەتی بیرکردنەوە ناکات و، ئێوەش شۆڕش لە دژی پیاوانی تۆقیو مەکەن، ئەوانەی بێزیان لە هەموو شتێکی بەهێز دەبێتەوە. کارەکەش وا کۆتایی پێهات کە دەبوایە وا بێت: زیرەکەکان خۆیان و دەستکەوتەکانیان تێیان تەقاندو سەگە زلەکانیش وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون و، ئەمڕۆش وا لێرە دووبارە پشتی ئێمەو قامچی ئەوانە. من گومانم لەوەدا نییە کە تەواوی شتە خوێناوییەکە دووبارە بەرەو ڕمان دەچێت، بەڵام ڕەنگبێ تۆ ناوم بنێی ئەدۆلف ئەگەر ئەمە ببێتە هۆکاری شۆڕش. هەر هەمان چیرۆکە خوێناوییەکە جارێکی تر دووبارە دەبێتەوە. زیرەکەکان بە ئارەزووەکانی خۆیان دەگەن و هەرکە کاتێکی گونجاویش بەسەر دەچێ ئەو کاتە دووبارە پارمەتی سەگە زلەکان دەدەنەوەو قامچی تازەو جوانیان دەخەنەوە چنگ و ئنجا دووبارە پشتی ئێمەو قامچی ئەوان. تا ئەو کاتەی هاونیشتمانییە زۆر بەڕێزەکانم نەگەنە دۆزینەوەی هەموو شتێک لە بارەیانەوە من هیچ باوەڕێکم پێیان نابێت. هتلەر و دارو دەستەکەی، بێگومان، دەکوژرێن. تا زووتریش بێت باشترە، بەڵام ئەوان چین تەنیا چەند بووکە شووشەیێکی پیس نەبن ؟ ئێوەش ئەگەر هەر بووکە شووشەکان وردو خاش بکەن و ڕێگە بەهەڵسوڕێنەرەکە بدەن بۆ خۆی لەگەڵ دەستکەوتەکانیدا ڕابکات ئەوە شۆڕش کردن نییە.

پیرەئان لە ۱۹٤۱ دا ئاوەها بوو

# سێ کچ

لەنــاو ئـەو هـەموو پـیـاوە تــازانەی کـە بـۆ پڕکـردنـەوەی سـرییەکەمـان هاتبوون، برادەرێکی تـازەم دۆزییەوە، هانز برور کە کاتی خۆی لە دۆسلدورف لیفتنـانتی پـۆلیس بـوو، بـەڵام لەبەرئـەوەی ڕازی نـەبوو بـوو خــۆی بـۆ (SS) ببەخـشێت، بـەپێی ئـەو فەرمانـەی کـە هتلـەر دابـووی و کـە دەبوایـە هــەموو پۆلیسەکان وابکەن. ئەو دڵنیا لەوەی کە ئەڵمانیا بەم زووانە جەنگ دەدۆڕێنـێ، چونکە لە براکەیەوە زانی بووی، کە لـە وەزارەتـی پڕوپاگەندەی گۆبلزدا ئیشی دەکرد، کە نازیزم لەسەر لێواری ئیفلاس کردنە.

نازییـەکان پـشتیان بـە زیـاتر لـە بەشـێکی کـەم لـە هێـزە چـەکدارەکان نەدەبەسـت و، تــەنیا هــەر مەسـەلەی کـاتیش بــوو بەرلـەوەی جەنەڕاڵـەکان حیساباتی خۆیـان لەگـەڵ هتلـەر و داروودەسـتە شێتەکەی یـەکلا بکەنـەوە. من و هـانز پێکـەوە چـەند جارێك باسمـان لـە دووبـارە فیلارکـردن کـرد، بـەڵام پیرەئـان ئامۆژگاری ئەوەی کردین کە هەوڵی وانەدەین.

– لە هەزاران یەك لێی دەرباز نـابێ، ئەگـەر بشتان گرن ئـەوا چاك دەیخۆن. زۆر باشترە برینـدار ببن، بەڵام بـۆ خـاتری خـوا بـە ئەنقەسـت خـۆتـان برینـدار مەکـەن، چونکە زۆر چاك دەتـان پشکنن بـۆ ئـەوەی بزانن برینـەکـە دەسـتکردی خـۆتـانـە، ئەوەشتان لە بیر بێ کە هەمیشە هەندێك پیسی لەناو برینەکەدا بـەجێ دەمێنـێ، ئەگـەر خـۆت دەمانـچەیەك لـە باسـکت یـان لـەلاقت بـدەی و ئەگـەر ئـەوەت لـێ ئاشـکرا ببـێ، ئـەوا تـووش دەبـی. تیفـۆس و کـۆلێرا باشـترێکن، نـاتوانن لەگـەڵ

ئەمانـەدا هـیچ بکـەن، سـیفلس بـاش نییـە، فڕێـت دەدەنـە نەخۆشـخانە و دوای چوارده شەو دووباره دەرت دەکەن، پاش ئەوەی ڕەفتارێکی وات لەگەڵدا دەکـەن کە هـەرگیز لـە یادت نەچێت. خۆت لـە نەخۆشـی (VD) بپارێزە چونکە ئەگـەر لێـت پـیس بکـا ئـەوا بەزینـدوویی شـتێکی تیـژت لێـدەدەن. هەنـدێ کـەس لـەو پترۆلە دەخۆنەوە کە بۆ تانکەکانمان بەکاری دەهێنین، ئەمـەیان شـتێکی تـەواو چاکە، تووشـی جـۆرە تاعوونێکت دەکا کـە چـوار پێـنج مـانگ پێیـەوە دەنـاڵی ئەگەر شێوازەکەی بزانی، یـان دەتـوانی سـیگارێك بـەناو پـایپێکی بەکارهاتوودا ڕابکێشی ئنجا بیخۆی، ئەمەشیان زۆر باشە، تووشـی تایپێکی چاکت دەکا بـەڵام ئەوەندە زۆر ناخایێنێ و، دەبێ تۆ شووشەیێك پترۆل و هەگبەیەك کلۆشـەکر بـە قاچـاغ لەگـەڵ خۆتـدا ببەیتـە نەخۆشـخانە و ڕۆژانـە کلـۆ شـەکرێکی لـە پـترۆل هەڵێنراو بخۆیت، کە ئەمە پلەی گەرمیت لە (٣٩) پلەی سەدیی ڕادەگرێت، بەڵام نابێت ماوەیان پێبدەیت بتگرن ئەگینا بەتاوانی (دابەزاندنی ئارەزوومەنـدیی بـۆ جـەنگ کـردن) دەیخۆیـت، ئەگـەر بتـوانی سـەد دوو سـەد جگەرەیـەك بدەیتـە نەخۆشـەوانێکی نەخۆشـخانەکە ئـەوا دەتوانێـت قاچـێکی خۆرکاویـت بـۆ ڕێکبخات، ئنجا قاچێکت لە دەست دەچێت و جەنگیش بەسەر دەچێت، تا ئـەو شوێنەی پەیوەندی بە تۆوە هەیە. هەروا دەتوانیت ئاوی بە تیفۆس ئالوودەبوو بخۆیتـەوە. بـەڵام هەمیـشە کۆسـپ لەبـەردەم ئـەم جـۆرە فـێڵ و زۆربـەی بەندوباوەکانی تردا هەیە، ئەوانە یان کارت تێناکـەن - پۆرتـا هـەموویانی تاقی کردووەتـەوە و، تەنانـەت گۆشـت سـەگی پـڕ لـە کرمیشی خـواردووە، بـەڵام بـۆ پۆرتا ئەم جۆرە شتانە زیاتر دەبوونـە مایەی لەش ساخیی - یانیش تووشـی ئیفلیجیـت دەکـەن، یـان لـە گۆڕسـتاندا خـۆت دەبینییـەوە، زۆر کـەس وایـان کردووە.

لە ڕۆژی یەکشەممەی، ڕێکەوتی (١٢)ی ئۆکتۆبەر شەمەندەفەرەکەمان لە بریسلاو لە سنووری پۆڵەندا پەڕییەوە. لە کاتێکدا لە وێستگەی شتومەکدا وەستابووین لە چەستۆچۆوا، زەخیرەی فریا کەوتنمان پێدرا. هەر بڕێك لەو زەخیرەیە قووتوێك گۆشت و سەوزەی تێدا بوو، هەندێك پسکویت و نیو شووشە شەرابی ڕەم. فەرمانی توندمان پێدرا بوو کە نابێ دەستکاری ئەو زەخیرەیە بکەین تا پێمان نەگوترێت و، سەرەڕای هەمووش، نەدەبایە شەڕابەکە پێشوەخت بخورێتەوە.

جا لەبەرئەوەی سوپا مەیلی ڕازاندنەوەی شتی پڕو پوچی هەبوو، بۆیە ناوی لەو زەخیرەیە نابوو (توێشووی ئاسنین).

یەکەم شتێك کە پۆرتا کردی، بێگومان، ئەوە بوو بەشە ڕەمەکەی خۆی خواردەوە. شووشەکە، لێوەکانی جێنەهێشت تا تۆزی تێدا نەما. ئنجا شووشەکەی لەسەر شانەکانییەوە وا تێهەڵدا کە بەجوولەیێکی نەرم لە ئاسماندا فڕی، مڵچەی لە لێوەکانییەوە هێناو خۆی بەسەر ئەو پووش و پەڵاشەدا دادا کە زەوی کامیۆنەکەی داپۆشیبوو. پێش ئەوەی خەویشی لێبکەوێت باییێکی بەرداو گوتی: " کوڕینە، بۆن کەن، ڤیتامین لە هەوادا هەیە ".

پاش دوو سەعاتی ڕێك، پۆرتا بێدار بۆوە، خۆی تێهەڵدا و لێی ڕاکشا و ئنجا هاوڕێ لەگەڵ سەرسامیی ئێمە شووشە (ڕەم)ێکی تری لە هەگبەکەی دەرهێناو بەسیماییێکی کامەرانەوە فڕی کرد. پاشان داوای کاغەزی یاری کردو وای کرد یاری (vingt–et–un ، بیست و یەکی) لەگەڵدا بکەین، کاروبار بەجوانیی بەڕێوەچوو هەتا کەسێك لە دەرەوە. بانگی کرد :

– ئۆبەرگریفتەر پۆرتا، وەرە دەرەوە ! .

پۆرتا، بێ باکانە لە شوێنی خۆی مایەوە.

– پۆرتا نیازت نییە هەر ئێستا بێیە دەرەوە ! .

پۆرتا تەنانەت تەماشای دەرگاشی نەکرد، کە هاواری کرد :
- دەمت داخە، هەی بەرازەوانی پیێ پان، ئەگەر منت دەویێ، هەی سەرشێواوی گەمژە، وەرە ژووریێ بۆ ئێرە، بەڵام پێش ئەوەی بێیتە ژوور لەبیرت نەچیێ پێیە قوڕاوییەکانت پاك بکەیتەوە، جارێکی تریش کە بانگم دەکەی پێم بڵیێ: " هێر ئۆبەرگریفتەر پۆرتا، لە بیرت نەچیێ. هەی ئەسپێیونی لووتی، تۆ لە سەربازگەنیت لەناو وڵات ".
بێدەنگییەکی مردووانە بەدوای ئەم سڵاوەدا هات. پاشان تەواویی کامیۆنەکە دایانە قاقای پێکەنین. کە پێکەنینەکە کپ بوویەوە، هاوارێك لە دەرەوە هەڵستا:
- پۆرتا، ئەگەر هەر ئێستا دەرنەچیتە ئێرە، ئەوا لەبەردەم ئەنجومەنی سەربازیی دادگایی دەکرێی.
پۆرتا سەیرێکی ئێمەی کرد و چرپاندی " کوڕینە، من وا دەزانم ئەوە هاوتپمان میرە، ئێستا کە پۆرتا دەیخوات ".
خۆی لە کامیۆنەکە فڕیێ دا و هەردوو پاشنەکانی لەبەردەم (میر)ی پڵنگ ئاسا لێکدان کە لەوێدا بەقاچی کراوەو دەست لە کەمەرو دەم و چاوی ژاکاو لەبەر توڕەیی، وەستا بوو.
- ئا بەم جۆرە جەنابت تەشریفت هێنا، ئەی هێر ئۆبەرگریفتەر ! بزانە چۆن نامەردێکی پیسی وەکو تۆ فێری گوێرایەڵیی فەرمانەکان دەکەم. بۆ خاتری خوا چۆن وێرات بەمن بڵێی بەرازەوان و ئەسپیۆنی لووتی ؟ چی ؟ کوڕە، بەئاگادارییەوە بوەستە ئەگینا سەرت پان دەکەمەوە. تۆ شێت بووی ؟ چی وای لێکردی سوکایەتی بە ئەفسەرێك بکەی ؟ بۆ خاتری خوا ئەمە چییە ؟ کوڕە ! تۆ لە بۆنی عارەقدا بۆگەنی بوویت ! تۆ سەرخۆشی. تازە. دیارە دەستت لە

تویشووه ئاسنینەکەت داوە، وا نییە ؟ دەزانی ئەمە چییە ؟ ئەمە سەرپێچی کردنە ! بەو خوایە لە پای ئەمەدا سزات دەدەم ! .

پۆرتا وەڵامی نەداوە، لە حاڵەتی ئاگاداریی وەستاو بەشێوەیەکی نائاسایی عەقڵی شێوا بوو. لەکۆتاییدا (میر) ئارامی لێ بڕا :

– وەڵام دەوە هەی فاسقی پیس ! تۆ شەڕابی (ڕەم)ت خواردبووەوە ؟

– بەڵێ، هێر هاوتپمان، بەڵام تەنها شتێکی کەم بوو لەوەی من لە هی خۆمانم کرد ئەگینا ئەوی تر لەو چایە خۆشمەزەی ناشناڵ سۆسیالیستی ئیرساتز بوو. بەڵام ئەوەی هێر کوچەنتیروفیزەر لەو سەردەمەی لە فەرەنسا دەجەنگاین پێیدام، ڕەم بوو. من دەتوانم بەتەواویی داوا لە هێر هاوتپمان بکەم کە تاقی بکاتەوە. ئەو، ئەو چایە ئیرساتزە نایابەی کە فۆهەری خۆشەویست بە ئێمەی دابوو، وا لێدەکا کە نایابتر بێت.

– کوڕە ! بۆ خاتری خوا، ئەوە دەتەوێ گاڵتەم پێ بکەی ؟ ڕێگەم بدە با ئەو (ڕەم)ە ببینم کە لەگەڵ زەخیرەکەتدا پێت درابوو.

بۆ ئەم مەبەستە، پۆرتا شووشە (ڕەم)ێکی لە یەکێك لەو گیرفانە زۆرانەیدا دەرهێنا و، بەزەردەخەنەیێکەوە دایە بەر ڕووناکی تاکو هاوپتمانی سەرسام بیبینێ کە پڕە.

هەندێ موخبیر ڕەنگبێ بە(میر)یان ڕاگەیاندبێ کە پۆرتا شووشە (ڕەم)ەکەی خواردۆتەوە، لەڕاستیدا لە پاشان زانیمان کە (میر) بەڵێنی بەگریفتەرێك دابوو زیادە پشوویەکی چواردە ڕۆژیی پێ بدا ئەگەر بەڵگەی وابێنێتەوە کە بتوانێ بەهۆیانەوە پۆرتا دەسگیر بکا.

پۆرتا زۆر بەنەرمی و بەگوێدێرییەوە گوتی: " تێگەیشتم، دیارە هێر هاوپتمان وا دەزانێ کە من بەو هەموو شتانەی هەر ئێستا دەرم بڕین مەبەستم

هێر هاوپتمان خۆی بووە، بەڵام قەت ئەوە بەمێشکی مندا ناچێت کە شتێکی وا بە هێر هاوپتمانی خۆم و بەفەرماندەی خۆشەویستی سرییە بڵێم، من وام دەزانی ئەوەی بەڕوویدا دەم هاڕاند ئەنتیرۆفیزەر فلیشمان بوو، باوکی ئەسپیۆن بوو، ئەویش وەکو دەبینین لەوییەوە بۆی هاتووە.

مێر، وەك عادەتیی، خۆی هەڵخەڵەتاند بەوەی کە بە دوای فلیشمانی نارد، ئەویش بەدەم و چاوێکی پڕ وقارەوە پێی ڕاگەیاند کە خۆی و پۆرتا گرەوێکیان کردووە لەسەر ئەوەی کامیان باشتر جنێو دەدات. هەروەها گوتیشی کە ڕاستە ئەو ئەسپیۆنەو، تەواویی بنەماڵەکەیان ئەسپێیان لە باوکیانەوە بۆ ماوەتەوە، ئەو ئەسپێیە لە جەنگی ساڵانی ١٩١٤ – ١٩١٨ ڕەگی تیایاندا داکوتاوە کاتێ باوکی لە ڤێردون دەجەنگی.

پاش نیوەڕۆیەکیان، کاتێك لە دووڕیانێکی هێڵی ئاسنی نێوان کلسۆو چیشتوچاوا بووین پۆرتا گوتی: " کوڕینە، وا ماوەی چەند حەفتەیەکە ئێمە لەم ژووره شاهانەیەدا دەژین و، تا ئێستاش ئێمە نازانین چی لە پشت ئەم دەرگایەوە هەیە ".

دەرگاکە بریتی بوو لەو دەرگا سلایدەی کە دەکەوتە دەستە چەپی کامیۆنەکەمان، چەند لەمێژە تەنیا هەر ئەو دەرگایەی لایەکەی ترمان کردووەتەوە.

پۆرتا لەسەری ڕۆیشت و ئاماژەی بۆ دەرگای دەستە ڕاست کرد، کە کراوە بوو، گوتی: " ئێمە دەزانین کە لە دەرەوەی ئەم دەرگایە پۆڵەندامان هەیە، ئێمە ئەمە دەزانین، بەڵام چ نهێنی گەورە لێرەدا خۆیان مەڵاس داوە " دەستی بۆ دەرگا داخراوەکەی تر درێژ کرد " ئێمە نازانین لەوانەیە لە پشتییەوە – لێرەدا دەرگاکەی بەدەستی گرت – خودی سەرکەوتن هەبێت، کە ڕەنگبێ لێرە

بێت یان لەوێ، ئەدی فۆهەر خۆی نەی فەرموو سەرکەوتن هەر هی ئێمەیە ؟ یان لەوانەیە شتێکی تەنانەت باشتریش هەبێت - ڕەنگبێ لە پشت ئەم دەرگا نهێنییە قەت نەکراوەیەدا - لێرەدا دەنگی نەماو پستەی لێوە هات - " کۆمەڵێکی تەواو لە خۆشەویستانی لەوێ ڕاوەستا بن ....... ".
بەسەر وەشاندنێکی بێ وێنە کە لە هی سەوداگەران دەچوو دەرگاکەی کردەوە.

وەکو زۆربەمان ئەویش حەپەسا، چونکە لە ڕاستیدا سێ ژنی لاو لەوێ بوون، وەستا بوون و تەماشای شەمەندەفەرەکەیان دەکرد بە بێباکییەوە پێمان دەخەنین. بۆ سەرباز، ژن ئافەریدەیێکی بەرزی ئاڵۆزاوییە، ئامانجێکی ڕۆمانسیی دوورە دەستی بڵندە بۆ ورووژاندنی هەموو ئارەزووە تێر نەبووەکانی کە لە خەونی تەنیایی ژیانی لە دەستچووی ئاسایی مەدەنیدا دێتە هزرو بیرەوە. ئەوەندە دوورە دەڵێی بووەتە شتێکی ناڕاستەقینە و ترساو بەهۆی خۆپەسندیی و لاف لێدانی ژیانی سەربازییەوەو لە هەمان کاتیشدا بووەتە مەبەستێك بۆ شەهوەت ئەنگێزیی کەڵەکەبووی پیاوی بێ ژن. سەرباز ئافەریدەیێکە لەناو بەدلە دایە. یەکێکە لە دەستەیەك، لەناو هاوشێوەی خۆیدا، جا لەبەرئەوە دەوێرێت گوزارشت لە هزرە سێکسییەکانی خۆی بداتەوە، لە شتی وا کە لەو کاتەی ژیانێکی ئاسایی لەناو خەڵکی تردا بەسەر دەبرد قەت بە دەمیدا نەدەهات. بەدلەکەی بەری پێناسەکەی دەپارێزێت، ئەو ڕێگە بەخۆی دەدات کە بەشێوازە سادەکەی خۆی دەوری ڕێگر بگێڕێت. ئەو بۆ خۆی کۆمەڵێکی تەواوە، ئەمەش پشتیوانێکی پێ دەبەخشێت.
هەموومان پێکەوە بازماندایە دەرەوەو، خۆمان لە سەرسامترین بێ شەرمیی ڕەها کرد. بەم کردەوەیەشمان مەبەستمان ئازاردان نەبوو، هیچ ئارەزوویەکمان نەبوو کە ئەو کچانە بریندار بکەین، من ئەوەشم دەزانی کە ژنان

تێبینییەکانی کۆمەڵە سەربازێکی زۆر بە هەند هەڵناگرن، کاتێکیش تەنانەت قسەکانی پۆرتا بەکۆتا هاتن زۆربەیان سەرکەوتنەوە ناو کامیۆنەکە، چونکە زۆر سارد بوو، بەڵام پۆرتا و پلۆتۆ و هانز و من نەمان توانی دوور بکەوینەوە، تەماشای کچەکانمان کرد و ئەوانیش تەماشایان کردین, هەر تەنیا ئەو کاتەش هەستمان بە ڕواڵەتە نا ئاساییەکەی هەڵوێستەکە کەوت، کە بێگومان ئێمە بەدرێژایی ئەو کاتە ئاگاداریمان لێیەوە هەبوو، بەڵام ئەو سەرسامییە زۆرەی لە ئەنجامی دیتنی ئەو ژنانە تووشمان هات، کە هەرگیز هزرمان بۆی نەدەچوو، هەموو بیرۆکەیێکی تری لەمێشکی ئێمەدا سڕییەوە .

هەر سێ ژنەکە جلکی خەت خەتی زیندانیان لەبەر بوو، پەرژینە تێلدڕێکی نۆ پێ درێژ لە نێوان ئێمە و ئەواندا هەبوو.

ئەوانە لە سەربازگەی گرتندا زیندانیی بوون. پێیان گوتین کە هەر سێکیان لە فەرەنساوە هاتوون و ئەوە چواردە مانگی ڕەبەقە لەم سەربازگەیە بەسەر دەبەن. یەکێکیان جوولەکە بوو. کە زانییان ئێمە دەچین بۆ ڕووسیا، داوایان لێکردین لەگەڵ خۆماندا بیان بەین، بێگومان ئەمەیان وەکو نوکتەیەك گوت.

هانز وەڵامی دانەوە " کچینە، ئەمە ناکرێت، گۆستابۆ تیربارانمان دەکات ".

یەك لەوان، کچێکی درێژی، پرچ جوانی، چاو زیرەکانە، بەتیزەوە گوتی :

– ئێوە دەترسن ؟ بیسەلمێنن کە پیاون !.

لەناکاو، بێ ئەوەی هیچ یەکێکمان لە ڕاستیدا ئەمەی بوێت، هەستمان کرد کە خەریکە داواکەیان بەجدی وەردەگرین.

هانز بە تووڕەییەوە گوتی: " باشترە بڕۆین، ئەگەر (SS) ئەم کچانە ببینن وەستاون و لەگەڵ ئێمەدا دەئاخڤن ئەوەندەیان لێدەدەن تا پەکیان دەخەن. من ئەوە دەزانم چونکە پۆلیس بووم ".

پۆرتا گوتی: " دەمێنینەوە تا بۆمان دەرەخسێ بڕۆین ".
هانز گوتی: بەڵێ، بەڵام نابێ ئێمەش ملمان بشکێنین " بەشەوقەوە تەماشای ڕاست و چەپی کرد دەتگوت پاسەوانێك دەبینێ.
شتێك لە ئاخافتنەکانیدا هەبوو، بەوەستانیشمان لەوێ کچەکانمان دەخستەسەر ئەگەری لێپرسینەوەی توند بە ترسناکترین شێواز بە دوو دڵییەوە سەیرمان دەکردن. ئەوانیش بە ئارامییەوە تەماشای ئێمەیان دەکرد.
پلۆتۆ گوتی: " هەرچی دەبێ ببێ ! پێویستە لەگەڵ خۆمانیان ببەین".
سەیرکەن، ئەم منداڵە بەستەزمانانە چەند لاوازن.
منیش گوتم : " بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، شیرینن".
هیچ شتێك نەبوو بەرگەی زەردەخەنە دۆستانەکانیان بگرێت. هەندێ جگەرەمان بۆ فڕێ دان. ئنجا بەبێچارەو بە دڵی پڕ لە ڕق و کینەوە بەرامبەر ئەوانەی ئەو سێ کچەیان زیندانی کردبوو، لەوێ وەستاین.
پیرەئان کە لەو کاتە لەبەر هەر هۆیەك بووبێ لەگەڵ (ئاسمۆس)دا لەژێر کامیۆنەکەوە بەخشین هاتن، گوتی: " هیچ شوێنی دوو دڵی نییە ".
" ئایا لەگەڵمان دێن یان نا ؟ ئەگەر بێن، دەبێ هەر ئێستا بێت " .
پیرەئان دان بە خۆداگربوو، خێراش بوو وەك بروسك، بەر لەوەی بزانین چی دەکەین، لە تەنیشت یەك لە کۆڵەکەکاندا هەرەمێکمان پێك هێنا و، پیرەئان لەسەر شانی (پلۆتۆ) و (ئاسمۆس)دا ڕاوەستا، پشتێندەکانمان لێك گرێدان و بۆ کچەکانمان شۆڕکردەوەو یەك لە دوای یەك ڕاکێشران، کە لەسەرەوە بەیارمەتی پیرەئان ڕاکێشانەکە کراو، هانزو، پۆرتاو، منیش کە دەکەوتن، دەمانگرتنەوە. لەپاشان ئاسمۆس و هانزو پلۆتۆ سەرکەوتنەوە ناو کامیۆنەکەو هەرچی کەسانێك کە لەوێدا نەدەژیان دەریان کردن و دەرگاشیان داخست، بەم جۆرە کەس نەیدیت کچەکان سەرکامیۆنەکە دەکەون.

بە دڵە کوتەوە تەماشای هەر سێ کچە بێ نەوایەکانمان کرد. خۆمان تووشی چی کرد ؟ ڕەنگبێ ئەمە ترسناکترین شت بێت کە بیرمان لێ کردبێتەوە. شتێك سەرسوڕماوی کردین. دەتوانین ئێمە وشەیەکی گەورە بەکاربێنین و ناوی بنێین ژیان ؟ لە هەموو بارێکدا، ترساو تا مردن لەبەر ئەو کارە ترسناکەی کە خۆمان تێ گلاند، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شانازو دلشاد بووین. هەستمان بەو خۆشییە زلە کرد کە مرۆڤ تووشی دێ کاتێك دەبینی توانای ئەوەی هەیە کە سەرکەوتوو بێ، شتی زۆر، زۆرتر بکا لەوەی کە توانای کردنی هەبێ، من هیوادارم کە توانیبێتم ئەمە بەچاکی دەربڕم، بێ ئەوەی خۆمی پێ هەڵکێشم کە ئەمەیان بەئاسانی، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کاتێك قسە لەسەر کردەوەی پاڵەوانانە دەکرێت من هەمیشە ئەم هەڵکەوتە وەکو سەنگی مەحەك بەکاردێنم بۆ ئەو شتەی کە لەڕاستیدا کارێکی پاڵەوانانەیە یان پاڵەوانانە نییەو، ئا بەم پێوانەیە گەلێك کرداری خۆهەڵکێشانە هەن، کە من ناتوانم، لەگەڵ هەموو ویستە باشەکانی دنیادا، بەهۆیانەوە هەست بەهیچ پەسندییەك بکەم.

ئەمە بۆنەیەك بوو کە تیایدا هاوڕێیەتی سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر تاکایەتیدا وەدەست هێنا.

پیرەئان گوتی: "بەڵام بۆ ڕەفتارکردنی عەمەلی لەگەڵ شتەکاندا، مادام ئێمە لە دڵخۆشییە پیلانگێڕییە هەناسە برکێیەکەماندا چاك بووینەوە. ئەوان ناتوانن بە جل و بەرگی خەت خەتی زیندان بگەڕێن، پێویستە پۆشاکی تریان پێ بدەین. کوڕینە ئەوەی هەتانە پێشکەشی کەن، بەبێ دوو دڵیی !

لە ساتێکدا چل پرێسکە کەوتنە گوڕێ، گۆریەو، پانتۆڵ و، بلووزو، کراس و، چنراوی لۆکەو، کڵاوو، پێڵاو پێشکەش بەو کچانە کران بۆ ئەوەی لێیان هەڵبژێرن.

کاتێك کچەکان هێمنانە جلکەکانیان لەسەر لەشە ڕووتەکانیان داماڵی چل سەربازی زشت سەریان وەرگێڕاو بەبێ دەنگیی تەماشای لایەکی تریان کرد. خوا دەیزانێ، ئێمە تا ڕادەیەك کۆمەڵە گەندە مرۆڤێکی نادروست بووین. من پێم وایە شارستانییەت بوو وای لە ئێمە کرد کە وەکو هەین وابین، بۆیە لێرەدا نموونەیەك هەیە لەسەر ئەوەی کە بۆ نابێ ئێمە زۆر بەدبین بین بەرامبەر بە توێکڵی شارستانیەت کە ئەوەندە تەنکە، لەگەڵ ئەو ڕاستییەشدا کە پێی وایە شتەکە بەو جۆرەیە کە چی تا ئێستاش هەلێك بە لەدایکبوونێکی سرووشتی دەدات بۆ ئەوەی خۆی بسەپێنێت. نەك تەنیا هەر شپرزەیی بوو وای لە ئێمە کرد کە ڕێگە بدەین ئەو کچانە بە ئاسوودەیی جلەکانیان بگۆڕن، بەڵکو لەهەمان کاتیشدا خۆ نیشاندانێك بوو دژ بە پاسەوانەکان، ئەوانەی بۆ ماوەی چوارده مانگ، هەموو ئەوەی پێی دەڵێن شایستەیی مرۆڤایەتی خستبوویانە ژێر گاڵتە پێکردن و پێشێلکردنی خۆیانەوە. ئێمە ویستمان ئەوە نیشانی ئەو کچە جوانانە بدەین کە تا ئێستاش ڕێزگرتن لە هەستیان، لە شەرم و حەیا و لە مرۆڤایەتی هەر ماون، هەر چەندە ئێمە کۆمەڵێك سەربازی ناپاك و زشت بووین.

کچەکانمان لە پشت کۆمەڵە هەگبەییێکی کەڵەکەبوو شاردەوە، ئنجا پیرەئان و پۆرتا و من چووینە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانین لە کامپدا ئاگادار کردنەوە لێدراوە، لەکاتێکدا ئەوانی تر لەناو دەرگا کراوەکەدا دانیشتن تاکو نەهێڵن ئەوانەی لە کامیۆنەکەی ئێمەدا ئیشیان نییە بێنە ژوورەوە.

شەمەندەفەرەکەمان بەر لەوەی ڕاکردنەکە ئاشکرا بێت ئەوێی جێهێشت. باشترین شتێك کە هەمان بوو بەو سێ کچەمان دا، گەورەترینیان ڕۆزیتا بوو، مامۆستای مۆسیقا بوو. پۆرتا پارێزەری تایبەتی ئەو بوو، هیچ شتێکی لە بارەی هۆکاری ناردنی بۆ ئەم کامپە نەدرکاند.

جینی تەنیا بیست و یەك ساڵە لە هەموویان گەنجتر بوو، لە سۆربۆن بوو، هەردوو براکەشی لە سوپادا لیفتنانت بوون و ئێستاش هەردووکیان دیلی جەنگن. باوکیشی لەلایەن ئەڵمانەکانەوە داوا کرابوو، بۆیە جین لەلایەن گۆستابۆوە بە بارمتە گیرابوو.

مارییای جوولەکەش، ئێوارەیێك لەسەر شەقامدا گیرابوو، بەبێ پشکنین و لێپێچانەوە ناردبوویانە کامپ لە پۆلەندا. مارییا خێزانی کابرایێکی کاسبکار بوو لە شاری لیۆن و کورێکی تەمەن دوو ساڵ و نیوی هەبوو. سێ مانگ دوای گەیشتنی بۆ سەربازگەی گرتن کوڕێکی تری بوو بەڵام پاش دوو حەفتە منداڵەکە مرد.

دوای پێنج ڕۆژ مانەوەیان لای ئێمە هەر چلمان ئاساییانە بە نائومێدییەوە کەوتینە داوی خۆشەویستی هەر سێکییان و، زیاتر وەکو کەسانێك کە هێلانەییێکی پڕ لە بێچوە باڵندەی دۆزیبێتەوە، نەماندەزانی چییان لێبکەین. بەردەوام گفتوگۆمان لەم بارەیەوە دەکرد و سەیرترین و ناعەمەلیترین پێشنیارمان دەخستە ڕوو. هەر چۆنێك بێت، گەیشتینە ئەوەی کە لە هیچ بارودۆخێکدا ئەوانە لەگەڵماندا یەکسەر نایەن بۆ بەرەی جەنگ بۆ ئەوەی لەوێ هەلێك بۆ ڕاکردن بەرەو ڕووسیا بدۆزنەوە. ئەمەیان هەندێکی لەبەرئەوە بوو، وەکو زۆربەمان وای بۆ دەچووین، ئەگەر ئەمانە لە بەد بەختی خۆیانەوە بە ناوچەیەکدا گوزەر بکەن کە لەلایەن هەندێ کەسی ساویلکەی دوورنشینی ئاسیاییەوە پاسەوانی لێدەکرێت ئەو کاتە هەر یەکسەر لەلایەن ئەو کەسانەوە دەستدرێژی سێکسییان دەکرێتە سەر.

براکەی فلیشمان بوو کە گرفتەکەی بۆ چارەسەرکردین. ڕۆژێکیان بە ڕاکردنەوە هات و پێی ڕاگەیاندین کە براکەی لە یەك لە شەمەندەفەرە زرێپۆشەکاندا پلەی ئۆبەرفێلدویبلی هەیە و شەمەندەفەرەکەش لە هێڵە

ئاسنێکی لا بەلای نزیك ئێرەوە وەستاوە. شەمەندەفەڕەکە بەرەو فەڕەنسا دەچێت و کچەکان دەتوانن لەگەڵیدا بچن. ئێمە پەلەمان کرد لە ئامادە کردنیان بۆ ئەم سەفەرە. ئەوان ڕاستەوخۆ نەیان زانی نیاز وایە چییان لێبکرێت بەڵام بیریان بۆ ئەوە چوو کە گۆستابۆ خۆیان کوتاوەتە ناو شەمەندەفەڕەکەوە، لە ئەنجامیشدا مارییا دەستی کردبوو بە گریان، بەڵام پۆرتا بەتوڕەییەوە گوتی :

– مارییای بچکۆڵە، هێمن بە، ئێوە بەرەو تۆپخانەی قورس دەچن. ئێوە بە شەمەنەفەڕێکی زرێپۆش یەکسەر بۆ فەڕەنسا دەچن. براکەی فلیشمان ئەوەی بۆ ڕێکخستوون.

بەسەر ژمارەیەکی بێ کۆتایی هێڵی ئاسنین پێچمان کردەوە، چەندین جار کچە ترساوەکانمان هەڵدەگرت بۆ ئەوەی دووریان بخەینەوە. لەدواییدا خۆمان لەبەردەم شەمەندەفەڕە زرێپۆشە مەزنەکەدا دیتەوە کە تۆپە گەورەکانی بەهەڕەشەوە ڕوویان لە ئاسمان کردبوو. کاتێ گەیشتینە ئەوێ، براکەی فلیشمان هەموو شتێکی ئامادە کردبوو، تەنانەت دوو کەسیشی وەکو پاسەوان دانا بوون. کە تەوقەی لەگەڵ کچەکاندا کرد عەبووسانە زەردەخەنەی هاتێ.

– خێرا کەن بچنە ژوورەوە، چاو لەدەری نەکەن، هەر لە شوێنی خەوتندا بمێننەوە، هەرچی پێویستتانە بۆتانی دەهێنین، بەهەمووتان یەك لە قەریۆڵە بڵندەکان بەکار بێنن، کچینە، ئێمە دووبارە ماڵێکی پڕ لە ئارامیتان بۆ دابین دەکەین، دێ بینن.

بڵندمان کردنە ناو کامیۆنەکە و خۆشمان سەرکەوتین بۆ ئەوەی بزانین لە کوێدا دەژین. شوێن خەوتنێکی بڵندیان لە کۆتایی هەرە دووری کامیۆنە پۆڵاییەکەدا هەبوو، کە پڕی بوو لە چەك و تفاقی بێ سەروبەر. هەر یەك لە ئێمە ماچێکی لە دەمی سێ کچەکە سەند. پۆرتا ناویانی بە بەچکە کۆترەکان دەبرد،

بۆیە هەر یەکەیان ماچێکی تری پێدا. دوای ماوەیەکی کەم، وەستاین و چاوەڕێی شەمەندەفەرە گەورەکەمان دەکرد کە بە گرمە گرم بەرەو ڕۆژئاوا کەوتە ڕێ و بزر بوو. تۆ بڵێی قەت چاویان بەفەڕەنسا کەوتبێتەوە، من ئەوە نازانم، بەڵام هیچ نەبێ شەمەندەفەرەکە دەگاتە ئەوێ.

دوای شەش حەفتە براکەی فلیشمان بەدەستی پارتیزانێکی فەڕەنساوی لە لیمانس کوژرا، لەپشتەوە لێی درا و دەمانچەکەشی بردرا، ئەگەر ئەو نیشتمانپەروەرە فەڕەنساوییە شتێکی لە بابەت سێ کچەکەوە بزانیبایە، قەت ئەمە ڕووی نەدەدا، بەڵام جەنگ هەر وایە، بێ مانایە !

شەمەندەفەرەکەی گواستنەوەمان بۆ ڕۆژهەڵات ملی نا و بەرەو دەشتە بەرین و دارستانە ڕەش و وەحشەتناکەکانی ڕووسیا ڕێی گرتەبەر. سۆبای ناو کامیۆنەکە بەردەوام لەبەرگەرمیی سوورهەڵگەڕابوو بەڵام ئێمە لەبەر سەرما ڕەق ببووینەوە. شەو و ڕۆژ بە پاڵتۆکانمانەوە دانیشتبووین و تێک چرژابووین و، کڵاوەکانیشمان بەسەر گوێچکەکانماندا ڕاکێشابوو. هەرچەندە ئاگرمان خۆش دەکرد ئەوەندە زیاتر جل و بەرگمان دەکردەبەرو، هەرچەندە زیاتر تێکدەچرژاین ئەوەندە زیاتر کڵۆڵانە سەرمامان دەبوو.

# له کەنیسەدا

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو لەناو تۆف و کرێوە دابووین کە شۆڕ بووینەوە بۆ وێستگەی پسنك.

له فرۆشگای خاچی سووردا لۆبیامان پێدرا، یەکەم جار بوو ئەوەندەمان پێ بدرێ کە بتوانین بەتێری بخۆین.

پیرەئان کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ یەکێك له پەرستارەکانی خاچی سوور، ئەو کچە ئامۆژگاری کردین کە بچین کۆنە کەنیسەیەکی بەرچاو ببینین کە یەکسەر دەکەوتە پشت وێستگەکەوە. خۆی بۆی دەستنیشان کردین و چونکە نەمان دەزانی خۆمان بە چ شتێکی تر خەریك بکەین بۆیە بە لنگە لۆقێ ڕێمان بەرەو کەنیسەکە گرتەبەر.

کەنیسەکە دەقاو دەق وەك وەسف کردنەکەی ئەو بوو، هەم کۆن و هەم بۆندار بوو بەبخووری سەدەکانی پێشوو، زۆریش لەبەر دڵان بوو. پڕی بوو لە شتی گەورە، نەخشکاری وەستایانە، تەلارکاری نایاب، پۆشتەو پەرداخیی کاتۆلیك، لەمپەی بچووك و گڕی تیشکدار، سووچەکانی بچووك و پەیکەری بنەڕەتی پیرەکانی لێ بوو کە بەسادەیی و بەڕەنگی بریقەدار ڕەنگ کرابوون، ڕەنگی ئاسمانیی سوورو ئاسمانیی شین، زۆریشیان زەرد کراوو سەرەتایی بوون وەك وێنەکێشانی مێرد منداڵان، لە سووچەکانیشدا میحرابی بچووك هەبوون کە بە قوماش داپۆشرابوون و لە ناوەڕاستیشدا بۆشاییەکی گەورەو مەزن هەبوو، ئەوەندە بەرزیش بوو بەشی ئەوەی دەکرد کە ڕێگە بە ئەرواح بدا لە بەرزیدا بفڕن و بەرەو باوکە ئاسمانی خوای چاکی منداڵاندا بڵند ببن، لەژێر نیگای ئاگاداری پڕ لە حەماسی قەشەکاندا، جا ئایا نەرم بێت یان توند،

**هەمیشە ئارام یان بەردەوام زاهدانە نائومێدو خۆگر، یان چاك تێرکراوو زناکردوو.**

**پۆرتا، چوونە ئەوێ و تەماشاکردنی کەنیسەی لە کاتێکی وا ساردو سڕدا بەشتێکی گەمژانە دانا، بەڵام لە دواییدا ئامێرێکی ئۆرگانی دۆزییەوە.**

**بە دڵخۆشییەوە پێکەنی و گوتی: " ئێستا دەبینین چۆن بۆتانی دەژەنم ! ". هەموو بەیەکجار وەکو ئەوەی چاوەڕێی هاتنە دنیای منداڵێك بکەین وامان لێ هات.**

**ئەو پێپیلکانەمان دۆزینەوە کە بۆ سەرەوە بەرەو هەیوانی ئۆرگان دەچوو. پۆرتا دووانی لە ئێمە بانگ کرد بۆ ئەوەی بچینە پشتەوەو لەوێوە ئەو هەرامەیە ئیش پێ بخەین کە هەوای بە ئامێری ئۆرگانەکە دەدا. پلۆتۆ توانای سێ کەسی هەبوو، بۆیە بەتەنیا چوو ئیش بەو ئامێرە بکات. پۆرتا پێکەنینێکی تری پڕ لە شادیی بەرەو ئێمە کرد کاتێ بەدیار ئۆرگەنە گەورەکەوە دانیشت.**

**- ئێستا دەبینین جۆزێف پۆرتا چۆن دەژەنێت !.**

**پیرەئان پاڵی بە ستوونێك دابووەوە و لەوێوە فووی لەو نایە دەکرد کە دەستکردی خۆی بوو، ئا لەو ساتەدا لە لێوەکانی کردەوە و گوتی :**

**- ئەو پارچە مۆسیقایەمان بۆ بژەنە کە لە یۆگۆسلاڤیا بۆ منت ژەنی.**

**پۆرتا نەی زانی کام پارچە مۆسیقای مەبەستە، بۆیێ تیج چەند ئاوازێکی بە فیکە لەو پارچەیە بۆ لێدا، کە بریتی بوو لە پارچەی (تۆکاتا ئەند فیوگ). هەرکە پۆرتا زانی خواستەکەی پیرەئان کامەیە، دەموچاوی گەشایەوە، ئنجا بە پلۆتۆی گوت :**

- دەست پێ بکە، پیرە بەندە، بە هەقی ئەو خوایە، جۆزێف پۆرتا پیشانت دەدات چۆن تۆ ئەو شتە دەژەنیت.

وا هاتە بەرچاو کە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و تەعبیر و دەربڕینی لە دەموچاوی دەتکا، وەکو ئەوە بوو کە پەرداخێك لە پاشماوەی بیرەیەکی کۆن بەتاڵ بکەیت، بۆ ئەوەی دووبارە بە عارقێکی ڕەسەن پڕی بکەیتەوە.

پۆرتا دەستی بە ژەنین کرد، وات دەزانی تەنیا بۆ دڵخۆشی خۆی دەژەنێت، نۆتەکان زۆر بەخێرایی و بە ناڕێکی وەك ڕەوە باڵندەییێکی وا بۆ ناو کەنیسەکە دەردەچوون کە هەندێکیان بچووك بوون و جیکەجیکیان دەکرد و هەندێکیشیان بەخشەی گەورەی فڕکەی باڵەکانیان. کە تەواوی کرد هەموومان بەحەماسەوە پێکەنین، خۆیشی جگەرەییێکی داگیرساند و بەئیسراحەتی زیاترەوە پاڵی لێدایەوە. پیرەئان نوقرچێکی لێدام بێ ئەوەی چاوی لەسەر پۆرتا هەڵبڕێت، چرپاندی

- ئێستا گوێت لە شتان دەبێت، ئێستا دەست پێدەکات.

پیرەئان وەك باوکێکی کەیف خۆشی، شانازکردە بوو، دڵی پڕ بوو لە دڵسۆزییەکی ڕاستەقینە بۆ شتێك کە شایستەیە.

پۆرتاش ئەوی نائومێد نەکرد، ژەنینەکەی زۆر نایاب بوو، لە پێشا لەسەر خۆو بێ موبالات یاری بە کلیلەکان کرد، ئنجا لە ناکاو بەهۆی ژەنینەکەیەوە بووە خەولێخەرێکی موگناتیسی: پارچە مۆسیقای (ئاسمان هەر دەمینێ)ی بیتهۆڤن، پارچەی بێ ناوی (بخەوە شازادەکەم بخەوە) شی بەشێوەیەکی لە وەسف نەهاتوو ژەنی، کە بووە مایەی ئەوەی فرمێسك لە چاوی هەردووانمان بزێت، من و پیرەئان هەستمان بەشادییەکی سنووردار کرد بەوەی کە ئەو هەموو چاکییە لە ژیاندا ماوەو، لەوەش دڵتەنگ بووین کە لەو تاریکییەدا کۆت کراوین.

ئنجا پۆرتـا دێوانـه بـوو، هەرچـی گـیرە هـەبوون هـەمووی ڕاکێـشان و کەنیسەی لە گەردەلوولی دەنگدا هەژاند. سەما و گۆرانی دڵخۆشیی بوو، هەموو شتێکی زیندوو و مردوو لە گۆرانییەکی ستایشییدا یەکیان گرتبوو، دەنگێکی گەورە و پڕ سەدا لـە هـەزاران بانگەوازکەرەوە هەڵدەستا، سەمای دەیـان هـەزار کڵـۆ بـەفر لـە شـەوێکی کـشوماتی کریسمـسدا لـە سـەردەمی ئاشـتیدا. تـەیر و باڵندەی دارستان و کێڵگەکانیش دەنووکەکلنیان بەرەو ئاسمان بەرز کردبۆوە و لـە گەروویانـدا ئـاوازێکی ئاسمـانیی دەردەچـوو. ئێمـەش لـەکاتی گوێگرتنـدا دەتگـوت بووینەتـە بـەرد. سـەربازێکی ناشـیرین و پـیس و ئنجـا ئـەم سـروودە مەزنە، ئەم سروودە دڵکێشە پاکەی شادمانییە.

وا ڕێکــەوت چــاوێکم بــەناو کەنیــسەکەدا گێــڕا و، هاوکــات لەگــەڵ سەرسـامیمەوە، بینـیم کەنیـسەکە پـڕە لـە خـەڵکی بـێ جووڵـە و بـێ دەنـگ. لـە تەنیـشت میحرابــەوە قەشــەیەکی بــاڵا بــەرزی پــرچ دانومــاش ڕاوەســتابوو، کــەمێکیش دوورتــر لەســەرەوە کۆمــەڵێك خــەڵکی مــەدەنی ســەرنج ڕاکێـشراو چـاویان بڕیبـوە گالـەری لەسـەرەوە. لـە ناوەڕاسـتی کەنیـسەکەشدا ژمارەیـەك سەرباز خۆیان و پاڵتۆیەکانیان و کڵاوە شۆڕبووەکانیان بەسەر دەم وچاویانەوە دانیــشتبوون و ڕاوەســتابوون، ڕەنــگ زەرد بــەهۆی بــەد خۆراکییــەوە. لــەنێو ئەوانـەدا دەمتـوانی یـەك دوو پەرسـتاری خاچـی سـووریش بـەدی بکـەم، بـەڵام هەرچەندە ئەم جۆرە مرۆڤانە ئاساییانە بابەتی گرنگی پێدانی ئارەزوومەندانەی ئێمەن، کەچی من لەبەر مۆسیقا خۆشەکەی پۆرتا لەبیرم کردن. لە دواییدا پۆرتا وەسـتاو، لـەناو ئـەم بێدەنگییـە مـەرگبارەدا گوێمـان لـە پلۆتـۆ بـوو لـە شـوێنی خۆیەوە لە پشت ئامێری ئۆرگەنەکە بۆ هەناسە وەرگرتن لاکە لاکی بوو. پۆرتـا سەیرێکی من و پیرەئانی کرد.

گوتی: ژەنینێکی زۆر خۆش لە کەنیسەیەکدا، زۆر خۆش.

ئەویش، دڵخۆش بوو، بەجیدی دڵخۆش بوو.

دەنگی پیرەئان بەهۆی هەڵچوونییەوە لەرزی.

پۆرتا، ئەی پیرە گێلی پیس ! تۆ ئەی گەمژەی بێ ئاگای سەر سوور.

پاش ماوەیەکی کەم قەشەکە هات. باوەشی بە پۆرتای دەم بە زەردە خەنەوە کرد، هەردوو کوڵمی ماچ کردن.

پاشان ئەسمۆس بە ڕاکردن هات و هاواری کرد کە دەڕۆین. قەشەی باویقار خاچەکەی بەسەرمانەوە هەڵگرت :

– خوا پارێزگاریتان بکا، کوڕەکانم.

ئنجا هاتینە دەرەوە و لەناو گێژاوی بەفردا ڕێگەی گەڕانەوەمان گرتە بەر بۆ کامیۆنە ئاژەڵ هەڵگرەکان و بۆ سەر ئەو کا و کۆتە نیمچە پیسەی لەناویاندا بڵاو بوو. وەکو جاری جاران خۆمان بەتەواویی داپۆشیی و بەردەوام ڕێگەمان بڕی بەرەو ئامانجی نادیارمان، لە سمولینسک دایان بەزاندین.

- بۆ دواوە، بۆ دواوە، لەعنەت لە تۆ، ! قاچەکانی کەوتنە ژێر ڕۆڵەکانەوە !.

کاردانەوەی پۆرتا دەمودەست بوو، تانکەکە تەکانێکی بۆ دواوە داو پۆرتا لە ناوییـەوە دەرپەڕی و، پێکەوە، من و ئەو، هانزمان گرت کە لەوێ وەستا بوو، وەکو کاغەز سپی هەڵگەڕابوو. گەیاندمانە ناو خانووەکە و پیرەژان جگەرەیـەکی داگیرسـاندو پەسـتییە نێوان لێوە شینەکانییەوە. کاتێکیش بووتەکەی لە قاچە هاڕاوەکـەی هـانز دەبڕیـەوە سەری بادا

" کوڕینە، کوڕینە، ئایا ئێوە شێتن ! "

# پێش پــــەلامــــاردانەکـــــە

لــە دەوروبــەری سموڵینــسک لــە چــەند خــانووێکی ئەهلیـدا دابـەزێنراین. هەرکە زەخیرەکانی خۆمانمان ڕاکێشا بەرەو مەیدانی گەورەی بازاڕ کەوتینە ڕێ کــە بــە ســەربازی هەمــە چەشــنە تــەنرا بــوو : یەکــە ســەربازییەکانی(SS) بــەو کڵاوانەیانـەوە کـە وێنـەی سـەری مردووێکـی لەسـەر بوو، یەکـە سـەربازییەکانی پەڕاشووت، سەربازانی سوارە بە پانتۆڵە لە پێست دروستکراوەکانیان و بووتـە درێـژە نەقیزەدارەکانیانـەوە، تۆپخانـە خۆیـان و چاکەتە پێستییە سـەیرەکانیان کـە بـە پەڵـەی قـاوەیی و سـەوز و شـین ڕەنـگ کرابـوون، سـەربازانی ڕۆمـانی و هەنگاری بە بەدلە شڕەکانیانەوە, هەموو جۆرە سـەربازێکی سـەر بـە سـوپا جـۆر بەجۆرەکانی ناوەڕاستی ئەوڕوپا لەوێدا لە بازاڕەکەی سموڵینسک دەبینران، هەر لە ئەفسەری چاویلکەداری یەك چاوەی پۆشتەی سەر بەهێزی ئاسمانییـەوە تـا دەگاتە سەربازی پیسی ئەسپێونی سەر بە تۆپخانە.

هــەروەها شــوێنەکە مۆنجــەی دەهــات بــە هاوولاتییــانی ڕووس بــە جـل و بـەرگی پینـە کـراوەوە، کـە هـەندێکیان بەشـێوەیەکی بـاوەڕ پێنـەکراو شـڕو دڕاو بوون، جۆرە بووتێکی بێشێوەی لە لباد دروستکراویان لـە پـێ بـوو. شـەش یـان حەفت ژن بە لاکە لاك دەهاتن، هەر یەکەیان تەلیسێکی لە کۆڵێ بوو، هـەموویان بـەدەم ڕێگـاوە وڕێنـەیان دەکـرد. لـەناکاو یـەکێکیان وەسـتا و هـەردووك قاچـی کردنـەوە و پـاش سـاتێك شـوڕە شـوڕێکی زۆر هـات و گۆمـاوێکی گـەورە لەسـەر زەوییەکە لەنێوان قاچەکانی پەیدا بوو، هەرکە تەواویشی کرد بە ئەسپایی ملـی ڕێی گرت.

پۆرتا سەیرێکی گۆماوەکە و ژنەکەی کرد و گوتی: " چاکە، قوڕ بەسەرم. هەر ڕێك وەك پیرە مانگایە " دیسان گوتی: " چاکە، قوڕ بەسەرم ".

ڕووسەکان وا خۆیان دەردەخست کە بەتەواویی ئەو سەرما ترسناکە کاریان تێناکات، کە کارێکی وا خراپی دەکردە سەر ئێمە.

دوو ڕۆژ لە سمۆلینسكماینەوە، پاشان چەند لۆرییێك ئێمەیان بردە بیلڤ، کە فەوجی (٢٧)ەم لەوێ بوو. سرییەکەمان چوو بۆ بەتالیۆنی دووەم کە لەژێر فەرماندەی ئۆبەرست لیفتنانت ڤۆن دیر لیندناو بوو، لەگەڵ مێجەر هنکا وەکو ژمارە (٢)، ئەگەر تەنها بەرازێکی وەکو میر فەرماندەی سرییەکەمان نەبوایە ئەوا هەموو شتێك بەرێکی بەسەر دەچوو.

پۆرتا دووپاتی کردەوە کە لە خەونیدا خوداوەندی دیوە و پێی گوتووە بەم زووانە وەرزی ڕاوە بەراز دەست پێدەکات، هەروەها پێشی گوتووە بەم زووانە سرییەکە فەرماندەیەکی نوێی دەبێت. ئەمە ئەو قسانە بوون کە خوداوەند بە ئۆبەر گریفتەر پۆرتای گوتبوو، ئامین.

قسەیەکی زۆر لە بارەی ڕاوە بەرازەوە هەبوو لە سرییەکەدا. میر ڕێگەی بەخۆی دابوو ئەو پەڕی بەد ڕەفتاریی لەگەڵ ئێمەدا بکات، ئەو فێڵی لە ئێمە کردبوو و لە هەموو هەلێکیشدا ناپاکیی لەگەڵماندا دەکرد. کاری سەرەکی ئەوە بوو مەشق و ڕێپێوانی سەربازیمان پێبکات، هەلەی وا زەقی دەکرد کە هەموو سەربازان لە مەیداندا پێی وابەستە بوون. هەموو ئەفسەران سەریان بادەدا و بەشێتی تێدەگەیشتن و، ئیتر هەر لەو ساتەوە زانیمان کە هیچ کەس لەمەو

پاش بایەخ بە مەسەلەی مردنی میر نادات، سەرەڕای ئەمە میر سەر بە ئێمە بوو، ئەو خۆی نەی دەزانی بەڵام ئێمە دەمانزانی. ئێمە لە باسکردنی ڕاوە بەرازدا وەستاین و زۆریشمان دەستیان بە دمەدم کردن کرد. هیچ شتێکی تر نەبوو بۆ گفتوگۆ لەسەر کردن.

یەك لە وانەی کە دڵی زۆر لە بەدییەکانی میر پڕ ببوو هانز برور بوو. یەك دوو جار داوای لێکردم کە بەیەکەوە فیلار بکەین بەڵام من نەم وێرا.
بە بایەخەوە گوتی: " توخوا سڤن، پێت وا نییە ئێمە دەبێ لە هەموو ئەمە دوور بکەوینەوە، گرنگیش نییە چۆن ؟
سەیرێکم کرد و بەدڵنیاییەوە گوتم. " هانز، ئێستا هیچ شتێکی گێلانە مەکە ".

ئێوارەیەکیان فەرمانمان بۆ هات کە تانکەکان بۆ کارکردن ئامادە بکەین. پڕمان کردن لە بەنزین و ڕوون، تەقەمەنیمان لێ بارکردن. تەقەمەنی بۆ بیست هەزار جار تەقە کردنی ڕەشاش. واتە دە هەزار بۆ هەر یەك لە دوو ڕەشاشەکەمان، یەك سەد گوللە تۆپی توند تەقیو، نارنجۆکی دەستیی، گوللەی ڕووناکی، تەقەمەنی بۆ چەکە سووکەکانمان و ڕوون بۆ گڕ هاوێژەکان.

پۆرتا لەسەر زگی بوو، ئەوەندە لە بنە بانی ژووروۆچکەی تانکەکەدا بوو کە تەنیا هەر قاچە دەرچووەکانی دەبینران، لە کاتێکدا کە جوێنی بەو سوپایە نەفرەتبارە دەدا کە خەڵکیی دەکاتە بەراز. ناوناوەش پێکەنینێکی شاراوەی دەهاتێ و لە شوێنی خۆیەوە بەناو بۆڕییەو دەرچەکاندا هاواری دەکرد :
– هۆ، پیرەئان، ئەم جارەیان ناوەندی ئارمانجم پێکا. خوداوەند ئەمەی پێڕاگەیاندم.

پیرەئـان گـوتی: " ئەگـەر هـیچ کـەس بـاوەڕی پێنـەکردی، ئـەوا حـەفت سەدیان لە سرییەکەدا هەن ".

وەڵامی پۆرتـا بریتـی بـوو لـە فیکـەکردن بـە نێـو ددانەکانییـەوە. پیرەئـان وتـیچ چـوونە نـاو کوخەکـەوە بـۆ ئامـادەکردنی نـانی ئێوارەمـان، لـەو کاتەیـدا پلۆتـۆ چووە لای ئەفسەری ئازووقە بۆ وەرگرتنی ئازووقەمان، من و پۆرتـاش دەبوایـە تانکەکە لێخوڕین بۆ نزیك خانووەکە و بە لقە درەخت و بە بـەفر بیـشارینەوە بـۆ ئـەوەی نـەهێڵین فڕۆکـە ڕووسـییەکان بیبیـنن کـە هـەموو شـەوێك بەسـەرماندا دەفڕین و پەڕاشووتی گڕداریان فڕێدەدا.

بەرلەوەی تانکەکە بگەیەنینە شوێنەکە هانز بۆلامان هات و پێی گوتین کە هەر ئێستا نامەیەکی بۆ هاتووە کە تیایـدا دەڵێ ژنەکـەی بەهـۆی نەخۆشـییەکی مەترسـیداری هـەناوەوە خراوەتـە نەخۆشـخانەوە. هـانز زۆر عـادز بـوو. مـن تائێستا لۆمەی خۆم دەکەم کە ئاگاداریم نەکرد. من دەم زانی کە دەبوایـە بیکـەم بەڵام بیرم لێی نەکردەوە و کە کاتیش بەسەرچوو درەنگ داهات.

لەبـەردەم تانکەکـەدا وەسـتابووم، بەدەسـت ئیشارەتم بـۆ پۆرتـا دەکـرد بـۆ ئـەوەی بتـوانێ تانکەکـەی بەدروسـتی بباتـە شـوێنەکەی و خـۆی بەکوخەکـەدا نەکێشێ. پاشان گوێم لـێ بـوو هـانز هـاوارێکی کـردو، زانـیم کـە قەومانـدی، کـە گەیشتمە سەری، دەبینـم وەسـتاوەو پێیـەکی کـەوتبووە بـەینی ڕۆڵـە قورسـەکەو ڕێگاکەوە.

کاتێك کـە ئەمبولانسەکە کەوتـە ڕێ دەسـتمان کـرد بـە گفتوگۆکردنی ئـەو ڕاپۆرتـەی کـە پیرەئـان نیازییـەتی بینووسـێ. ئێمـە لەسـەر ئـەوە پێـك هـاتین کـە بڵێین هانز هەوڵی دا لە تەنیشتەوە سەرکەوێتە سـەر تانکەکـەو هـەر لـەو سـاتەدا پۆرتا کشایەوە، وایزانی ئیشارەتەکەی مـن بـۆ ئـەوە بـوو کـە بگەڕێتـە دواوە، لـە

ئەنجامی ئەمەدا هانز لەسەر ڕۆڵەکە خزی و پێیەکەی بەرکەوت. ئەم قسەیە بەشتێکی مەعقول دادەنرێ، بەڵام بێ هەڵە نەبوو، چونکە بەتوندی قەدەغە بوو کە لە تەنیشتەوە سەرکەویتە سەر تانك. هەمیشە دەبوایە لەلای پێشەوە ئەم سەرکەوتنە ئەنجام بدەی، کە لەوێوە شوفێر دەتوانێ بتبینێ.

سەرەرای ئەمە، شتێکی سەیر بوو کە هەر یەکسەر پێش ئەوەی ئێمە بکەوینە کارەوە پێیەکەی وردوخاش ببێ.

پیرەئان گوتی: " هەر چۆنێك بێت، هەر یەکە " کەس نییە لە ئێمە گومانی لەوە نەبێ کە بەئەنقەست ئەمەی کردووە، بەڵام تا ئەوان نەتوانن هیچ شتێك بسەلمێنن، ئەوا هەموو شتێك بەباشی دەڕوا، تا ئێمەش بەم ڕوونکردنەوەیەوە پابەند بین ئەوان ناتوانن هیچ بسەلمێنن.

پۆرتا ئاهێکی هەڵکێشا " ئێمە دەبێ هەر خۆزگەی ئەوە بخوازین کە نەتوانن ورە بەزێنی کەن. ئەم شەیتانانە ".

دوای ئەمە چووینە ناو نوێنەکانمان بۆ ئەوەی سەرەخەوێك بکەین، چونکە دەبوایە لەکاتی شەوردا بەرەو بەرەی جەنگ بکەوینەڕێ.

تیچ توانی قەندیلەیەك دابگیرسێنێ و لەبەر ڕۆشنایی پچڕ پچڕی ئەو قەندیلەیە توانیمان خۆمان ئامادە بکەین، لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە تا ڕادەیەك بەتەواویی بێداربووین. پۆرتا بە قیتیی لەناو کاوکۆت دانیشتبوو. سنگە پیسە دەرچووەکەی خۆی دەخوراند، مووە سوورەکانی بەهەموو لایەکدا ڕاست وەستابوون. پیرەئان و پلۆتۆ ئەسپێیان دەگرت و فڕێیان دەدانە ناو گڕی قەندیلەکەو، لەوێدا بەتەقەیەکی نزم دەتەقینەوەو بۆنێکی بێزکەرەوەی ڕووناوییان لێ دەهات. لە ماوەی یەك چارەکە سەعاتدا چەك و تفاقی خۆمانمان کردەبەرو، بە لەرزە لەرزی سەرماوە خۆمان کوتایە ناو تانکەکەوە.

شاله گریزاوییه‌کانمان له ده‌وری ملماندا پێچاو کڵاوه به چاویلکه به‌فرییه‌کانمان به‌ره‌و خوار ڕاکێشا بۆ سه‌ر گوێچکه‌کانمان.

چ جیاوازییه‌ك هه‌یه له نێوان ئه‌و لاوه پاڵه‌وانه سوورکه‌ڵه شیکه پشت ڕاسته که به عه‌زمه‌وه سه‌یری دوور ده‌کا، ئه‌و جه‌نگاوه‌ره نێرینه‌ی که ڕقی له ژنه و که به‌سه‌ر پۆستکارته‌کانی ته‌جنیدی هه‌موو دنیادا ده‌بینرێن، له‌گه‌ڵ ئه‌و شه‌یتانه هه‌ناسه برکێیه ترساوه‌دا، به‌هه‌ناسه ساردو خراپه‌که‌ی و به‌ده‌م و چاوه ژاکاوه‌که‌یه‌وه که ڕووی ڕاسته‌قینه‌ی جه‌نگه. ئه‌گه‌ر ئه‌و هونه‌رمه‌ندانه‌ی وێنه‌ی ئه‌و پاڵه‌وانانه‌ی سه‌ر پۆسته‌ره‌کانیان کێشاوه بیانزانیبایه ئه‌و ئه‌رکه‌ی جێبه‌جێی ده‌که‌ن چه‌ند سه‌خیفه ئه‌وا به‌دوای کارێکی تردا ده‌گه‌ڕان، به‌ڵام له‌وانه‌یه هیچیان ده‌ست نه‌که‌وێت، چونکه پیاو که له نزیکتره‌وه سه‌یر ده‌کا هه‌ر زوو بۆی ده‌رده‌که‌وێ که ته‌نیا هه‌ر هونه‌رمه‌ندانی پله‌ی شه‌شه‌م و حه‌فته‌م ئه‌م جۆره هونه‌ره ره‌سمییه جێبه‌جێ ده‌که‌ن، پۆسته‌ری ته‌جنیدی سه‌ربازیی بواری به‌هره‌مه‌نده زۆر نزمه‌کانه.

ماشینه زۆره‌کانی به‌تالیۆنه‌که به‌ناو هه‌موو گونده‌که‌دا گره و هاواریان بوو، ناوناوه‌ش له تۆرجێکه‌وه فلاشێك ده‌رده‌چوو، ئه‌گینا هه‌موو شتێك له تاریکییه‌کی نوته‌کدا ده‌کرا دوور له تێبینیکردنی ئه‌و فرۆکه ڕووسییانه‌ی که ناومان نابوون (قاوه هاڕه‌کان) له‌به‌ر ده‌نگه گه‌وره پێکه‌نین هێنه‌ره‌کانیان، ئه‌وانه‌ی که به‌رده‌وام به‌شێوه‌یه‌کی نه‌بینراو له گه‌ڕان و پشکنین دابوون له‌کاتی فڕینیان به‌سه‌ر سه‌رمانه‌وه، هه‌ندێك جار ئه‌وه‌نده نزم ده‌بوون ته‌نانه‌ت گوێمان له ده‌نگی مه‌کینه‌کانیان ده‌بوو له‌ناو هاتووهاواری خۆمان.

دەستە دەستە گوندەکەمان بەجێ هێشت. تاریکییەکی نوتەک بوو، بۆیە دەبوایە ئاگادار بی نەبادا خۆت بە تانکەکەی پێش خۆتدا بکێشی، بۆ ئەوەی کارەکەی پۆرتا کە لەخوارەوە لەنزیک ئامێرو ستێرن دانیشتبوو ئاسانتر بێ من و پلۆتۆ بەسەر بورجەکەوە پاڵمان دایەوەو لەوێوە بە تەلەفۆن ئاراستەکانمان پێ ڕادەگەیاند. بەخێرایی ( ٣٣ ) میل لە سەعاتێکدا ڕێمان بەگرمە و هۆڕەوە گرتەبەر. لەناکاو دەنگی وردوخاش بوونێکمان بیست. دوای نیو دەقە دووبارە دەنگەکە هاتەوەو لەهەمان کاتیشدا پارچە تەختەی گەورە بەبنا گوێچکەکانمانەوە بەم لاو بەو لادا دەفڕین، کە پێنج جار ئەم دیاردەیە ڕووی دا زانیمان خۆمان بە ستوونەکانی تەلەفۆندا دەکێشین و یەکسەر پۆرتامان ئاراستە کرد بۆ ئەوەی بێتەوە سەر ڕێگا. دوای کەمێک ئەوەندەی نەمابوو خۆمان بە تانکەکەی پێش خۆمان دابدەین، کە لەناکاو وەستا بوو چونکە گەیشتینە پردێک کە تەنیا یەک تانک لەجارێکدا دەیتوانی لێی دەرباز بێت. دووان لە ئێمە دەبوایە ڕابوەستن، هەر یەکەو لە سەرێکی پردەکە، بە جگەرەی داگیرساوەوە بۆ ئەوەی ڕابەرایەتی تانکە قورسەکانمان بکەین بۆ پەڕینەوە. یەک گرێ بەم لاو بەو لا کردندا دەبووە هۆکاری ئەوەی کە ڕووباری بوپا ئەو قوربانییەی دەست کەوێ کە چاوەڕێی دەکرد.

نزیک کاتژمێر چوار لە لێواری بیشەلانێکدا وەستاین. ماشێنەکانمان لە کارخستن و بێدەنگییەکی سەیر باڵی بەسەرماندا کێشا. تەنیا دەنگێک کە دەهات گرمەو برمە برمی «ئاشەکانی قاوە» بوو لە سەرەوە. ناو ناوەش پەڕەشووتێکی گڕدار دەهاتە خوارەوە، دەشت و دەری وەکو ڕۆژ ڕووناک دەکردەوە.

کاتێکیش ئەفسەرەکانمان لەگەڵ سەرکردەی فەوجەکە بوون و فەرمانەکانی جەنگیان لێوەردەگرت، ئێمە ویستمان سەرەخەوێک بشکێنین، نیوە پاڵ کەوتوو لەسەر زەوییە ئاسنینەکەی تانکەکە. تازە لە بۆرشک چووبووین کە فەرمانی ڕیزبوونمان پێدرا. فەرماندەی دەستەکەمان ئەرکەکانمانی پێ گوتین.

# دیمەنەکە

- بیست و حەفتەمین فەوجی تانك پێکەوە لەگەڵ فیرقەکانی چوارەم و هەژدەم و بیست و یەکەم دەبێ پەلاماری سەنگەری رووسەکان بدەن لە سەرپوچۆ لە باکووری توولا. سەنگەرەکان پێویستە بشکێن بۆ ئەوەی هێرش ببرێتە سەر مۆسکۆ. ئەو فەوجە تانکەی کە سەر بە فیرقەی دووازدەمی پانزەرە سەری رمی پەلامارەکە پێکدەهێنێت، لەگەڵ پاسەوانەکانی (SS) وەکو هێزی یەدەك لەلای راستەوە دەبن. سرییەکەی ئێمەش لەو پەری لای چەپ دەبێت و ئەرکەکەشی بریتییە لە چوونە پشت سەنگەرەکانی رووس و ئامادەکردنی رێگا بۆ سرییەکانی تر کە بەرێوەن. سرییەی ٣، سرییەی پێشرەوە.

پۆرتا بە پێکەنینەوە گوتی: " رێز لە یادگاریی سرییەی ٣ بگرن ".

- ئێمە دەبێ بەرەو گوندێکی بۆردومانکراو بکەوینە رێ کە یەکسەر دەکەوێتە پشت هێڵی سەرەکی پێکدادانەوە. لەوێش، نارنجۆك هاوێژەکانی سەر بە فەوجی تفەنگداری ١٠٤ لە پشت تانکەکانمان سوار دەبن.

لە کاتژمێر ٦٤٠ فڕۆکەکانی شتووکا هێرش دەبەن.

لە کاتژمێر ٦٤٨ سرییەی ٣ هێرش دەکات.

لە کاتژمێر ٦٥١ سرییەکەی ئێمە شوێنی دەکەوێت.

لە کاتژمێر ٦٥٠ بەولاوە بەربەستە ئاگرێك لە دووری سێ کیلۆمەتر لە هێڵەکانی دوژمنەوە دادەنرێت.

دیمەنێکی شکۆدار بوو، خومپارەی جێ نیشاندەر لە هەموو رەنگەکانی پەلکە زێرینە بەهاوارەوە ئاسمانیان دەبڕی، دارستان و گوندەکان بەدرێژایی

ئاسۆ گڕیان گرتبوو، بۆیێ ئاسمان بەسوورێکی وەنەوشەیی ڕەنگ کرابوو. تاك تاك گولله تۆپیش بەگرمژنی توندو بەبریقەی سپییەوە دەتەقینەوە، بەڵام جگە لەمە، ئەو کشوماتییە سەرتاسەرییە هەبوو کە بەر لە هەڵکردنی ڕەشەبا هەستی پێدەکرێت. ناوناوەش ڕەشاشێك تەقەی دەکرد و دەنگی وەکو هاواری سەگە تووڕەکانی پاسەوانیی بوو، گوللەی وێڵیش بەناو کەلاوەکانی دەورو پشتماندا بڵاو دەبوونەوە.

درامایێکی شکۆدار بوو. شەڕ نمایشێکی گەورەیە، سەرنجراکێشانێکی ڕاستەقینەیە، جەنگ بەترس و لەرزی درێژخایەنییەوە، بە نەگریسی و، برسییەتی و، بەد بەختی ناپاڵەوانییەتییەوە، لەنمایشێکی سەرنجڕاکێشی مەزنایەتی و دڕندایەتیدا دەگاتە چڵە پۆپەی خۆی. گیانی ترساو خۆی ڕەها دەکات و بەسەر باڵی بەهێزدا دەکەوێت و بۆ دیداری نسیبی گەورەی خۆی دەفڕێت. ئەوە زەمەنی گەورەی موعاناتی مەدەنییە. گیانی وی قەت هەلێکی بۆ نەڕەخساوە کە لەناو سامان و خۆشگوزەرانیدا بکرێتەوە، لە فەرمانگەیەکی ناڕێکدا تۆزاوی بووە، کە لەوێدا خراوەتە سەر ئەو شێوەیەی کە لەلایەن ئەفسەری کارکەرانەوە داڕێژراوە. نەهیچ هەلێکیشی بۆ ڕەخساوە لە جیهانی ڕۆحدا. لەو پایە و پلەیەدا نەبووە و پارە و پوولیشی زۆر دەگمەن بووە بۆ فێرکردنێکی ئەدەبییانە و دوا ڕۆژێکی چاوەڕوانکراو. کاتێکیش کە گیان سەردانێکی خۆشەویستیی دەکات، لەوانەیە زیاتر نەبوو بێت لە کورتە چاوپێکەوتنێکی ناو دەروازە، ئنجا ساواییێك، گرێبەستی مارەکردن، شوقەییێکی دڵتەنگبار لە شەقامێکی بێ دیمەندا، چەند پسوولەییێکی پارە، کاری قورس، شەهوەتێکی پەڕو باڵ بڕاو و ژنێك کە هەر زوو دەبێتە مایەی کلۆڵیی ژیان، ژنێکی زۆر بێزارکەر.

لە شەڕدا مەدەنییە بچکۆلانەکە هەموو ترس و بیمە کەڵکە بووەکەی دەجوولێتەوە، کە بڕێکی زۆری هەیە، ئنجا بەرەو جەنگ ڕێ دەگرێت و لەو دراما مەزنەی مەرگ و ژینەدا گیانی خۆی ئازاد دەکات.

نەخێر ! گیانەکە ئازاد نابێت، ئەوە کاریکاتێرە، دوور لەوەی ببێتە مرۆڤێکی ئازاد، دەبێتە سەگ بازاڕییەکی شێتانەی هیستیرییانە، کوێرانە گوێڕایەڵی پاڵنەری ترسەکەی خۆی دەبێت لە کردنی هەر شتێك بەشێوەیێکی سەربەخۆو بەتەنیا. ئەوەی دەی کات دەقاو دەق ئەوەیە کە قەت خوازیاری کردنی نییە، یان بەلایەنی کەمەوە زاتی کردنی ناکات، بەڵام ئەوەی بەدرێژیی ژیان هەوڵی داوە بیکات بریتییە لە : کوشتن لەپێناو خۆراك.

بەڵام چونکە خۆی دەخاتە بەر موجازەفەیەکی شێتانەی مردن بەهۆی ئەم کردەوەیەوە، وادەچێتە مێشکەوە کە خاوەنەکەی کابرایێکی بوێر بێت و، ئەو بێهودە، نە ژیانی بردبێتە سەر و نەمردبێت.

ئەمە ڕاستییەکی بێزارکەرە.

بەهەر حاڵ من باوەڕم بە هۆنراوە گۆرانییەکانی جەنگ نییە. کەس ناتوانێ ئیقناعم بکا کە جەنگ موجازەفەیەکی بێ باکانەی، وروژێنەرە بۆ پیاوان، گەشتێکی ڕاووشکارە بۆ ڕاوکەران کە بەسوودتر و پڕهێزترە لە ملیۆنێران.

زۆر جاران پیرەئان باسی پەلاماردانی تانکەکانی بۆ دەکردم کە تیایدا دەیان تانك بەهۆی چەکی دژە تانکی دوژمنەوە ئاگریان تێبەردەبوو، نەفەرەکانیشیان لەناویاندا تا مردن دەسووتان. چەندین جاریش کەم کەس لێی دەرباز دەبوو، جا ئێمەش، فەوجی سزادراو، هەمیشە دەبینە سەرەڕم.

- بەڵێ، سڤن، ئایا ئەوەت هاتەوە بیر کە چەند وشەییێکی ماڵئاوایی بۆ دایکت و بۆ دڵدارەکەت بنووسیت ؟.

دەنگە پڕ سۆزەکەی پیرەئان بەسەر بیرکردنەوەکانمدا زاڵ بوو، وای لێکردم ڕاچەنم. پارچە کاغەزێکم پەیداکردو لەژێر ڕووناکی کزی شووشەی ئامێرەکە چەند وشەییێکم بەشێواوی نووسی، کە تەواوم کرد پۆرتا شووشەییێکی دامە دەست و بە زەردەخەنە ساختەکەیەوە گوتی :

- قومێکی درێژ لە ئازایەتی ئەڵمان بدە، ئنجا ئەوەت لەبیر دەچێت کە ئەوان لەوێ لەسەرەوە بۆشاییان بەکارنەهێناوە، وای لێ دێ وەکو ڕاهێنانێکی لێ دێ.

ئازایەتییە ئەڵمانییەکەی پۆرتا سەلماندی کە لە (٩٦٪)ی ئەلکهولی ڕوونە، شەریفانە لە نەخۆشخانەیەکەوە دزراوە، تا ئێستا من برێکی زۆرم لێ خواردۆتەوە، بەڵام قەتیش سووکم نەکردۆتەوە. پۆرتا کە دەم و چاوەی دیت پێکەنی.

- بمبورە ! من لە بیرم چوو پێت بڵێم زمانە بچکۆڵەکەت بۆ لایەك پاڵدەو شتەکە بەخێرایی دابنێ.

هاوڕێ لەگەڵ سەرسامی منەوە، تیج شووشەکەی بەدەمییەوە ناو بەبێ ئەوەی تەقەی سەری بێ فڕی کرد. پۆرتا شووشەکەی لێ سەندەوەو" ئەمە بەسە، خۆ ئێمە لە میواندارییەکی عیسادا نین بەدرەختی کریسمس و کولیچە و پسکویتەوە، هەی گێلە ".

تیج گوتی: " سوپاس بۆ دیارییەکە، پۆرتای ئازیز " ئنجا قڵپێکی بەدەنگی بەرزەوە لێوە هات. ئەگەر وام بۆ ڕێك بکەوێ کە لەسەر ئەم گەشتە

زیاد بکەم، ئەوا فەرمان بەکۆمەڵە پەرییێك دەدەم و وایان لێدەکەم چاوەڕێت بن کە دێی.

پیرەئان گوتی: "خوا بمان پارێزێ، گوێیان لێ بگرن، وا دەزانن بۆ ئاسمان دەچن، نەخێر، بچکۆڵەکانم، ئەو پەڕو باڵەی ئێمە وەدەستمان خستووە، لەو جۆرە دەبێ کە هەمە چەشن هەڵکروزاوە لە دەرەوە دەنگی چەند فەرمانێك بەکزییەوە هات، ئنجا دوای ماوەیەکی کورت چەند نارنجۆك هاوێژێك سەر تانکەکە کەوتن. چاویان تێمان بڕی، زەردەخەنەیان دەهاتێ. ئێمەش دوایین جگەرەمان داگیرساند.

ئامادە بن بۆ پەلاماردان ! سرییەی ٥، بۆ پێشەوە بڕۆن !، بەمەکینە گرمە لێوە هاتووەکانەوە، بەناو گوندە بۆردومان کراوەکەدا ڕۆیشتین, هەموو دەرچەی بورجەکانمان تا ئەو کاتەش کرابوونەوەو، لە سەرەوەش لە پشت ئێمەوە نارنجۆك هاوێژەکان دانیشتبوون، ئامادە بۆ بازدان بۆ خوارەوە کاتێ گەمە و گاڵتەکان دەست پێدەکەن. پۆرتا چاوەکانی لەسەر دەرزی تەماشاکردنەوە هەڵنەدەگرت. دەستەکانیشی توند توند لە شەفتی ستێرنەوە گیر کردبوو. پیرەئان لەناو بورجەکەدا وەستابوو بەدیقەتەوە لە ئەڵقە خڕەکەی چاودێرییەوە سەیری دەکرد لە کاتێکدا پلۆتۆ ئامادەبوو کە هەر لەو ساتەی فەرمانی ئاگر باران بدرێت ئەو تۆپە قورسەکەی بخاتە کار. تیچ هەموو سندووقەکانی جبەخانەی والاّ کردبوو، ئامادەش ڕاوەستابوو بۆ ئەوەی گوللە تۆپ لە تۆپەکە بپەستێ لە جێی ئەو قەوانە سوور بووانەی کە لێی دێنە دەرەوە. لەو شوێنەی کە منی لێ دانیشتبووم، لە تەنیشت ئامێری بێ تەلەوە، بۆ بیستەمین جار تەماشای ڕەشاشەکەی خۆم کرد بۆ ئەوەی بزانم دروستە، هەروەها ئەو ڕەختە درێژەم ڕێکخست کە وەکو مارێکی، درێژی، پان بەدەورمدا ئالاّ بوو. دەنگێکی پێکەنیناوی هات :

– سرییەی ژمارە ٥، سرییەی ٥. دەستەی ئەفسەرانی سرییە داوا لە هەموو تانکەکان دەکا کە دەست بە تیر باران بکەن !

دەستبەجێ دەرگای دۆزەخ کرایەوە، سەرمان پڕی بوو لە هاشە و گرمە و هاوار و ڕمبەی وزەی بەڕەڵا کراو.

گڕی درێژی مەیلەو زەردی سوور وەکو چەقووی ئاگر لە لوولەی تۆپەکان دەردەپەڕی. دووکەڵی گوللە تۆپەکان چاوو قورگمانی دەسووتاندو دەزووراندەوە. هەر جارێك تۆپەکە ئاگر بدرایە گڕێکی سەرتیژ لە قەپاغی دواوەی دەردەچوو. قەوانە بەتاڵەکانیش کۆدەبوونەوەو بەتەقە تەقێکی ترسناکەوە بەرەو بیری تانکەکە گلۆر دەبوونەوە.

من بەزارە بەشکەوە دانیشتبووم و تەماشای ئەو دیمەنەم دەکرد کە ڕمبەمان لێوە دەهێنا. لەناکاو ڕاست لە پێشمانەوە چاوم بە هەندێك تۆپخانەی ڕووسی کەوت. بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بەچاوێکی نیوە قوچاوەوە بۆ خوارەوە سەیری لوولەی تفەنگەکەم کردو لەسەرەوەش مەگسەکی تفەنگەکە.

پەنجەی دۆشاو مژەم بەدەوری پەلاپیتکەدا بەشێوەی ڕێك سووڕاندبۆوە – لەپاشان ! بەچاو تێبڕینێکی ساردو بەچاوی تەسك کراوەوە چاودێری ئەو شوێنەم کرد کە گوللە جێ نیشاندەرەکانی بەردەکەوتن، ئامانجەکانم ڕاست دەکردنەوەو کوشتار دەستی پێکرد. لەناکاو بەتەکانێکی توندەوە بەرەو پێش فڕێ درام و، ئەگەر ئەو خوودە ناواخنە پێستییەم لەسەر نەبوایە ئەوا دەم و چاوم لەسەرلۆکی (قوفلی) ڕەشاشەکەوە پارچە پارچە دەبوو. پیرەئان سوێندی لە پۆرتا خوارد کە ئێمەی خستە ناو چاڵە گوللە تۆپێك کە چەندین پێ قووڵ بوو.

پۆرتا هاواری کرد " تەنیا ئەوەندەم بۆ بوەستە تا پفدراوەکە لێ دەخوڕم چونکە، بەپێی بیروڕای  من پفدراو دەبێ لێ بخوڕێ ".

تۆپە دژە تانکەکانی ڕووس دەستیان بە وەڵامدانەوە کردو، یەکەم کۆمەڵە تانکی تێکشکاو بەتەواوی وەستابوون و دەسووتان، گڕە سوور داگیرساوەکان دەورپشتی تەنە پۆڵایینەکانیانیان دەلێستەوەو ڕووبارە دووکەڵی خەستی، لووسی، ڕەش وەك ڕەژوو، بەرەو ئاسمان هەڵدەچوو.

ئێمە لەسەرەخۆ ڕێگامان بەرەو پێش گرتەبەر، نارنجۆك هاوێژەکانمان لەژێر حەشارگەدا لەدواوە خۆیان مەڵاس دابوو، ئامادە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ تۆپخانەی ڕووسەکان کە جارێ لە جاران سەنگەرەکانیانمان تێکشکاندبوو، لە دەوروبەری نیوەڕۆدا ڕووسەکان کشانەوە. ئێمەش هەرکە بڕێکی زیاتر پترۆڵ و جبەخانەمان وەرگرت بەهەموو خێراییمانەوە کەوتینە شوێن دوژمنی پاشەکشە کردوو. ناوناوە لە گوندێکدا دەوەستاین کە ڕووسەکان بەرگریان تیایدا دەکرد و کە  دەبوایە دووکەڵ باران بکرێن و ئنجا گوندەکە بسووتێنرێت، لە ماوەی چارەکە سەعاتێکدا گوندەکە نەدەما، تەنیا ئاگر نەبێ کە ئێمەش بەنەڕە نەڕەوە بەناویدا دەڕۆیشتین و هەموو شتێکمان لەپێش خۆماندا دەدوورییەوە، سەرباز، پیاو، ژن، منداڵ و ئاژەلیش. ئەگەر خانوویێکی ئاگر تێبەربووش لەسەر ڕێگەمان بوایە ئەوا بەنەڕە بەناویدا ڕەت دەبووین و، ژمارەیەکی زۆر چەخماخەمان بەو لاو بەم لای خۆماندا دەنارد، لەکاتێکدا تیشکی گڕدار دەکەوتنە سەر تانکەکەو بۆ ماوەیەك بەدوایدا دەکێشران، وایان لێ دەکرد وات دەزانی ئەویش ئاگری گرتووە. سەربازە ڕووسەکان دەیانزانی چۆن دەمرن. زیاتر لە جارێك ئێمە ژمارەیەك لەوانمان دەدیت کە شوێنی ستراتیجیمان داگیردەکردو بەرەو پێش چوونی ئێمەیان دوادەخست تا دوایین گوللەیان

بەکاردەهێنا، یان تا ئەوان خۆیان لەژێر زنجیری دەبابەکانمان وردوخاش دەبوون. شتێکی نامۆیە ئەگەر کەسێك ببینی یەکسەر لەپێش تۆدا درێژ بووبێ یان دانیشتبێ یان ڕابکات یان بەشەلە شەل بڕوات و، تۆش بەلایەکدا لێی لانەدەی، بەڵکو ڕاستە و ڕاست لێ بخوری و بەسەری بکەوی، بەڕاستی نامۆیە. تۆ هەست بە هیچ ناکەی، تۆ تەنها دەرك بەوە دەکەی کە هەست بەهیچ ناکەی. ڕەنگبێ ڕۆژێکی تر، لە حەفتەیەکدا، لە مانگێکدا، لە ساڵێکدا، لە پەنجا ساڵدا، بەڵام نەك یەکسەر لەو ساتەدا. هیچ کات نییە بۆ هەست کردن. تەواوی کارەکە بریتییە لە شتێك کە یەکسەر ڕوودەدات. بەردەوام دەبێ، وێنە و هاتووهاوار. زۆر بەتوندیی پەی پێدەبرێ و یەکسەریش بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەلایەکدا دەچێ، دواییش ئنجا ڕووداوەکە شیدەکرێتەوە.

ئێمە ئاشنایەتیمان لەگەڵ تانکە قورسەکانی ڕووساندا پەیداکرد، ئەو جانەوەرە زلە نەوەت یان سەد تۆنانە، خۆیان و تۆپە (٢٢ cm)کانیان کە لە بورجە گەورەکانیانەوە دەرپەڕی بوون. هەر چۆنێك بێت، لە شەڕی وادا مەترسییەکی ئەو تۆیان بۆ ئێمە نەبوو. ئەو فیلە تەنانە زۆر لەسەرخۆ بوون. ئێمە بەئاسانی یەك لە دوای یەك تێکمان دەشکاندن.

دوای هەشت حەفتە لەبەرەو پێش چوونی بەردەوام، توانای شەڕکردنمان دابەزی و لە (پودۆلسك) لە خوارووی ڕۆژئاوای مۆسکۆ وەستاین. لە ناوەندە زستانی ڕووسیادا وەستاین کە تووشییەکەی هیچ سنوورێکی بۆ نییە. هەزاران سەربازی ئەڵمانی بەهۆی سەرما بردەییەوە گیانیان لەدەستدا. کاروانێکی درێژی بێ دوایی ڕێکخرابوو بۆ گواستنەوەی ئەوانەی گەنگرین قاچێك یان دەستێکی لێ سەندبوون.

پێداویستییەکانمان بڕا. پترۆڵ و جبەخانە بۆ تانکەکانمان نەبوو. لە ناوەڕاستی ڕووسیادا بووین لە (٥٨) پلەی سەدی ژێر سفرەوە، کەسیشمان فەڕو یان تەجهیزاتی زستانەی وای نەبوو کە لە کرێوە و تۆفی زستان دووری بخاتەوە. زۆر جاری وا دەبوو ئەو ژانە شێتانەیەی دەست و لاقەکانمان وای لێ دەکردین وەکو منداڵی ساوا ناڵە و هاوارمان بێت. کەس نەیدەتوانی بۆ ماوەی دە دەقیقە بەبەردەوامیی پاسەوانییەتی بگرێت، چونکە ئەمە مانای مردنی مسۆگەر بوو. ئەگەر هەر یەکێك گوللەی بەر بکەوتبایە، شوێنی بەرکەوتنەکەی یەکسەر دەی بەست و وشك دەبوو. دیتنی لاشەی بەستووی شۆڕ بووەوە بەقەدی درەختێك یان لێواری کەندەکێك دیمەن و ڕووداوێکی ڕۆژانە بوو.

نۆرەی ئەوە هات کە ڕووسەکان دەستپێشخەری بکەن، ئێمەش ڕێزێکی ڕاستەقینەمان بۆ یەکە سەربازییە سیبیریاییەکانیان هەبوو، کە بۆ جەنگی زستانە مەشق درابوون. ئەوانە بێ وەستان و بێ بەزەییانە ئێمەیان دەکوتا. ئەو چەند هەزار تانکەی هەمان بوون لەبەر بێ پترۆڵی لەکار کەوتبوون، بەڵام ئەگەر پترۆڵی هەموو دنیاشمان هەبوایە دادی نەدەداین، چونکە هەموو مەکینەیەك بەستبووی و لەکار کەوتبوو، کە دەستت لە شەفتی ستێرن و گێڕەکان دەدا لەرزیان پێدادەهێنایت، هەر دەتگوت لە شووشە دروست کراون.

لە (٢٢)ی دێسەمبەری ١٩٤١دا، دوای سێ حەفتە، کە بە شەوو ڕۆژ بەبەردەوامیی پەلامار دەدراین، ناچار بووین لە کرێوەو تۆفدا پاشەکشە بکەین. هەموو تانکەکانی خۆمانمان تەقاندنەوە بۆ ئەوەی نەکەونە بەردەستی دوژمن. ماندوو و شەکەت و نیوە کوێرانە بەهۆی بەفرەوە، بەلاکە لاك بەرەو ڕۆژئاوا ڕێمان گرتە بەر.

من لەنێوان پۆرتا و پیرەئانەوە دەڕۆیشتم، لەبەر سەرما و برسییەتیی و بێتاقەتیی ئەوەندە نەخۆش بووم کە ئەوانی وا لێکرد بەشی زۆری ڕێگا هەڵم بگرن. کە دەکەوتم و هەر بەڕاکشاوی دەمامەوە ئەوان لێیان دەدام و لەعنەتبارریان دەکردم تا وایان لێدەکردم دووبارە بکەومەوە ڕۆیشتن. سوپاس و پێزانین بۆ کۆششی سەرسەختی ئەوان کە من و تیپ تووشی هەمان چارەنووسی هەزاران کەس نەبووین کە بەڕاکشاویی لەناو بەفردا مانەوە، چونکە مانەوە لەوێدا و لەسەرما بەستن تا مردن زۆر خۆش بوو. ڕووسەکان هەمیشە بەدوامانەوە بوون. سەرما بۆ ئەوان هیچ مانایێکی نەدەبەخشی. ئەوان توانای ئەوەیان هەبوو بەردەوام بجەنگن.

لەبەرئەوەی فەوجێکی سزادراو بووین بۆیە بەشێوەیێکی سروشتی پاشەی یەکە کشاوەکانمان پێکدەهێنا، هەروەکو چۆن لەکاتی پەلامار دانەکەدا پێشەنگی پەلاماردەرەکان بووین.
کەمێك لەخوار (کالینین)ەوە فەرمانمان پێدرا کە لەناو بەفردا خۆمان چاڵبەند بکەین و سەنگەرەکەش کە گوندی (گۆرانیا) بوو بە هەر نرخێك بێت بیپارێزین. ڕۆژانێك بە دواداهاتن کە تەحەمول نەدەکران، ڕووسەکان بە زێدە ڕۆییەوە لە پەلاماردان بۆ سەر سەنگەرەکانمان بەرەو مەرگ دەچوون. هەزاران و هەزاران کوژراو لەبەردەم سەنگەرەکانمان کەڵەکە ببوون، کە چی سەرسەختانە کۆمەڵە مرۆڤی تازەیان فڕێدەدایە ناو شەڕەوە، ئەمە یەکێك بوو لە ڕەشە کوژییە مەزنەکان ! .

ئێمە کراین بە دەستەیەك کە دووازدە نەفەر بووین، پیرەئانیش کرا بەپێشەوای دەستەکە. شەوێکیان ڕووسەکان هێڵەکانی بەرگرییان بەزاند و لە پشت هێڵەکانمانەوە لەسەر ڕووبەرێکی پازدە میلیی بڵاو بوونەوە.

من له پشت ڕەشاشێکەوە ڕاکشابووم لەگەڵ ئاسمۆس و فلیشمان، گولله بارانی شەپۆڵی پەلامار دەرەکانم دەکرد، لەوەش ئاگادار بووین نەبادا سەربازەکانی خۆمان بدەینە بەر، چونکە هەردوو لامان، ئێمە و سەربازە ڕووسەکانیش پاڵتۆی سپی درێژی کڵاودارمان لەبەر بوو. بەزۆری بەهرەمەندیی ڕابەرایەتی ئێمەی دەکرد.

لەناکاو لە پشتمانەوە گوێمان لە هاوارێکی گەورە بوو بەزمانی ڕووسی، ڕەشاش و دەمانچە ئۆتۆماتیکییەکان و، نارنجۆکە دەستییەکانی خۆمانمان کۆکردەوە و ئنجا ڕامان کرد، تەنیا هەر بۆ خۆ دەرباز کردن !

ئێمە هەموومان جگە لە ئاسموس نەبێت بەرەو دواوە ڕامان کرد، بەڵام ئەو گێلە ڕاستەوخۆ بۆ لای ڕووسەکان چوو.

ڕاکردنەکەی ئێمەش هەر وا بوو، چونکە دەورەمان گیرا بوو.

بەبێ ئارەزوویەکی زۆرەوە من ئەم بەشە دەنووسم لەسەر ئـەو ماوەیـەی کـە تیایدا زیندانیی بووم.

من دەزانم کە پشتگیری کردنی باری سەرنجەکان سـوود بەخـشە کـە بێگومـان هـیچ هاودەردییێکم لەگەڵیاندا نییە، لە کاتێکدا لایەنی بەرامبەر بە بێگومانەوە نـاوم دەنـێ درۆزن یان تەڵەکەباز، ناپاک بۆ کێشەی خەڵک.

لە دوای خوێندنەوەی ئەم بەشە، پابەندانی یەک لە بۆچوونەکان بـە پێنووسـە سوورەکانیانەوە خـەریک دەبـن و بـە قورسـیی هـێڵ بـەژێر فەقەرەکانـدا دەهێـنن سـەرکەوتووانەش ڕوون کـــردنەوە دەکـەن : لـەوێ ! ئەمـە لـەوە دەچـێ لـەوێــدا لەسـەرەوە هـەیـــە ! خـــوێت ببیـنـــە. شـایـــەد عەیـانـــێک ! قـسەکانی شایـــەد عەیانێک بخوێنەوە ! گوێ لە ڕاستییەکان بگرە لە بابەت ڕووسیای سۆڤییەتەوە !

ئەگەر هەر کەسێک پرسیارم لێ بکا کە ئایا لـە ڕووسـیادا " کاروبـار وایـە " ئەوا من دەتوانم تەنیا ئەو وەڵامە بدەمەوە کە لە ڕاستیدا نازانم. (USSR) ولاتێکـی گەورەیە، من تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت لەوێ بووم و کەمێکم لێی دیـت، لـە کاتێکـدا بارودۆخی مانەوەی من بەجۆرێکی وابوو بەتەواوی بۆم نەدەرەخسا کە هیچ تەماسێکی تایبەتی بکەم یان هیچ بیرورِاییێکی تێکرِایی وەدەسـت بهێـنم، هـەر شـتێک بەتـەنیایی لێبگەرِێ ئەوەندە ئاڵۆز وەک مەزەندەکردنێک بۆ چۆنیەتی اشتەکان).

من وەکو دوژمنێک هاتمە ولاتێـک کـە زەمینەیـەکی هـەبوو بـۆ نـەفرەت لـێ کردنم و بە دڵرەقیـی مامەڵـەکردن لەگەڵمـدا ، لەلایـەکی تریـشەوە بەتـەواوی بـێ موبالات لەوەی کە چیم لێ قەوماوە. منیش، لـەدوای ئـەم هـەموو شـتەدا، یـەکێک بووم لەوانـەی کـە دەسـتم هـەبوو لـە سـوتاندنی هـەزاران گونـدو تێکـدانی ژیـانی ملیۆنەها کەس.

من بەشداری لەو ڕایە سادەیە ناکەم کە نازیزم و دیموکراتییەتی میللی یەکن و هەمان شتن و، ستالین و هتلەریش هەمان میزاجیان هەیە. هەر تەماشاکردنێکی وێنەکانیان ئەوە دەردەخات کە ئەمە ورێنەیە. هتلەرکابرایێکی هێستیری بوو، ستالین زەلامێکی سەرسەختی وابوو کە ئەوەندە هۆشەی هەبوو یاری بە شۆڕشەکان نەکات، بەڵام بەتەواوی، زانستانە و بەئارامییەکی بێ سنوورو بەئاگادارییەکی بەدگومانیانەی بێ سنوور لەسەر ڕێبازی خۆی ڕۆیشت، ئەو گێل نەبوو، بەڵام بە تەئکید یەکێک نەبوو لە ڕۆڵە باشەکانی پەروەردگار. بەڵام چونکە خودی خۆی ناناسم، بۆیە پێم باشترە مەزەندە نەکەم. هەروەها وەکو چۆن دەم و چاوی هەردوو پیاوەکە بەراورد دەکەن، دەتوانن نووسینەکانیشیان بەراورد بکەن، ئەمانەش دیسان ئەوەتان بۆ دەردەخەن کە هتلەرو ستالین ئەوەندە دوورن لەوەی پێک بچن وەک دووریی دوو پیاو لەیەکتری.

وەسفکردنی ئەو کاتەی کە تیایدا زیندانیی جەنگ بووم لای ڕووسەکان نابێ وەکو بەڵگە وەربگیرێ و بەکاربێ، نە بۆ بەرژەوەندی سۆشیالیزم و نە دژ بەو، نەبۆ بەرژەوەندی ستالین و نەدژ بەو، نەبۆ بەرژەوەندی ڕۆژهەڵات و نەدژ بەو. مادام هیتلەرو هەواداردانی، هەم ئەوانەی کە مردوون و هەم ئەوانەش کە زیندوون و لێرەو لەوێی ئەم جیهانەدا دەژین، تا ئێستا کاریگەرییەتی بەکاردەهێنن، وەک ئەوەی دەیکەن، ئەوا بڕینی ئەم هەموو ڕێیە بۆ مۆسکۆ لەپێناو دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەو ترسەی کە هەموو جیهان بەدەستییەوە دەناڵێت، دەبێتە ڕەنج بەبادانێک. مادام ئازادیی دیموکراتی زیاتر نییە لە کێشەیەکی دان پیانراو ئەوا ئێمە هیچ مافێکی ئەخلاقیمان نابێ بۆ ماڵینی هیچ شوێنێک تەنها پێش دەرگا پیسەکانمان نەبێ.

سەرەڕای ئەمە، تۆ دەتوانی بەدڵشادییەوە ئازادیەکەی خۆت بپارێزی، ئەوەندەی ئەو بابەتە پەیوەندی بەمنەوە هەبێت، ئەوەندە ڕێگەم پێدەدریٚ کە هێمنیی خۆم بپارێزم. پیٚ داگرتنم لەسەر ئازادیی بەو ئاراستەیە نییە کە تفەنگ بتەقێنم، چونکە جەنگم تاقیکردۆتەوە، من بە ئارەزووەوە سەرم هەتا بۆ توندترین ناچارکردن شۆڕدەکەم، ئەگەر ئەمە پێویست بێت، بۆ ئەوەی بتوانین ژیانمان بەئاشتی بەسەر ببەین، وەکو لە ڕاستیدا وایە. هەر ئەوەندە بەس نییە بوەستین و بڵێین: ئێمە هیچی تر جەنگمان ناویٚ، ئنجا وا بزانن کە بەشێک لە ئەرکەکانتان بەجیٚ هێناوە. پێویستە سووربوونێک لەسەر ویست و ئارەزوو هەبێت. هەندیٚ کەس وا دەبینن کە هەمووان بەشی خۆیان دەست دەکەویٚ بۆ خواردن، کە هەموو پلانە مرۆڤایەتییە گەورەکان و هەموو پرۆگرامەکان لەسەر کاغەزەوە کراون بەڕاستیی. هەروەها پێویستی بەرەنجێکی گەورە دەبیٚ، کە لەوانەیە بۆ چەند نەوەیەک درێژە بکێشیٚ. پێویستی بەدان بەخۆنان و خۆگریی دەبیٚ بۆ دروستکردنی مەکینەی گەورە کە بەرهەم هێنان و دابەشکردنی خۆراکی تەواو بۆ هەمووان دابین دەکا. پێویستی دەبیٚ بە قورسترینی هەموو جۆرە ناچارکردنەکان : کە ئەویش ملکەچییە بۆ پێداویستییەکانی کامەرانیی گشتی، کە پێویستی بەوەیە هەیە هەمووان واز لە ئیسراحەت و پاڵدانەوەو خۆبەدەستەوەدان بهێنن، کە پێویستی بەوەیە خەڵک خود لەبیر بکەن، ئەوە واز لیٚ بهێنن کە هەر بۆ خۆیان دەژین و، یەک لاکردنەوەی ئەم جۆرە تاکایەتییە کە هەر تەنیا مافەکانی تاک دەناسێت - کە هەر بۆ خۆیانی کۆ دەکاتەوە - بەڵام ئەمە ئەوەندە ماندووکەرو بێزارکەرو نارەحەتکەر دەبێت، کاتیٚ یەکێک جەسارەت بکاو ئەرکە تاکییەکانی خۆیانیان وەبیر بهێنێتەوە. ئێمە هەموومان زۆر لە بارەی ئازادییەوە دواوین لە قسەکانماندا ئاماژەیەک هەیە بەوەی کە ئارەزووومان لە ئەشکەنجەدانی خەڵکانی تر هەیە. یان، ئەوەی کە زۆر ڕیسواکەرە،

ئەوەیە کـە دەمانـەوێ خـەڵکانی تـر یـەکتری ئەشـکەنجە بـدەن، لـە کاتێکـدا ئێمـە تەماشایان بکەین و سوودیان لێوەر بگرین.

هەر چۆنێک بێت، دوو هۆکاری پەیوەست هەن کە بۆچـی مـن سـەرەڕای بـێ ئارەزووییم و ترسم لەوەی کە بەهەڵە لێم تێ بگەن، لەسەر ئەو ماوەیە دەنووسم کـە تیایدا زیندانیی بووم. یەکەمیان ئەوەیە وەسفکردنەکەم بۆ جەنگ، وەکو خـۆم تـاقیم کردبێتەوە، بەبێ ئەم بەشە ناتەواو دەبێت، دووەمیشیان ئەوەیە کە بەشێکی وا، زۆر پێویستە بۆ کتێبێک کە مەبەستەکەی دژایەتی کردنـی هـەموو جەنگـە، کـە هـەمووە بەڵام پێچەوانەی پیشاندانی ئەوەیە کـە لـە یەکیـەتی سـۆڤییەت " شـتەکان بەچـی دەچن " کە زەوی و زارێکی پان و پۆڕەو - ڕێم پێ بدەن ئەمە دووبارە بکەمەوە - من هیچی لێ شارەزانیم، ئەوە نەبێ کەوا دێتە هـزرم ئەوەنـدە مرۆڤانـەو نارێـک بێـت لەکاتی ئاشتیدا وەکو هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆڤانەی تر، بەواتایێکی تر: تەواو ئاسایی و بە بەردەوامیی.

# دیلییەتی

**هیچ شتێك نییە ئەوەندەی گرتن پیاو ملکەچی نائومێدیی بکات.**

من و فلیشمان لە خانوویێکدا لە گوندی کلن گیرابووین و سەربازێکی سۆڤییەتییش لە دەرەوەی دەرگاوە پاسەوانیی دەکردین. بەدرێژایی ڕێگای هێنانەوەمان لە بەرەی جەنگەوە تا ئەو کاتەی لە بنکەی خڕکردنەوەماندا لە گوندی کلن تەسلیم کراین پێلەقە و تف و جوێن و لەعنەت وەك باران بەسەرماندا دەباری. لەلایەن ئەفسەرێکەوە کەوتینە بەر پرسیار لێکردن، دەیویست بزانێت فەوجەکەمان چۆن پێکهاتووە و هەموو شتێکی تریشی لە بارەیەوە دەویست. لە ڕێگاماندا بۆ خانووەکە ئەوانمان دیت دە تفەنگداری (SS)یان دەکوشت، سندوقی بەتاڵی تەقەمەنییان دەکێشا بەپشتی ملیاندا، لە جێیەکی دیکەشدا مێجەرێکیان بەدەرگاوە لە مێخ دابوو، هەندێکی دیکەش بەقۆنداخە تفەنگ و بەقامچی قۆزاقیی ئەنجن ئەنجن دەکران.

زەنگی تۆڵەسەندنەوە دەستی بە لێدان کردبوو.

لە پاشان، شەوێ بەجووتە لە دوو ڕیزی گەورەی هەزار کەسیدا خڕیان کردینەوە و پاسەوانانی سوارە بەرەو ڕۆژهەڵاتیان بردین، ماوەمان پێنەدەدرا هەنگاوێك لە ڕیزەکانمان بێینە دەر، بۆیە دەبوایە لەناو پانتۆڵەکانماندا بڕین. ئەوانەی لەناو بەفرێدا دەکەوتن بە قامچیان تێیان بەردەبوون تا دووبارە ڕاست دەبوونەوە، خۆ ئەگەر توانای هەستانەوەیان نەبوایە، ئەوا بە شیر لێیان دەدان.

دوای سێ ڕۆژ گەیشتینە گوندی کمری، لەوێ خراینە تەویلەیێکی گەورەوە و یەکەم ژەمە خۆراکیان پێدایین هەر لەو کاتەوەی کە گوندی (کلن)مان

جێهێشتبوو. خواردنەکە بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات و بڕێکی زۆر کەمیش بوو، سەرەڕای برسییەتی بێ ئامان، پێمان قووت نەدەدرا.

من و فلیشمان بڕیاری ڕاکردنمان دا، گیراوەکان ڕێگەیان پێدەدرا بچنە پشت تەویلەکەوە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، جا لە گەشتێکی وادا هەلمان بینی و تا هێزمان تیا دابوو بەناو کێڵگەکاندا بۆی دەرچووین، لە دووریی سێ سەد یاردەیەك لە تەویلەکەوە لەو سەر تا ئەو سەری گۆمێکی سەهۆڵ بەنداندا ڕامان کرد، هەر ڕامان کرد بێ ئەوەی هەست بە هیچ ماندوو بوونێك بکەین، تەنیا هەستمان بەترس دەکرد، بەدرێژایی شەو ڕامان کرد و، ئاراستەمان لە ئەستێرەکانەوە وەردەگرت، کە زۆر چاك دەم زانی، چونکە سەردەمێکیان هەوەستم بە ئەستێرەناسیی دەهات. بەناو دارستانێکی گەورەدا و ئنجا لەم سەر تا ئەو سەری دەریاچەیەکی شەختە بەستەدا ڕامان کرد. هاتبوو بگەینە ئەو لای تری دەریاچەکە، کاتێ سەربازێکی فەڕوە لەبەر هاواری کردینێ، بەڵام ئێمە لە ڕاکردندا نەوەستاین. دەرزەنە گوللەیەکی پێوە ناین، کە لە بناگوێمانەوە ویزەیان هات بەڵام هیچیان نەیان پێکاین. پاش چەند دەقیقەیەك لەژێر چەند تەڕاشێکدا ڕاکشاین.

ئەو ئێوارەیە گەیشتینە چەند کووخێك و خۆمان لەناو تەویلەیەکدا شاردەوە، ماوەی بیست و چوار سەعات لە وێدا ڕاکشاین و ئیسڕاحەتمان کرد. مریشکێکمان دۆزییەوە، ملیمان هەڵکەند و هەر بەخاوییەوە خواردمان. ڕۆژی دواتر چووینە پەناگەی تەویلەیەکی ترەوە، کە لە وێدا لەژێر هەندێك کۆنە پووشدا کە لەلاییێك خڕکرابووەوە چاڵێکی قووڵمان لێدا.

دوای نیـوەڕۆ، هـاوڕێ لەگـەڵ ترسـەوە، لـە کێڵگەکـەوە گوێمـان لـە هـاوارکردنێکی زۆر بـوو، کـاتێکیش بەئاگادارییـەوە لـە کـونێکی بانەکـەوە ڕوانیمان پێنج سەربازی ڕووسیمان بەدی کردن کە دوو سەگیان لەگەڵ دابوو، پـاش هاتووهـاوارێکی زۆر لەگـەڵ دانیـشتوانی کێڵگەکـە، ئـەوێیان جێهێـشت. ئێمـەش بۆ مـاوەی چەند سـەعاتێکی تـر هـەر لـەوێ ڕاکشاین و هەرکـە تاریکی کەوت، وامان پێباش بوو بۆی دەرچین.

پیاوە پیرەکە بە دیتنی ئێمە لەناو کێڵگەکەیدا سەرسام نەبوو. هـەر تـەنیا بە ئەڵمانییە شکاوەکەیەوە پرسی :

– گیراوی جەنگن ؟ .

ئێمەش سەرمان هەڵتەکاند.

ئێمەی بردە ماڵی خۆی و خواردنی پێداین. لە ژوورەکەدا پیاوە پیرێکی دیکـە و چـوار ژن دانیـشتبوون. بەهێمنییـەوە بـەخێرهێنانیان کـردین و جێیـان لەسـەر مێزەکـە بـۆ کردینـەوە، کـە گۆشـت بـەرخ و پەتاتـەی کـوڵاوی ئـەوانمان دەخـوارد، بەدزییـەوە تەماشـایان دەکـردین. کەسـیان قـسەی نـەکرد. پـیرە جوتیارەکـە ڕێگـەی پێـداین لـەوێ، لـە ژوورەکـەدا بخـەوین، بـۆیێ بەتـەواویی حەسـاینەوە، بـەیانیش سـەرو پـانتۆڵ و چـاکەتێکی ئەسـتووری داینـێ کـە پێکدەچوون، جل وبەرگی باش و گەرم بوون، سوودێکی یەکجار زۆریـان لـەوەدا هەبوو کە سەرچاوەکەیان دیار نـەبوو، بۆیێ دەکرا بە ڕۆژ سەفەریان پێبکەین بـێ ئـەوەی تووشـی موجازەفـەی ناسینەوە بین بـەهۆی بەدلـە ڕەشـەکانمانەوە. خواحافزییێکی گەرممان لەو کەسە کەمدووە، میهرەبانانەوە وەرگرت.

بۆ ماوەی چوار ڕۆژی تر بەرەو ڕۆژئاوا ڕێمان گرتە بەر، بەلاَم لە پاشان بەیانییەکی زوو بێبەختی دایگرتین. کاتێك لە جەنگەڵستانێکی بچووکەوە دەرچووین ڕووبەڕووی هەندێك سەربازی ڕووس بووینەوە، ڕەنگبێ لە زەوییەوە دەرچووبن, داوای بەڵگەنامەکانیان لێکردین. من بەدانیمارکی دەستم بە قسەکردن کرد، بەلاَم لێم تێنەگەیشتن. ئنجا زمانی ئینگلیزیم تاقیکردەوە کە ئەمەیان باشتر بوو. پێم ڕاگەیاندن کە ئێمە دانیمارکین و لە کامپێکی گرتووخانەی ئەڵمانی بووین و لە فەوجێکی سزادراودا فیلارمان کردبوو. لەو یەکە سەربازییە ڕووسییەی کە بۆی نێرراین پێیان ڕاگەیاندین کە بچین بۆ مۆسکۆ، بەلاَم لە چوونمان بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر، ڕێمان بزرکرد.

دوای ئەمە چەندو چۆنییەکی فراوان ڕوویدا، ئەوەی لێی تێگەیشتم ئەوە بوو کە باوەڕییان بەقسەکانم نەکرد، لەدواییدا ئێمەیان بردە لای فەرماندەکەیان. لە ڕێگادا یەکێکیان چاوی بڕییە سەعاتەکەی دەستم و ئیتر هەر لەو ساتەوە بێ سەعات بووم، یەکێکی تریشیان ئەو زنجیرە زێڕەی برد کە ئۆرسوڵا پێی دابووم. فەرماندەی یەکە سەربازییەکە زۆر بەڕێزەوە مامەڵەی کردین و ڕاشکاوانە لێپێچانەوەی لەگەڵدا کردین، پرسی کە ئایا ئێمە کۆمۆنیستین، پێمان گوت بەڵێ، بەلاَم زاتی ئەوەمان نەکرد وا خۆمان پیشان بدەین کە ئەندامی حیزبیین، چونکە لەم بارەدا دەبوایە ئەمە ساغ بکرێتەوە. منە منێکی نارەزایی لێوە هات لەبەر نەبوونمان بە ئەندام، بەلاَم شتە سەرەکییەکە ئەوە بوو کە ئێمە کۆمۆنیستی باش بووین.

ڕۆژی دواتر براین بۆ ویستگەی شەمەندەفەڕ بەیاوەریی دوو سەرباز کە بۆ ئەوەی لە مۆسکۆ بمان دەنە دەست (GPU) * تا لێکۆڵینەوەی زیاترمان لەگەڵدا بکەن، پاش سی و شەش سەعات لەناو شەمەندەفەڕدا ئنجا لە وێستگەی مۆسکۆ خراینە ژوورێکەوە، ژوورێکی فراوان بوو، پەنجەرەکانی سیمدار بوون، ژوورەکە دەیڕوانییە سەر هۆڵێکی گەورەی وێستگەکە، کە پڕ بوو لە سەربازو خەڵکی مەدەنیی. زۆریان سەردەکەوتن و تەماشای ئێمەیان دەکرد. بۆ ماوەی چەند سەعاتێك چاوەڕێمان کرد پاشان پێنج چەکداری پڕ چەکی (GPU) هاتن و ئێمەیان وەپێش خۆیاندا بۆ ناو ئۆتۆمبێلێکی ڕەشی، گەورەی سەر بە پۆلیس. بەخێراییکی شێتانەوە بەناو شەقامەکاندا بەرەو گرتووخانەیەکی گەورە چووین.

فلیشمان چرپاندی و گوتی: " بەخوا تووش بووین، یان گوللە بارانمان دەکەن یان دەمان نێرن بۆ سیبیریا ".

چرپاندنەکەی فلیشمان بووە مایەی ئەوەی لێدانێکی بەردەوام لە قۆنداغە تفەنگەکانیان بخۆین کە وامان لێهات بە نیوە بێ هۆشییەوە لەسەر کورسییەکان بکەوینە خوارەوە، بەڵام چەند پێلەقەییێك لە زگمان زوو ئێمەیان خستەوە سەر پێیان. بەناو ژمارەیەك حەوشەی بەندیخانەی تێلبەنددا ڕەت بووین و لەبەردەم دەرگاییێکی بچووك وەستاین، کە لە وێوە بەسەختیی تێ هەڵدراین. براینە فەرمانگەیەك کە لەوێ ئەفسەرێکی (GPU) بە کۆڵەمستی چاك پێشوازی کردین، بەتەواویی وەك هەمان ئەو تێهەڵدانەی کە کابرای (SS) لە لینگریس دەرخواردی منی دا.

---

★ GPU :-

Government Political Administration بەڕێوەبەرایەتی سیاسیی حکومیی .

دوای ئەوەی تایبەتمەندییەکانمانیان خستە ناو تۆمارگەیەکەوە ئێمە هەردووکمان گوتمان هاووڵاتی دانیمارکین - ئێمەیان بردە ژوورۆچکەیەك کە بیست و پێنج کەسی تریشی تێ ئاخنرابوو. شەریکەکانمان لەسەر هەموو جۆرە تاوانێك گیرابوون کە پیاو هزری بۆ دەچێت، هەم تاوانی سیاسی و هەم مەدەنیی. عەریفێکی سوپای سوور، کە قورگی ژنەکەی خۆی بەچەقۆ بڕی بوو، بەدڵنیایی شارەزاییێکەوە پێی ڕاگەیاندین کە :

- لە ماوەی دوو مانگدا دەتان نێرن بۆ کامپێکی ئیش کردن. ئەگەر ئیشەکان بە دروستی بکەن ئەوا لەوێدا بەخۆشیی بەسەر دەبەن، شتی سەرەکی ئەوەیە هەتا دەکرێ کەم بکەن، ئەوەی دەشی کەن دەبێ خراپ بێ. هەروا، ئەوەش بزانن کە دەتوانن دۆستایەتی لەگەڵ زەلامێکی (GPU) ببەستن بەهۆی {ڕێکخستنی} چەند شتێك بۆی، لەو کارگەیەی کە ئیشی تێدا دەکەن، بەڵام بێگومان ئەمەیان دەبێ شتێکی باش بێت.

پرۆفیسۆرێك لەوێ بوو کە خەڵاتی ستالینی پێدرا بوو، بەڵام بەوە تاوانبار کرابوو کە چالاکی دژ بە دەوڵەتی هەیە. مزی ئەمەش بیست و پێنج ساڵ ئیشی قورس بوو. پێی گوتین ئیمکان نییە بەشێوەیەکی یاسایی لە ڕووسیا دەربچن، بۆیە ئامۆژگاری ئەوەی کردین کە هەر چی زووە بۆ خۆمان ڕاکەین.

تەنیا دوازدەمان دەمانتوانی لەیەك ساتدا ڕاکشێین، لە سووچێکی ژوورۆچکەیەکدا، پەقرەجێکی بێ سەرپۆش دانرابوو. بۆگەنییەکەی وابوو کەس بەرگەی نەدەگرت و بەجلەکانتەوە دەنووسا. سەرەڕای ئەسپێ و برسییەتیش. بەڵام سەرمامان نەبوو. شەوو ڕۆژ ئارەقەمان لێ دەچۆڕا دەتگۆت لەگەرماوێکی توورکی داین. ئەگەر لەسەر شانی یەکتریدا بوەستابین،

لەخوارەوە حەوشەیەکی گەورەمان دەدیت کە شەوانە، دەیان گیراوی ژن و پیاویان تیادا لە سێدارە دەدا. ئەو دەنگەی کە من لەو بەندیخانەیەدا پەیوەستی بووم دەنگی دەستڕێژو گڕەی لۆرییە گەورەکان بوو. وەك هەموو کارەکانی گواستنەوە لە مۆسکۆ، جێگۆڕکێی زیندانییەکان بەشەو دەکرا.

لەلایەن کۆمیسارێکی گەنجەوە لێپێچانەوەمان لەگەڵدا کرا. لێپێچانەوەکە پێنج سەعات درێژەی کێشاو هەموو شتێکمان لە بارەی خۆمان و خاوو خێزانەکانمانەوە پێ گوت. دوای دوو ڕۆژ لێپێچانەوەیەکی ترمان لەگەڵدا کرا، کە هەر هەمان پرسیارەکانی پێشوویان لێکردین بەڵام بەشێوازێکی تر. بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەمەوە خەریك بوون و لە دواییدا گەیشتینە لێواری داڕمانی عەسەبی و ئەوەندە سەرسام بووین وامان لێهات خۆمان بە درۆ دەخستەوە. ئنجا هاوارێکیان کردینە سەرو پێیان گوتین کە کۆمەڵێك درۆمان پێ گوتوون و هەوڵی ئەوەیان دا کە وامان لێبکەن دان بەوەدا بنێین کە پیاوانی (SS) و سیخوڕین.

بۆ سێ ڕۆژی پاشتر هیچ لێپێچانەوەیەك نەبوو، پاشان براینە بەردەم دادگا و من بە دە ساڵ ئیشی قورس و فلیشمانیش بە پازدە ساڵ حوکم دراین، بەڵام لەسەر چی حوکم دراین، کەس پێی نەگوتین. هەموو کارەکە پێنج دەقیقەی خایاند.

کەمێك دوای ئەمە، دەرەنگانی شەوێك، ئێمە و نزیکەی دوو سەد زیندانیی تری نێرو مێ براینە وێستگەی هێڵی ئاسن و لە شەمەندەفەرێکی شت هەڵگردا بارکراین. لەهەر فارگۆنێك پیاوێکیان هەڵبژاردو کردیان بە جۆرە سەرکردەیەکی

زینـدانییان کـه بـەرپرس بـوو لـه هـەموو ئەوانـەی لـه فارگۆنەکـەی دان. ئـەو سـەرکردەی زیندانییانـه بـه زۆری ئەوانـه بـوون کـه پیاوەکـانی (GPU)* لەبـەر هەر هۆیەك بیٚ هەڵیان بژارد بوون، ئەوانـەش لـه ئاکـامی هـەر خراپـه کارییـەکی ڕاستەقینه یان خەیاڵیی، دەیان خوارد.

ئەوانەی لە کامیۆنەکەی ئێمـەدا بوون، سەر بەهـەموو چینەکانی کۆمەڵگـه بـوون. جووتیـارێکی لـیٚ بـوو بـه جلـی پینـەدار و پـێڵاوی لبـادی نارێـك. لـه تەنیـشتییەوە پیـاوێکی بـه تەمـەنتر ڕاکـشابوو بەبەدلـەیێکی بـۆر، پـیس و لۆچاویی، بـەڵام تـەرزێکی بـاش، پێڵاوێکیـشی لـه پـیٚ بوو کـه هـەر تـەنیا پیـاو ماقووڵەکان لە پێی دەکەن. لە بەرامبەر منیشدا ژنێك دانیشتبوو، فەرووی لەبـەر بوو، گۆرەویشی ئاوریشمێکی قەشەنگ بـوو. لـه تەنیـشتییەوە جوانـه کچێك بـه جل و بـەرگی ئـیش کردنـەوە. یـەك دووانێکـیش هـەبوون سـەرەڕای ئـەو سـەرما توندە جل و بەرگی هاوینەیان لەبەر بوو.

شـەمەندەفەرەکە بـەرەو ڕۆژهـەڵات ملـی نـابوو، بـەڵام بـۆ کـویٚ دەچـووین، کـەسمان نەیـدەزانی. ڕۆژیٚ سـیٚ جـار بـۆ ئاوبـانگ کـردن دایـان دەبەزانـدین. شێوازی هـەژماردنمان وابـوو کـه لـه یـەك ڕیـزدا ڕامـان بگـرن، ئنجـا سـەربازێك دەچووە دواوە و بـه قامـچییەکەی لێـدانێکی سـووکی لـه یەکـەم کـەس دەداو هـاواری دەکـرد ((یـــەك))، بـەم جـۆرەش تـا کۆتـایی ڕیزەکه بـەردەوام دەبـوو. بەیانییەکیان زیندانییەك لە فارگۆنەکەی ئێمەدا دیار نـەبوو، واش دەرکـەوت کـه ئەمە کۆنە ئەفسەرێك بوو کە لە شـەوێدا تـوانی بـووی دەرگاکـه بکاتـەوە و خـۆی تـووڕ بداتـه خـوارەوە. سـەرکردەی زیندانییـەکانمان لەبـەر ئـەم هەڵاتنـه ژیـانی خۆی لەدەست دا.

لـه کوویبــشەڤــ، کـه دەکەوێتـه سـەر ڤۆلگــا، چـەندین فـارگۆنی تـازەی زیندانییان خرانه سەر شەمەندەفەڕەکەمان. هەموو دانه ڕۆژێك هەندێکمان لەبەر سەرما و ماندوو بوونەوه لیٚ دەمردن. دەبوایه ئێمه لاشەکان لـەناو فارگۆنەکـەدا بپارێزین و بۆ هـەر ناوبانگ کـردنێکیش ڕایـان کێشینه دەرەوەو ئـەوانیش ئـەو قامـچیەیان بخواردبایـه. ڕۆژێکیـان، کـه لـه بۆگۆلۆوسـك وەسـتاین لـه قـوولایی چیاکانی ئۆراڵ، پاسـەوانەکان وەك شێتیان لـیٚ هـات، چونکه لـەناکاو دەرگاکـه کرایـەوه سـەر گـازی پـشت و دەسـتڕێژێکی گوللـه ڕاسـتەوخۆ ڕەوانـەی نـاو ئـەو فارگۆنـه کـرا کـه ئێمـه تیایـدا ئەوەنـده لـه نزیـك یەکـەوه ڕاکشابووین دەتگـوت ماسی ساردینین لـەناو قوتوودا. پاشان لەگـەڵ قاقـاییکی پێکەنینـەوه دەرگاکـه داخرایـەوه. دووان لـه ژنـەکان بەتـەواوی تووشـی هیـستریا بـوون و وەکـو سـەگ دەسـتیان بـه لـوورە لـوور کـرد، چـاوەکانیان سـەخت و کـراوەو کـەفیش لـه دەمیانەوه دەردەچوو. مـن و فلیـشمان یـەك لـه ژنـەکانمان چاودێریی کـرد، دوو کۆنه سەربازیش چاودێری ئەوەکەی تریان کرد. دەبوایه به زللەیێك لەسەر دەم و چـاویانەوه بیـان هێنینـەوه بـەرخۆ، وەکـو چـۆن لـه بـەرەی جەنگـدا لەگـەڵ ئەوانەدا دەمان کرد که شێت دەبوون. ئەمه بەردەوام بەتەواویی کاریگەره ئەگەر به وردبینیـی بکرێت و زللەکه وەکو تـەکانێکی لیٚ دێت. هـەردوو ژنەکـه هـاواره شـێتانەکەی خۆیانیـان ڕاگـرت و، گـرژه ڕاچـەنینێکیان کـرد، پاشـان بـۆ ماوەییێکی درێژ دانیشتن و کوڵ و کۆی خۆیانیان دامرکاندەوه.

لـه تۆبۆلــسك وەدەر نـراین. کـامپی ئیـشکردنەکەی ئـەویٚ هـیچ شـتێك لـه کـامپی تۆقانـدنی نازییەکانـەوه فێـر نـەبووبوو. پێیـان ڕاگەیانـدین کـه لـه مـاوەی چەند ڕۆژێکی کەمیی سەرەتادا دەمـان خەنـه بەر کـارکردن لـه دارسـتاندا، ئنجا

دەمان نێرن بۆ کارگە و ئیشی جۆراو جۆر. لەو باری بێ هێزییەماندا، کارە قورسەکەی ناو دارستانەکە ڕەنجێکی بەرگە نەگر بوو، شتێکی باشیش بوو کە ئەوەندەی نەخایاند، ئەگەر نا گیانمان لە دەستدەدا. لە پاشان من و فلیشمان نێرراین بۆ کارکردن لە کارگەیێکی نهێنی بۆ دروستکردنی لامپی دەزگای بێتەل بەپێی ئەو بڕیاردانەی کە خەڵکانی تر پێیان ڕاگەیاندین، ئێمە بەختەوەر بووین، ئەوانەی کە نێررابوونە کارگەکانی تەقەمەنی بەئاشکرایی وەکو مێش دەمردن.

ڕێگەمان پێدەدرا ڕۆژی پێنج سەعات بخەوین. لە کووخێکدا دەنووستین بە سێ زەلام یەك چارپامان هەبوو ئەویش بەبێ دۆشەگ و تەنیا بە یەك بەتانییە. ڕۆژی سێ جار سووپێکی خراپی ماسیمان پێدەدرا، بەڵام بەبێ نان. نان شتێکی خۆشگوزەرانیی بوو، ڕەنگبێ بە زۆری لەبەرئەوە بێت کە ناوچە بە گەنم دەوڵەمەندەکانی دەوروبەری دەریای ڕەش لە جەنگدا لە دەست چووبوون.

پاش ماوەیێکی کەم ڕەوانەی کامپێك کراین بۆ زیندانییانی ئازاد. ئەوەش شوێنێك بوو کە لەوێوە دەدراینە کارگە و پرۆژەکانی تر کە لەژێر چاودێری ڕاستەوخۆی (GPU) نەبوون و بارودۆخ تیایاندا مرۆڤانەتر بوو، مرۆڤانەش سەروبەریان لەگەڵدا دەکردین، لەوێ مامەڵەی نەرمت لەگەڵدا دەکرێت و هەروەها کەمێك کرێشت پێدەدرێت. ئەگەر بەڕاستیش زرنگ بیت ئەوا سەرکار ناچار دەکەیت کە وەك پسپۆڕ دابنرێیت، ئەمەش دەتکاتە زەروورەتێك.

شــەمەندەفەڕەكەمان بــۆ مــاوەی پێــنج ڕۆژ لەســەرخۆ دەڕۆیــشت تــا گەیــشتینە جەنیسیــسك لەســەر ڕووبــاری جەنــسی، لــە ڕێگــادا دەریاچــەی (كالونــدا)مــان بــڕی و لــەوێ بڕێكــی زۆری ماســی وشــككراومان دەســتكەوت و ئەوەندەمان خوارد وەخت بوو خۆمان بكوژین. جاری یەكەم بوو لە ماوەیەكی دوورو درێژدا كە تێر بەزگی خۆمانمان خواردبێت. ئای كە نەخۆشی خستین ! ورگە بــێ تاقەتــەكانمان نــەیان دەتــوانی جەمــە خۆراكی وا هــەرس بكــەن، هــەروا جێی گومانیش بوو كە تەنانەت ورگی دروستیش بتوانێت مامەڵە لەگەڵ زیاتر لــە ســێی ماســی لــەو جــۆرە بكــات، ئێمــە دوو پیــاوی ڕێــزداری لــە خۆمــان بەتەمەنترمان بەگەڵ خرابوون كە ناویان بە (GPU)ی شین دەرچوو بوو.

ئەو كامپە نوێیەی لـە جەنیسسك، ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـە ئێمـەوە هـەبوو بێت، بەشێوەیەكی بەرچاو چاك كرا بوو. ڕاستە ئەوەنـدە جێگایـە نـەبوو، بەڵام قـەت لـە دوو كـەس زیـاتر لەسـەر یـەك جێگـا نـەدەبوون. هـەروەها، بەشێوەیەكی بەرچــاویش سەربەســت بــووین و نەكەوتبووینــە ژێــر تونــد و تیژییــەوە. بەپێــچەوانەوەش پەیوەنــدییەكی تــەواو بــاش لــە نێــوان زیندانییــەكان و بەرپرسەكانیاندا هەبوو، دەبوایـە هـەموو بـەیانی و ئێوارەیـەك لـەناو بانگكردنـدا ئامـادە بـین، ئەمـەش شـێوازی ڕاپـۆرت دانـی بەپاسـەوانی (GPU) بەخۆیـەوە دەگرت، كە ئەویش ناوەكەتی لەسـەر بۆردەكە دەنووسی. كە نـاو بانگكردنەكە كۆتایی دەهات، بۆردەكە بەچەقۆیەك پاك دەكرایەوە، هیچ كاغەز بۆ ئەم جۆرە شتە نـەبوو. ئەگـەر لـە ناوبانگكردنـدا، ڕاپـۆرت پێدانەكـە لـە بیر بكـەیت، ئـەوا ڕەنگبـێ لـە ئەنجامیـدا بۆكسێك لـە بناگوێتـدا بخۆیت، بـەڵام لێدانی زۆر گـەورە نـەبوون. زۆر جاری وا دەبـوو ئـەو سـەربازە (GPU)ەی كـە ئـەركی پـێ سـپێررا بوو هەر تـەنیا داوای لـە یـەكێك لە وانـی تر دەكرد كە ئایا دەتوانێت گـەرەنتی

ئەوە بدات کە ئەو کەسەی لە ناوبانگکردنەکەدا بزرە لە کامپەکە دایە، ئەگەر وەڵامەکە " بەڵێ " بووایە ئەو کاتە کابرای (GPU) بە گلەییەوە دەی گوت :

- پێی بڵێن ئەوا ناونووس کرا، بەڵام سبەینێ دەبێ بێت ئەگینا شێتانە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەم. پێویستە لێرە کەمێك لە شتەکاندا ڕێك وپێك بین.

لەم کامپەدا من لاوازترین تاقیکردنەوەم بە دی کرد کە لە ژیانمدا دیبێتم. ئەویش ئەو شێوازە بوو کە بەهۆیەوە " پسپۆڕەکان " یان هەڵدەبژارد.

- پێم بڵێ دەتوانیت چ کارێك بکەیت.

چونکە دەمان زانی وەرگرتن لە کاری پسپۆڕیدا شتێکی زەحمەت بوو، بۆیە من وفلیشمان پێکەوە بەساردییەوە پێمان ڕاگەیاندن کە " پسپۆڕی مۆتۆڕین ".

بەم جۆرە ناومان کەوتە ناو گرووپی پسپۆڕانەوە. کە سەرنجی کابرای (GPU)مان بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشا کە لەجیاتی "پسپۆڕی مۆتۆڕ"نووسیویەتی"پسپۆڕ"، بەخۆشییەوە گرژییەوە، چاوی هەڵتەکاند و گوتی :

- چی دەکەن ئەگەر چێشت لێنانێك پێویست بوو ئێوەش وەکو " پسپۆڕی مۆتۆڕ " لەوێ بوون ؟

پیاوێکی واقیع بین بوو.

.

بە دروستکردنی سپانەی دارین دەستمان پێکرد. کەس نەی دەزانی ئەمانە بۆ چ مەبەستێك بەکار دەهێنران. ئەو کارگەیەی دروستی دەکردن بیست و پێنج پیاوی لە کارەکەدا بەکار دەهێنا. پاش دە ڕۆژ ئێمەیان بردە بەشێکی دی کە قیبلەنما و پورگال و ئەو جۆرە شتانەی دروست دەکرد.

من لە وەحشەتناکترین لێکدانەوەمدا قەت بیرم بۆ ئەوە نەچووە کە لەوانەیە کارتێکدان بگاتە ئەو ڕادەیەی کە لەم کارگەیەدا ڕووی دەدا. لە سەدا پەنجای هەموو ئەو شتانەی بەرهەم دەهێنران سیکراپ دەکران. بۆ نموونە خەریك دەبوون ماشین خانەیەك دروست بکەن، ئەو ئیشە بەلایەنی کەمەوە شەش سەد پسپۆڕی تیادا بەکار دەهات. هەموو جۆرە حەزەرێك وەردەگیرا بۆ ئەوەی ئاواییەکە جوان دەرچێت. بیناساز و پێشڕەوانی (GPU) ڕۆژی چەندین جار ئەو کارەی کرا بوو دەیان پێواو خۆشیان لەناو وێنەکردن و هێلکاریدا نقووم ببوون. هەموو شارەکە بەخۆشییەکی مەزنەوە چاویان بڕیبووە کارەکە، کە دوای ماوەیەکی درێژیش ماشین خانەکە تەواو بوو، ئەوەندەی بورجی پیزا لار بوو، هەموو کەسێکیش، جگە لەوانە نەبێت کە بەرپرسی رافیعە بوون، بەدەنگی بەرز و بەبێ تامییەوە پێکەنین، بەپیاوانی (GPU) شەوە.

سەبارەت بە مەکینەی ناو کارگەکانیش هەمان شت بوو. ئەوان بە بەردەوامیی دەشکان، ئەوجا کرێکاران بەدڵخۆشییەوە هاواریان دەکرد : " مەکینە لە کار کەوت ! مەکینە لە کار کەوت ".

گرنگ نەبوو شکستەکە چەند بێت، بە تەئکید هەموو ڕۆژەکەی دەخایاند تا چاك دەکرایەوە، کە چی یەك چەنگە زیخ لەناو داینەمۆیەك هەمیشە پشوودانی درێژتری بە ئێمە دەبەخشی. ئەگەر پارچەیەك پێویست بووایە بۆ مەکینەیەك ئەوا دەبوو لە مەکینەیەکی تری بدزیت و ئنجا بۆ ئەمەشیان لە مەکینەیەکی سێیەمەوە دابین دەکرا، بەم جۆرە تا وای لێدەهات بۆ دوایین مەکینە پارچەکە لە مەکینەیەکی لە کار کەوتوو دابیندەکرا کە چاوەڕێی هاتنی پارچەیەك یان شتێکی تری لە (مۆسکۆ)وە دەکرد بۆ ئەوەی دووبارە

بکەوێتەوەگەڕ. مەکینەیەکی گەورەمان هەبوو، ڕۆژێکیان لە کار کەوت، بەشێکی گەورەی لەکار خست، پاش گفتوگۆیەکی درێژخایەن ئێمەی پسپۆڕان بڕیارماندا کە پلاکەکانی عەیبێکیان تێدایە. لەبەرئەوەی ئەو جۆرە پلاکانەمان لە کۆگادا نەبوو، ناردمان لە مۆسکۆ تاقمێکمان بۆ بێت، لە دواییدا پاش سێ حەفتە، کە گەیشت، سندووقێکی تەواویان لێهات، تەنیا سندووق، کە کردمانەوە پڕی بوو لە بورغی. داواکارییەکی ترمان نارد بۆ مۆسکۆ، سێ حەفتەی تریش بەسەرچوون، ئنجا سندووقە پلاکێکی ترمان بۆ هات، ئەم جارەیان سندووقەکە پلاکی تێدا بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا خودی مەکینەکە لەناو چوو بوو. ئەو مەکینە زلە هیچی لێ نەمابووەوە، تەنیا چەرخەکانی هاوسەنگیی نەبن. سەرکار بۆ ماوەیێك لە پاشماوەی مەکینەکە ڕاما، پاشان سەری بادا و بۆ دیتنی کاپتن تۆرکۆجسکی چوو کە گەورەی (GPU) بوو، ئنجا ڤۆدکای خواردەوە.

•

شتێکی چەرتە ئەگەر لەمەوە بیر لەوە بکەینەوە کە لە هەموو شوێنێکی یەکیەتی سۆڤیەتدا شتەکان ئەوەندە تێکدراو و شێواون وەك ئەوەی لە جینیسسك دا باوە. ئەو سوپایەی ڕووبەڕوومان کرابوو، بەتەواویی کارا بوو. ئەگەر کەل و پەلی لە ئەڵمانەکان باشتر نەبوو بێت - کە ئەمە کەم وا دەبوو - بەلایەنی کەمەوە وەکو هی ئەوان باش و کەم ئاڵۆزتریش بوو، هەروەها ڕەگەزە مرۆییەکەشی باشتر بوو، سادەتر بەڵام زیاتر پشتیان پێدەبەسترا، کە ئەمەش ئیمکان نەبوو لە خاك و وڵاتێکدا ببێت کە بەتەواویی گەندەڵ کرابوو. گەلێك کەس وا بیر دەکەنەوە کە هەموو شتێك لە یەکیەتی سۆڤیەتدا بۆگەنە، وەکو ئەوەی لە جینیسسك، بەڵام پیاو دەبێ لە وێنە کێشانی بۆچوونەکاندا ئاگادار بێت. کە شتەکان وەکو ئەوە وابن کە لە جینیسسك دا وان، ئەمە نابێتە جێی

سەرسوڕمان، کاتێک ئەوەت لەلا ئاشکرا بێت کە سیی هەزاری وەك ئێمە بە زۆرەملێ خرابوونە کارەوە، لەوانەش شەش هەزاریان بیانی بوون، سیی هەزار کەس هەبوون کە تەنیا بیریان لە تێکدانی ئەو کارە دەکردەوە کە ئەنجامیان دەدا، یان بەلایەنی کەمەوە بەتەواویی بێباك لەوەی کە ئایا شتەکان وەبەرهەم دێن، یان نا، یا کارێکی شیاو و ڕێك دەکرێت. ئێمە لەوێ بووین و تا ڕادەیەکیش بارودۆخمان باش بوو بۆیێ تاکە ئاواتمان مانەوە بوو لەوێ. بە واتاییێکی دی وامان مەبەست بوو کە هەتا دەکرێ شتەکان هەر وەك خۆیان بمێننەوە.

کەناڵە گەورەکان و وێستگەکانی وزە کە دروستکراون، تەواوبوونی کارەکانی ئاودێری، گەشەکردنی پیشەسازی قورس و فراوانبوونی فێرکردنی گشتی، ئەمانە هەموویان شتێ ئەوە پیشان دەدەن کە ناکرێ لەو وڵاتە فراوانەدا هیچ شتێك نەبێت تەنیا تێکدەران نەبن. تەنها هەر ئەوەیە کە قەبارەکان لەوێدا ئەوەندە گەورەن کە ئەو هەڵە و چەوتییانەی هیچ کۆمەڵێك پێکەوە لێی بێبەش نییە، مادام خەڵك مەکینە نین، بە زەروورەت لەبەرچاوی ئەورووپییە ڕۆژئاواییەکان بەگەورەیی دیار دەبن و دەمودەستیش سەرنج ڕادەکێشن. سەرەڕای ئەو فاکتەرەی کە وڵات لە جەنگ دایە و، هەر تەنیا لەبەر ئەم هۆیەش بوو دەبوایە بارودۆخ نائاسایی بێت.

چاوم بە کۆمۆنیستێکی ئەڵمانی کەوت بەناوی بیرنهارد کروس لە لیشتەرفیلْدی بەرلینەوە. ئەو بەشداری لە شەڕ کردبوو لە سەنگەرەکان لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە. لە ۱۹۲٤دا لە سنوور پەڕیبووەوە بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت و بەگەرمییەوە پێشوازی لێکرابوو، ئەم پیاوە فیتەری مەکینە بوو،

ئیشێکی چاکی لە کارگەیەك لە لینینگـراد بەدەست کەوتبوو، کە لەوێ بووە فۆرمەنی کارەکە و وەستای چەند سەد پیاوێك. بارودۆخی باش بوو، مووچەیەکی باشی پێدەدرا و هەموو ئیمتیازاتی چینی بەرزی هاوولاتی سۆڤییەتیی هەبوو، لەوانەش مافی ئەوەی هەبوو شتومەك لە کۆگا مەزنەکانی حزب بکڕێت کە هەموو شتێکیان لێ دەستدەکەوت. جوانە ژنێکی لە مۆسکۆ هێنا بوو، پاشان لە ١٩٣٦دا، گیراو خرایە لۆبیانکا و بۆ ماوەی دە ساڵ لەوێ مایەوە بێ ئەوەی هیچ لە بارەی هۆکاری مانەوەی لەوێدا بزانرێت، کاتێکیش ئەفسەرێك بۆ مەبەستی پشکنینی گرتووخانەکە هاتە ژوورۆچکەکەی، ئەو لە ئەفسەرەکەی پرسی ئایا دەکرێ هۆکاری گرتنەکەی پێ بڵێت. ئەفسەرەکە بەدوای تۆمارگەکەیدا نارد، چووە سەر ناوی کروس و دەستی بە خوێندنەوە کرد :

– ناوت بێرنهارد کروسە، لە ساڵی ١٩٠٢ لە بەرلین لە دایك بوویت و ژنەکەت ناوی کاتیا ولنە، تۆ پسپۆڕی مەکینەی و لە گەلێك کارگەدا لە ناوچەی لینینگراد ئەندازیار بوویت، تۆ دبلۆمی شەرەفت پێدراوە سەبارەت بەو خزمەتگوزارییەی کە لەپێناو مەشق پێکردنی کرێکارانی ڕووسدا ئەنجامت داوە و ئەندامیشی لە حزب.

ئەفسەرەکە بەردەوام بوو لە خوێندنەوە، لە کۆتاییدا سەری بادا.

گوتی: " ئەمە شتێکی نامۆیە ".

پاشان بە سەرسامییەوە گوتی :

– ئەها، ئەوا دۆزیمانەوە. لە ١٩٢٤دا تۆ سنووری پۆڵەندات بڕیوە و هاتوویتە نێو سۆڤییەتەوە. ئەم جۆرە کارانە قەدەغەن.

– بەڵێ، بەڵام من پاسپۆرتی ڕووسیم پێدرا و هەموو کەسێکیش دەزانێت کە من چۆن و کەی هاتوومەتە نێو سۆڤییەت و ماوەی دوازدە ساڵیشە لێرەم.

ئەفسەرەکە شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی :
- دەبێ تۆ شتێکت لە (GPU) شاردبێتەوە و تازە دۆزیبێتیانەوە.
دوای ساڵێك كروس بە پازدە ساڵ ئیشی قورس حوکمدرا لەبەر هاتنی بۆ ناو یەکیەتی سۆڤییەت بەشێوەیەکی نایاسایی و بە دزییەوە لەوانەشە بۆ مەبەستی سیخوڕیی، لە ژووروچکەکەیدا حوکمەکەی پێڕاگەیەنرا و، بەم جۆرە هەتا سێبەری دادوەرێکیشی نەدیت.

گەلێك چیرۆکی لەم جۆرە بە من دەسپێررا. جا چیرۆك بێژەکان هەموویان ئەوەندە بێ تاوان و بێ ئاگا بوون لە هۆی حوکمەکانیان وەکو خۆیان دەری دەخەن، ئەمەیان پرسیارێکە ناتوانم وەڵامی بدەمەوە. پیرە ڕووسێك گوتی :
- هەر کەسێك ئەگەر بەڕاستی شتێکی کردبێت، یەکسەر گوللەبارانی دەکەن.
من بەڕاستی بوومە برادەری باش لەگەڵ کۆمیساری دابەشکردنی ئیش بەسەر زیندانییاندا. ئەو زۆر جار لە کارگەدا هاتووەتە لام و داوای کردووە شتێکی تایبەتی بۆ دروست بکرێت، ڕۆژێکیان داوام لێکرد ئەگەر بتوانێت کارێکی باشترم پێبدات، بەڵێنی پێدام کە بۆم بکات. هەر ڕۆژی پاشتر بەپێشنیازێکی شێتانەوە هات :
- تۆ ئینگلیزی و ئەڵمانی دەزانیت. چی دەڵێیت ببیتە مامۆستای زمان ؟ تۆ بێگومان دەتوانیت شتێك فێری منداڵان بکەیت. ئەگەر پشکنینێکیش هەبوو، تۆ تەنها کۆمیسارەکە بانگهێشت بکە بۆ خواردنەوە، ئەو کاتە پشکنینی لە بیر دەچێت. ئێمە هەمووومان هەروا دەکەین.
پێکەنیم و گوتم : " ئەوە هەر نابێت، من تا ڕادەیەکی باش دەتوانم بە ڕووسی بئاخڤم، بەڵام بڕای بڕ ناتوانم بینووسم. دەبێ بیر لە شتێکی باشتر بکەیتەوە".

بە سەرسامییەوە سەری بادا " پێویستە منداڵان فێری نووسینی ڕووسیت بکەن لە بەرامبەر ئەوەی کە تۆ فێری ئینگلیزی و ئەڵمانییان دەکەی. من دڵنیام کە ئەمەیان دەبێ ".
هەر چۆنێك بێت، نەبوومە مامۆستای قوتابخانە، بەڵکو بوومە ئاشەوانێکی پسپۆڕ "ئەگەر هەر کەسێك پرسیاری لێ بکردمایە، دەمگوت من کاتی خۆی کۆمیساری هەموو ئاشەکانی سکەندیناڤیا بووم".

لاوێکی ڕووسیی بە ئاشی ئاردی ژمارە (٧٣)ی داگیرام و پیشانی دام وچووینە لای چەند هێڵەگێك بە سپیترین ئارد کە من دیبێتم. ئاردێکی وا کە قەت بەشێوەی یاسایی نەدەفرۆشرا. ئنجا تەلیسێکی چوارده پاوەندیی پڕکردو، زارکەکەی بەست و بەپێ پانی کردەوە داواشی لێکردم بیخەمە ژێر چاکەتەکەم و بەشتێکی کەم پیشانی بدەم بۆ ئەوەی زۆر بەرچاو نەبێ.
- ئنجا دەتوانی هەموو بەیانییەك ئەمە بکەیت، هەموومان وا دەکەین.

بە یارمەتی ئەو هەموو ئاردە نایابەی کە ئامادەم دەکرد، بوومە هەڤاڵی چاکی گەلێك لە پیاوانی (GPU) ئەوانەی کە ئاردەکەم پێ دەفرۆشتن. هەروەها هەوڵیشم دا فلیشمان بگوازمەوە سەر ئیشێکی شیاو لە دەرەوەی خێوەتگەکەدا. ئەوەندەشی پێ نەچوو، توانیم ماوە بۆ هەردووکمان بڕەخسێنم بۆ ئەوەی بەسەربەستی بەناو شاردا بسوڕێینەوە بەو مەرجەی کە لە ناوبانگ کردنی بەیانیاندا ئامادەبین. بۆ ماوەی دوو مانگ کاتێکی خۆشمان بەسەر بردو وەك هەر هاوڵاتییەکی ئازادی سۆڤیەتیی دەژیاین. حەفتەی جارێك دەچووینە سینەماو فلیمی ڕووسیمان دەدیت، کە هەندێکیان زۆر نایاب بوون، بەڵام فلیمە ((دەنگوباسییە)) حەفتانەکانیان لەبەرەی جەنگەوە شتی باش

نـەبوون. سـەبارەت بـە مـن، ئەمانـە فلیمـی وشـك و درۆ، هەنـدێ جـاریش خـەیالاویی بوون. یـەکێکیان لـە بابـەت سـەربازێکی سۆڤیەت بوو کە لە کریمیا دەجـەنگی. ئـەو بـەخراپیی بریـنـدار ببـوو، هـەردوو قاچـی لـە سـەرووی ئەژنۆکانییەوە بڕا بوون، ساچمە گوللە تۆپێکیش چاوەکانی دەرپەڕاندبوو، ئەوەندەی نەخایاند پاش پێچانی برینەکانی لەناو جێگا دەرپەڕی، باوەشێك مینی زەوی هەڵگرت و بە قاچە براوەکانییەوە ڕای کرد بۆ بەردەوام بوونی لە شـەڕدا. تانکـە ئەڵمانییـەکان بـەناو شـەقامدا دەڕۆیـشتن. وەکـو پڵـنگ، ئـەم ڕووسییە بێ لاقە، بێ چاوە، خشییە سەر تانکێك و تەقاندییەوە. بەردەوام لەم کـارەدا تـا یـەك دەرزەن تـانکی وردو خـاش کـرد. پاشـان کـە هـەموو تانکـە ئەڵمانییـەکان بەتونـدیی گڕیـان گـرت، ئـەم ڕووسـییە ئازایـە بردرایـەوە بـۆ نەخۆشخانەی مەیدان و لەوێ دکتۆرەکان عەمەلیاتیان بۆ کردو تەواویان کرد. هـەر کە فلیمەکە کۆتـایی هـات. ئەفسەرێك لەسـەر مینبـەرێك وەسـتاو ڕووی لە بینەران کردو گوتی :

– هاوڕێیان ! ئا بەم جۆرە سوپای سوور لە دژی پیاوە ئەڵقە لە گوێیەکانی بورجوازییەت و سەرمایەداریی دەجەنگێ ! .

هەموو شتێکی باش، درەنگ یا زوو بەکۆتا دێت، کاتێکیش لە پیاوێکی (GPU) ئـەوەم بیست کـە قسە لەسـەر ئێمـە هەیـە بـەم زووانـە بمانگوازنـەوە، ڕەنگبێ دووبارە بۆ دۆزەخەکەی تۆبۆلسك بێ، من و فلیشمان پلانی ڕاکردنمان دانا. بیرمان لەوە کردەوە کە هەوڵ بدەین بگەینە مۆسکۆ و لەوێ پەناگەیەك لە باڵیۆزخانەی سوید پەیدا بکەین. بەیانییەکیان من بەڵێنی جۆرکە ئاردێکم بە پیاوێکی (GPU) دابوو کە لە فەرمان بوو ئەگەر بێت و گوێ نەداتە ئەوەی کە ئێمە لە ناوبانگ کردنی بەیانی دواییدا ئامادە نەبین، کابرا پێکەنی و شتێکی

لە بارەی کچانەوە گوت، ئێمەش خۆمان وا پیشان دا کە هزرەکەی ڕاستە. لە ئاشیشدا داوای دوو ڕۆژ وچانم کرد بە بیانووی ئەوەی کە کارێك بۆ کۆمیسار جێبەجێ دەکەم. جۆرکە ئاردێکم پڕ کرد و هەرچی پارە و پوولی کە لە مامەڵە کردنی ئاردا لە بازاڕی ڕەش پاشەکەوتم کردبوو تێم ئاخنی. ئنجا بە ئەسپاییەوە بەرەو جێ ژوانی خۆمان لە دەرەوەی شار خشیم.

* * *   * * *   * * *

ماوەی بیست و چوار سەعات بەبێ وەستان ڕۆیشتم، لە دواییشدا کە خۆم خزاندە خەندەکێکەوە ئەوەندە ماندوو بووم هەر یەکسەر خەوم لێکەوت. هیچ دیمەنێکی سرووشتی نییە ئەوەندە بێزارکەر بێت وەکو هی ڕووسیا. ڕێگاکانی لادێ درێژو پێچاو پێچن تەنیا لە خۆڵ و چەو دروست کراون. هەتا چاو بڕ دەکا لە هەموو لایەك هەر دەشتی ڕووتەو هیچی تر. ناو ناوەش ڕەنگبێ باڵندەیەك بەدی بکرێ. گوندەکان پەنجا تا شەست میل لەیەك دوورن. پاش دوو ڕۆژ و نیو ڕۆیشتن، گەیشتمە هێڵێکی ئاسنین، کە بەحوکمی ئەو نەخشەیەی پێم بوو دەبێ لە نێوان (گۆرك) و (ساراتۆڤ) بێت. شەکەت و ماندوو لەسەر لێژایی خاکڕێژی هێڵە ئاسنینەکەدا لێی پاڵ کەوتم. هیچ سێبەرێك نەبوو، بۆیە وەخت بوو بەهۆی خۆری تابدارەوە سوور ببمەوە، وردە وردە تینوویەتی هەراسانی کردم. چاوەکانم ڕەشکەو پێشکەیان تێ کەوت، نەمتوانی بخەوم، هەروا هەستم بەمردن و بەهەناو بەتاڵیی کرد. کات وەستاو بەنەزەر منەوە بایەخی نەما. هەر تەنیا ڕاکشابووم و لە دڵتەنگی خۆمدا دەتلامەوە.

هەرچەندە هەستم دەکرد خەمساردو دڕندەم، بەڵام ئارەزووی ئافرەتێکم دەکرد. ئۆرسۆلا، تۆ ڕۆیشتیت، قەت جارێکی تر ناتبینمەوە. من نازانم ئایا بەهۆی ئەم ئازارەوە گریام، من ڕەنگبێ پێڵەقەم لە زەوی دابێ و قسەی ناشیرینم بە خوداوەند گوتبێ و بەتێکڕا وەك منداڵی بەد ڕەفتارم کردبێ، بەڵام ئەوانە چەند ساتێکی ترسناك، بێ دوایی و تاڵ و شیرین بوون کە من بەڕاکشاویی لە چاوەڕوانی هاتنی شەمەندەفەرێکدا بەسەرم بردن لە شوێنێکدا لە نێوان (گۆرکی) و (ساراتۆڤ)دا.

کاتێکیش یەکێکیان هات، شەمەندەفەرێکی بارهەڵگر بوو، کە تا ڕادەیەك خێرا دەڕۆیشت, بەخۆمم گوت، ئەگەر ملیشت تێدا شکابێت دەبێ بەمەیان سەفەر بکەیت، بۆیێ هەرکە مەکینەی شەمەندەفەرەکە ڕەت بوو، لە کەنار فارگۆنەکانەوە دەستم بە ڕاکردن کرد، لەوەش دەترسام نەبادا لەسەر بەردە لووسەکانی خاکڕێژەکە هەڵخلیسکێم و بکەومە ژێر چەرخەکانییەوە. دەستەندازێکم لە فارگۆنێکی کراوەوە گرت, سێ چوار جار ویستم خۆم شۆڕکەمەوە، بەڵام تیایدا سەرنەکەوتم و خەریك بوو سەرم تیادا بچێت، یا دەبوایە خۆم ڕەها کەم، یان ئەگەر نا دەبوایە لە ڕاکردن بوەستم و تەنیا لاقەکانم ڕابکێشرێن، بەڵام پاشان ددانەکانم گرساندن و جارێکی تر بازم دا. پاش تۆزێك خۆم تێهەڵدایە سەر پشتی فارگۆنەکە و کەوتمە سەر گالیسکەیەك کە لە پەنا ئەو چادرەوە بوو کە فارگۆنەکەی داپۆشیبوو، پاشان وەخت بوو تووشی هێدمەیێك بم، چونکە لە ناکاو تارمایی دەموچاوێك لەسەر ڕۆخی ئەو گالیسکەیە دەرکەوت کە بە هەناسە بڕکێوە لەسەری ڕاکشابووم. گەشکەبوو لە ترساندا، هەردووکمان سەیری یەکتریمان کرد، ئنجا دەمانچەکەم لە گیرفانم دەرهێنا. ئەوەکەی دی ناڵەیەکی لێوە هات و چاوەکانی داخستن.

– تازە هەموو شتێك تەواو بوو!        "Jetzt ist alles aus !"

– بۆ خاتری خوا ئەمە چییە – تۆ ئەڵمانیت ؟ ". بە سەرساميیەوە دەمانچەكەم شۆڕكردەوە و لەو ساتە وەختەدا پیاوێكی تر دەركەوت.

هەردووكیان لە كامپێكی زیندانییانی جەنگ ڕایان كردبوو كە سەد میلێك لە باكووری ئەلاتیرەوە بوو. لە سەرەتادا ژمارەیان چوار كەس بوو، بەڵام یەكێكیان لە شەمەندەفەرەكەوە كەوتە خوار و بوو بەژێرییەوە، یەكێكی تریشیان هەر ڕاستەوخۆ خۆی تێهەڵدابووە باوەشی سێ ڕووسەوە، خۆشبەختانە فارگۆنەكەیان نەپشكنی بوو.

نەخشەكەی لەمەڕ من خرایە بەر لێكۆڵینەوە و بەمەوە زانیمان كاتێ دەگەینە ساراتۆڤ دەبێ ئاگادار بین لەوەی نەبادا شۆڕمان كەنەوە و بەرەو دەریای خەزەرمان ببەن. ئێمە لەسەر ئەوە پێكهاتین كە باشترین ڕێڕەومان دەبێ ئەوە بێت، هەوڵ بدەین ڕووە و ناوچەی ڤۆڵگا بچین لە باكووری ڕۆژئاوای ستالینگراد، كە هەردووكیان گوتیان یەكە سەربازییەكانمان ئێستا لەوێن. ئەوان هەردووكیان بۆ ماوەی چوار مانگێك لەمەوبەر وەك زیندانیی لە مایكۆپ گیرابوون و، ئیتر هەر لەو كاتەوە ئەڵمانەكان زیاتر بەرەو پێش چوو بوون بۆ ناوچەی ڤۆڵگا.

كە گەیشتینە ساراتۆڤ خۆمان خزاندە دەرەوە، بۆ ئەوەی بزانین شەمەندەفەرێكی تر هەیە پێی بچین ئەگەر هاتوو ئەوەكەی ئێمە بە ئاراستەیەكی چەوتدا ڕۆیشت. كۆمەڵێك سندووقی پڕ لە ماسی خاومان دۆزینەوە، یەكێكمان كردەوە و تێروپڕ لێمان خوارد، ماسی خاو بەڕاستی بەتامە و، مرۆڤی برسی تێر دەكات. جووتە پشیلەیەكی خنجیلانە پاشماوەی ئێمە و هەروا ئەو سێ ماسییەیان خوارد كە نەمان توانی بوو بیان خۆین. لە

پاشان گەڕاینەوە بۆ ئەو شوێنەی شەمەندەفەرەکەمانی لێبوو. لەوێ نەمابوو بەڵام شەمەندەفەرێکی ترمان لێهەڵکەوت کە لۆری و تەقەمەنی لێ بارکرابوو، ئێمە دڵنیابووین لەوەی کە بە ڕێگای ئێمە دا دەڕوات - بەرەو بەرەی جەنگ.

ئێستا، بۆ یەکەم جار هەستم بەوە کرد کە بەرەو بەرەکانی جەنگ دەگەڕێمەوە. تا ئەو کاتە هەر لە بیری ئەوە دابووم کە چی دەکەم، بەڵام ئێستا دیمەنی سندووقەکانی تەقەمەنی ئەو ڕاستییەیان بۆ ڕوون کردمەوە. پشت بەست بە هەموو ئەوانەوە، پێشتر من تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە کە لە ڕووسیا دەرچم، یەکیەتی سۆڤییەت بۆ من شوێنێکی پڕ مەترسیی بوو، بەڵام ئەگەر مەبەستم پاراستنی ژیانم بوایە، دەبوایە بگەڕێمەوە بۆ بەرەی جەنگ ؟ بگەڕێمەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو پەلامارەکان و پاشکۆ بوون لە هەموو پاشەکشەیەك ؟ ئەم دژە دیاردەیە شتێکی خەم ئاوەر بوو. بۆچی ژیان وا پڕوپووچ بوو ؟ ئایا سادەترین شت ئەوە نییە یەکسەر گوللەیەك لەسەری خۆم بدەم ؟ شتێکی سەیرو ڕاڤە نەویست بوو، بەڵام لەو ساتەدا گەلێك لەو کاتە خەمبارتر بووم، کە لە وچانەکەم لەگەڵ ئۆرسۆلادا گەڕابوومەوە. لەوانەیە ژن هێنان و وچانەکەم ماوەیەکی ژیانی لەخۆدا گرتبێت کە خۆی لە خۆیدا تەواو و ڕەزابەخش بووبێ. ئەو هەستە ئارام بەخشەی پێدابم کە ئەگەر من لە ژیاندا هیچ شتێکی دیکەم نەبێ، ئەوا ئەوەیانم هەیە. هەر چۆنێك بێت، لێرەدا لە یەکیەتی سۆڤیەت من هیچ شتێکم تاقی نەکردۆتەوە کە بۆ خۆی تاقیکردنەوەیەکی تەواو بوو بێ. زۆر بە ناویادا گەڕام، بەتەنیا و بەفیلاریی، زۆر جاریش یارمەتی دراوم، ئەو زەوی و زارە پان و پۆڕە لە ناوەندی هەموو ئازار چەشتنەکانمدا ئەوەیان بۆ دەرخستم کە ئەم جیهانە چەند گەورەیە، چەند جوان و دەوڵەمەندە، چەند پڕە لە ئەگەرەکانی موغامەرەکردن.

من شتێکم دیت که له دوورەوه پێوانەکەی گەورەتر بوو لەوەی که بچووک بێ، ئەڵمانیای ئێستا ئابڵۆقەدراو له پرۆسەی خنکان دایه. تووشی ژنێك بووم که لەوانەیه یەکسەر لە رایەخە بەن زێرینە رەنگاو رەنگەکانی هەزارو یەك شەوەوە هاتبێ. بەبێ دوو دڵیی هەرچی هەیبوو بەمنی داو، منیش زانیم که هەمیشه دێم و دیسان دێمەوە و بەردەوام زیاترم پێ دەدرێت، زانیم که قەت ئەوەندەی پێ نییه که بەس بێت. بەڵام من قەت جارێکی تر ناچم، ئێمه قەت جارێکی تر یەکتری نادۆزینەوه. وڵاتێکی مەزن له پرۆسەی داخستنی دەرگا گەورەکانییەتی له پشت مندا پاش سەردانێکی کورت. هەستم به ئارەزوویێکی دڕندانه کرد بۆ وەرچەرخان بۆ دواوه، بۆ گەڕانەوه بۆ ژیانێك که لەسەر گڕکان بوو، هەروا بۆ دووباره دۆزینەوەی کچه شازادەکەم و تەواوکردنی موغامەرەکه. نەکردنی گەمژەییێك بوو لەمنەوه. کردنی شتێکی واش دەبێته شێتیی، بەڵام دیسان وەرچەرخانم بەرەو نیشتمان و بەرەو ئەو (هێمنییە) سەیرەی تانکێك لەبەرەی جەنگدا دەیبێ، هەر گەمژەیی بوو. ڕاسته ئەو بارودۆخەی که دەبێ یەکێکی وەکو من له یەکیەتی سۆڤیەتدا له ژێریدا بژی، نامرۆڤانه بوو، بەڵام خۆ لەناو تانکێکیشدا هەروا بوو، سەرەرای ئەوەش پڕوپووچ بوون، بەبێ بوونی جیاوازیی، لوتکه فریودەرەکان که له بناریاندا پێویسته تۆ کۆشش بکەی، بارگەی برسیەتی و تێنوویەتی بگری، ئنجا له پاشاندا سەرکەوی. من دەگەڕامەوه جێگاییێك که دەستەکانم جگه له گوللە تۆپ هیچی تریان نەدەدۆزییەوه و، مرۆڤیش ناتوانێ یاری بەمانه بکات. هیچ شتێك روونادات کاتێ پیاو پەنجەی بخاته سەر نوکی گولله تۆپێك.

سندووقە ماسییەکمان هێناو لەگەڵ خۆماندا بردمانە سەر یەکێك لە فارگۆنەکانەوە، ئنجا کە شەمەندەفەڕەکە کەوتە ڕۆیشتن، لە ژێر لۆرییە بارکراوەکاندا خەومان لێ کەوت. بە درێژایی ڕۆژی پاشتر باران نەوەستا، بەڵام ئێمە لەژێر مشەماکاندا بووین و تەڕ نەبووین. لەوێشدا دانیشتین، ماسییەکانمان خوارد، نووستین، بێزارانە قسەمان کرد. دوو هاوڕێیەکەم زۆر بێزارکەر بوون.

هەردووکیان نازی بوون و باوەڕیان وابوو کە ئێمە سەرکەوتووین، باوەڕیان وابوو کە دەتوانین وڵاتێکی وا گەورە ببەزێنین. یەکێکیان ناوی جورجینس و ئەوی تریشیان بارترام بوو.

لە یۆڤاروۆ ، لە ڕۆژهەڵاتی دۆن، شەمەندەفەڕەکە وەستاو هیچی تر نەڕۆیشت. کەمێك لە دەرەوەی شارەکە، نەخشەکەی خۆمانمان خستە بەر لێکۆڵینەوە و گەیشتینە ئەو بڕیارەی کە ئێمە دەبێ دەوری دوو سەد میلێك لە ڕۆژهەڵاتی (ڤۆرۆنیش)دا بین. ئێمە دەبێ بەلایەنی کەمەوە بگەینە شەست یان حەفتا میلی خوارووی (ڤیرۆنیش) پێش ئەوەی بەهیوای دۆزینەوەی ئەڵمانەکان بین لەو بەرەی ڕووباری دۆن کە ئێمەی لێین، چونکە ئێمە دەمان زانی کە لە باکووری (ڤیرۆنیش)دا ڕووسەکان لە ڕۆژئاوای ڕووبارەکەن و کۆنتڕۆڵی هەموو پرد و تەنکاوەکانیان کردووە.

شارێیەکە پڕ بوو لە سەرباز، تۆپخانە و، لۆری، بەڵام ئێمە نەمان دەوێرا داوای هەڵگرتنمانیان لێبکەین، چونکە هەر تەنیا من زمانی ڕووسیم دەزانی. پۆلیسی سەربازیی ڕووس لە هەموو شوێنێکدا هەبوون و، هەر لەبەر ئەم هۆیەش ئێمە لەکاتی ڕۆژدا خۆمان دەشاردەوە.

لە نزیك ساكماتكا لەلایەن دەرەجەدارێكی ڕووسەوە بانگ كراین. ئەو لۆرییە گەورەیەی كە بەتەنیا سەفەری پێدەكرد، لەناو قوڕدا چەقیبوو. پاش ئەوەی یارمەتیمان دا بۆ دەربازكردنی، گوللەیەكم لێدا و بەدلەكەیم لەبەر خۆم كرد. من ئەو كارەم كرد بەبێ ئەوەی بزانم چی دەكەم، ئەمە تەنیا شتێك بوو كە دەبوایە بكرێت. لەژێر چەند دەوەنێكدا درێژمان كرد و ئنجا لۆرییەكەم لێخوڕی و دووانەكەی تریش لە پشتەوە دانیشتن. لە كابینەی لێخوڕینەكەدا ڕەشاشێكی ئۆتۆماتیكیم دۆزییەوە لەگەڵ چەند نارنجۆكێك. پێم لەسەر سكلیتەرەكە داگرت و سەدو پێنج میلێكمان بڕی بەر لەوەی پیترۆلمان لێ ببڕێ، ئنجا لۆرییەكەمان بەجێ هێشت و بەپێ كەوتینە ڕێ، ڕەشاشەكەم لەگەڵ خۆمدا برد. لە ناوەندی گەردەلوولەكە نزیك دەبووینەوە.

ڕۆژی پاشتر گوێمان لە تۆپەكان دەبوو. شتێكی سەیر بوو كە دووبارە گوێمان لێیان بێتەوە. كە شەو داهات ئاسۆ سوورێكی خوێناوی بوو. لە گوندی (جلانسك)ی بۆردومان كراودا خۆمان لە كەلاوەیەكدا شاردەوە، بەڵام لەوێدا چاك نەخەوتین، تەنیا سێ میل لە بەرەی جەنگەوە دوور بوو، بۆیە گرمەی تۆپخانە گوێچكەی كەڕ دەكرد. ئەوەندە لەمێژیش بوو كە گوێمان لێی نەبوو بوو بۆیە بە بوونی ئەو گرمانە توانای خەوتنمان نەما، بەم جۆرە ئەعسابمان تووشی گرژیی ببوون كاتێك، پاش تاریكی كەوتن، بەرەو خەندەكەكان بەڕێ كەوتین.

ناو ناوە گوللە تۆپ بەسەر سەرمانەوە ونەیان دەهات، لەسەر زەویدا تەپەیان دەهات و بەگرمەیەكی گەورەوە دەتەقینەوەو خۆڵ و بەردو ئاسن بە دەوروبەرماندا لوولیان دەخوارد. چەند سەعاتێكمان پێ چوو تا گەیشتینە

خەندەکی ڕووسەکانەوە، کە لەوێدا کونێکمان بۆ خۆحەشاردان دۆزییەوە، لێی ڕاکشاین و بە ئاگادارییەوە چاومان بڕی بووە دووان کە ڕەشاشێکی قورسییان لابوو. لە ساتێکی گونجاودا پەلامارمان دان و سەرمان پەڕاندن و، ئنجا لەم سەر بۆ ئەو سەری سەنگەری خەندەکەکانیانەوە بەتوندیی پەلامارمان داو بەخێرایی بەرەو لایەکەی تر ڕامان کرد. لە ناوەڕاستی زەوی بێلایەندا خۆمان لە حەشارگەیەکدا خزاند. دەرکەوتنی لە ناکاومان هەڵچوونێکی هیستیرییانەی ئاگر بارانی دەست پێکرد لە هەردوو لاوە بەچەکی هەمە عیارو بەهەموو جۆرە گڕو ڕووناکییەك. ماوەیەکی زۆری خایاند تا شتەکان بەئەندازەیەکی باش بۆ ئێمە هێور بوونەوە تا لە حەشارگەکان دەربپەڕین و دوایین کۆششمان بدەین لە بەردەم سەنگەری ئەڵمانەکان، هەر لەو کاتەی ئێمە لەوێ بووین ڕەشاشێکی ئەڵمانی دەستریژێکی لێ کردین و جورجینس بەهاوارێکەوە بەدەمدا کەوت و مرد، ئەمە ئاسوودەییێك بوو، هەر لەبەرئەوە پێویستی نەکرد ئێمە هەڵیبگرین، من و بارترام ڕامان کرد و، هاوارمان کرد لێمان مەدەن ! ئێمە سەربازی ئەڵمانین!.

بەلەرزە لەرزو هەناسە بڕکێوە خۆمان کوتایە ناو خەندەکەکە و یەکسەر براینە لای فەرماندەی دەستەکەوە. پاش چەند پرسیارێك ئێمەی گەڕاندەوە بۆ بنکەی فەرماندەیی فەوجەکە، کە لەوێدا ژەمێك خۆراك و شوێنێکمان پێدرا بۆ نووستن.

جا لە پاشاندا ئەو ئەوەندە گێل بوو کە باوەڕی بە پەرستارێک کرد کە نەیتوانی زمانی خۆی بگرێت. خۆشت هەزری باقییەکەی تر بکەوە. بەیانییەکیان لەکاتی ناو بانگگردندا پیاوە پیرەکە ئەم کورتە هەواڵەی بۆ ئێمە خوێندەوە :

- گیفریتەر هانز برور، کە سەر بەسرییەی ژمارە (٥)ای بەتالیۆنی (٢٧)ای تانکە، لە ڕۆژی (١٢)ای نیساندا حوکمی مردنی بەسەر درا بەهۆی ئەو سوکایەتییەی بەرامبەر بە(ورە) دا کردی بەوەی کە بەئەنقەست پێی خۆی بەهۆی زنجیری تانکەوە وردو خاش کرد. ڕوو ڕەشیی و بێ شەرمیی بەردەوامی بۆ مایەوە. لە (٢٤)ای نیساندا لە بریسلاو حوکمی مردنی بەسەردا جێبەجێ کرا.

ئەمە تا ئەندازەیەک چۆنیەتی دارشتنی وشەکان بوو. پیرەئان پفێکی لە پایپەکەی داو، پۆرتاش پێکەنینێکی خەمگینی پێداهات ! "نەخێر، هیچ سوودێکی نییە خۆت بیکەیت".

من دانیشتم تا بۆ ئۆرسولاو بۆ دایکم بنووسم و پێیان بڵێم کە خەریکم مۆڵەتێکی درێژخایەن لەم حەفتەیەدا وەردەگرم. هەر ئەو ئێوارەیە بانگ کرامە لای فەرماندەی سرییەکە. میر دانیشتبوو، لەسەر کورسییەکدا پاڵی دابووەوە و بەبێ دەنگییەوە بەتوڕەیی سەیرێکی کردم. پاش ماوەیەک دەمی کردەوە :

- چۆن وێرات بەم ڕووقایمییەوە لە پشت سەری فەرماندەی سرییەکەتەوە داواکاریی مۆڵەت پێشکەش بکەی !

منیش وەڵامم دایەوە "من داواکاریی مۆڵەت وەرگرتنم نەکردووە، کە گەڕامەوە کۆڵۆنیلێ خۆی گوتی دەبێ وەری بگری".

- مۆڵەتەکەت سڕایەوە، لەم سرییەدا منم بڕیاری ئەوە دەدەم کێ مۆڵەت وەردەگرێ، دەتوانی بڕۆی.

# مـــيرى خويـــڕى

- هۆ زيندان نشينەكان، بەرەو پێش بۆ خاكى ڕووسيا ! ".
هەر دەستبەجێ چەند هاوارێك هەستا و بەخێرایى لە میانەى ناڵەیەكى مەرگ ئاوەردا ئاوا بوو. تانكى ژمارە ٥٣٤ لە زەوى نەرماندا چەقى بوو، ئەو پێنج كەسەشى پان كردبووەوە كە هاوڕێتمان مير فەرمانى پێدابوون لەسەر ڕوو لەژێر تانكەكەدا ڕابكشێن.

بۆ ساتێك بێدەنگييەكى كوشندە باڵى كێشا، ئنجا هاوارێك لە سرييەكەوە هەڵسا. هەركە پێنج لاشە شێوێنراوەكەش ڕاكێشرانە دەرەوە مير بۆ ساتێك تێيان ڕاما، هەر دەتگوت تەواويى شتەكە هيچ پەيوەندييەكى بە ئەوەوە نييە.

* * *          * * *          * * *

هەريەك لە ئێمە كورتە بێلێكى هێزى پيادەى پێدرا بۆ ئەوەى مينى پێ هەڵكەنين، ئنجا ئامادە بووين بۆ چوون بەرەو زەوى بێلايەن. كات ٢١ بوو. هەر شتێكى كە دەنگى لێوە دەهات و ئێمەى ئاشكرا دەكرد لە - شووشە، دەمامكى گاز، خوودە و تۆرج - هەموويانمان لە پەناگەى خۆماندا بەجێهێشت. تەنيا چەكێك كە پێمان بوو بريتى بوو لە دەمانچە، چەقوو لەگەڵ هەندێ نارنجۆكى بچووك. پۆرتا تفەنگە ڕووسييە قەناسەكەى خۆى پێبوو كە هەميشە لەگەڵ خۆيدا هەڵيدەگرت. هەر پێش ئەوەى لە خەندەكەكەوە بێينە دەرەوە هاوڕێتمان

میر هات بمان بینێت و ئۆبەر لێفتنانت ڤۆن بارنگ لەگەڵیدا بوو. میر وەك عادەتیی لە خۆی بایی بوو. گوتی :

- خوێڕینە، کارەکەی خۆتان بەتەواویی بکەن.

بێ ئەوەی هیچ گوێ بە هاوڕێتمان بدات، ڤۆن بارنگ تەوقەی لەگەڵ هەمووان کرد و بەختێکی باشی بۆ خواستن.

پیرەئان ئیشارەتی دا، بەسەر سەنگەرەکەدا خشین و بەناو بەربەستی تێلدڕەکانی خۆماندا پەلامارمان برد. پاش ئەمە مەودایەکی درێژ و پڕ مەترسی و کراوە هەبوو کە دەبوایە بە بەرزترین خێراییەوە بیبڕین، کە لە نیوەی ڕێگای پەڕینەوە نزیك بووینەوە، گوللەیەکی ڕووناك کردنەوە هەڵدرا و تاریکایی کرد بە ڕووناکییەکی سپی بریقەدار. خۆمان بە زەوی دادا و ڕاکشاین و بەتەواویی هەستمان لە خۆمان بڕی. کە ئەو شاشە ڕووناکییانە بەرەو خوار دەکرێن بچووکترین جوولانەوە یەکسەر دەبینرێت، هەموو جوولانەوەیەکیش لە زەوی بێلایەندا بە دوژمنکارانە دادەنرا. ڕووناکییەکەش ماوەییێکی گەلێك درێژی پێچوو تا لە زەویدا نقووم بوو.

ئێمە دەرپەڕین و دیسان پەلامارمان هێنا، بەڵام تەنیا چەند هەنگاوێکمان نابوو کە دووبارە ڕووناکییەکی تر بەسەرمانەوە بریقەی هات. پیرەئان بێبەزەییانە جوێنی دا.

- ئەگەر ئەمە ماوەییێکی درێژتر بخایەنێت ئەوا کەسمان بەسەلامەتی دەرناچین. بۆخاتری خوا ئەم ئێوارەیە ڕووسەکان چییان لێقەوماوە، ئەم هەموو زبڵە دەنێرن ؟.

جووتە نیشانە ڕووناکییەکی دی بە فیشکە کردنەوە کەوتنە خوار و، ئنجا وەستانێك ڕوویدا کە تیایدا گەیشتینە تێلی ڕووسەکان. لەسەر پشتمان

ڕاکشاین و به تێل بڕەکانمانەوە دەستمان بە بڕینی تێلەکان کرد و ئەو تێلانە بە قرتەکردنێکی بچووکەوە دووکەرت دەبوون و لوولیان دەخوارد. پاشان ترسناکترین بەشی کارەکە هات : لەسەر زگ ڕاکشان، تۆپەڵە تێلدڕێکی تێکچرژاویش بەسەر سەرمانەوە، دەبوایە بە شیشە ئاسنێکی درێژ و باریک زەوی بپشکنین و مینەکان بدۆزینەوە. ئەو مینانە لە تەختە دروست کرابوون، بۆیێ میندۆزەرەوەمان بەکار نەدەهێنا.

ئەمە بەهیچ جۆرێك کاری یەکەکانی تانك نەبوو، ئەوەی کە پێشمان سپێررابوو بیکەین هەمووی لەمەڕ میری خوێڕی و ئەو ئارەزووەی بوو بۆ لەبەرکردنی خاچی ئاسنین. ئەو داوای لە فەرماندەی فەوجەکە کردبوو کە ئەو کارە بە فەوجەکەی ئەو بسپێرێت. کارمان تەنیا ئەوە نەبوو کە نەخشەی کێڵگەکانی مین بکێشین، بەڵکو دەبوایە هەندێك لەو مینانە دەربێنین و دووبارە لەو ڕێچکانەدا دایان بنێینەوە کە ڕووسەکان بە بەتاڵیی بۆ خۆیانیان هێشتبوونەوە بۆ ئەوەی لەکاتی پەلاماردانیدا بەکاریان بهێنن. بەم کارەشمان ئێمە ڕێچکەی تازەمان دروست دەکرد کە تەنیا هەر خۆمان دەمان زانین و لەکاتی پەلاماردانیشماندا بەکارمان دەهێنان.

هەر چەندە من لە هەڵکەندنی ئەو شەیتانانەدا هیچ شارەزاییێکم نەبوو، بەڵام ئەو تاکە سەرە ڕمەی کە هەمان بوو، بە من سپێررا بوو، پێشم گوترا بوو کە بە لاریی لە زەویدا بیچەقێنم. لە میانەی یەك دوو ساتە وەختدا سەرە ڕمەکە بەر شتێکی ڕەق کەوت.

بە هێواشی بانگم کرد " پیرەئان "

بە خشین بۆ لای من هات.

چرپاندی " یەکێکیانت دۆزییەوە ؟ "

– وا بزانم.

سەرە ڕمەکەی وەرگرت و بە ئاگادارییەوە زەوییەکەی پشکنی.

– ئەوە زۆر چاکە. تۆ پاروێکت دەستکەوتووە. ئێستاش ئاگادار بە نەبادا ئەویش پاروێکی دەستکەوێت.

مینەکەی لەسەر نەخشەکەی نیشانکرد و پاش ئەوە بەخێرایی یەك بەدوای یەك مینەکانمان دۆزینەوە. هەرکە تەواویی کێڵگەکە لەسەر نەخشەدا دەستنیشانکرا، ژمارەیەکیانمان لێ هەڵکەندن و دووبارە لە شوێنێکی تردا دامان نانەوە. کارێکی زۆر مێشك ماندووکەر بوو، چونکە کەمترین دەنگ ئێمەی تیا دەبرد. خەریك بوو تەواو بین کە گوللەییێکی ڕووناك کردنەوە ڕاست بەسەر سەرمانەوە تەقییەوە، من ئەو کاتە دەڕۆیشتم و مینێکم لە باوەش گرتبوو، خۆم بە زەوی داداو بۆ نزیکەی شەست چرکەی بێ کۆتایی بە لە باوەش گرتنی ئەو شتە بەرزەتەقەوە ڕاکشام.

لە بەرەبەیاندا هەموومان بەبێ زیان گەڕاینەوە. بۆ چوار شەوی بەدوای یەکدا دەرچوونمان هەبوو. ئێمە زۆر بەختەوەر بووین، چونکە کەسمان تووشی هیچ شتێك نەبوو.

کاتێکیش ڕامان گەیاند کە کار لە کێڵگەی میندا تەواو بوو، هاوپێتمان میر پێکەنینێکی درۆزنانەی هاتێ.

– دەڵێن تەواو، ئێوە لە چەند حەشارگەیەکدا لێرەولەوێ لێی ڕاکشابوون و پرخەتان دەهات، هەی بێ نرخینە، من چەند جارێك نیشانە ڕووناکیم هەڵدا، تەنانەت جارێکیش هیچ نیشانەیەکتان دیار نەبوو، بەڵام ئێوە ناتوانن گاڵتە بە من بکەن، ئێوە هەی ئاژەڵە نەفرەت ئەنگێزەکان. ئێوە دەبێ خۆتان و

نەخشەکانتان لە کاتژمێر (٢٣)دا لێرە ئامادەبن و من لەگەڵتان دێم و دەچین کارە گڵاوەکەتان بەسەر دەکەینەوە. تێگەیشتن ؟.

پیرەئان وەڵامی دایەوە " بەڵێ، هێر هاوپتمان "، ئنجا وەرچەرخانێکی وای کرد کە قوڕی پژاندە سەر فەرماندە.شێتەکەی سرییەکەمان.

کاتێکیش پێکەوە لەگەڵ میری خوێڕیدا ڕێمان گرتە بەر بەناو زەوی بێلایەندا بەرەو کێڵگەی مین، مانگ بەرز بوو. لە کەندێکی درێژدا چووینە خوار کە ڕووسەکان ئێمەیان لێوە نەدەدیت، بەڵام لەوێدا مینەکان وەك ماسی قوتووبەندکراو لەیەك نزیك بوون. میر چووە پێشەوە، لەسەر ئەو نەخشەیەی کە پیرەئان پێی دابوو بەدوای ڕێچکە بەتاڵەکاندا دەگەڕا، هەر یەکسەریش پیرەئان بەدوایەوە بوو، ئەویش نەخشەیەکی دەخوێندەوە، چونکە سەرجەمی ئێمە هەموو کێڵگەکەمان بەتەواوی دەناسی.

میر بەلای ڕاستدا چوو. ئێمەش هەموومان وەستاین و بەهێمنیی ڕاکشاین. دە پازدە یاردەییێك لەناو کێڵگەی میندا ڕۆیشت و هیچ ڕووی نەدا. ئنجا هەستی کرد کە تەنیایە. نەیوێرا وەکو کە خۆی پێی خۆش بوو تێمان بخوڕێت، چونکە ئەمە سەرنجی ڕووسەکانی ڕادەکێشا.

بە نەرمییەوە فیشکاندی " بۆ خاتری خوا ئەمە مانای چییە ؟ ئێوە ئەی تاوانبارانی بۆگەن، شوێنم کەون، وەك فەرمانم پێدابوون ئەگینا دەتان گرم و دادگایی سەربازیتان دەکەم ! ".

پیرەئان بەنیوە هەستانێکەوە و بەپێکەنینەوە گوتی: " هەموو شتێك لە بابەت تۆو دادگایی کردنی سەربازییەتەوە تەواو بووە، بۆیە لە ماوەی پێنج دەقیقەدا دەبیە گۆشتی قیمە کراو، تێدەگەی چیم گوت ؟ "

میر بە پەشۆکاوییەوە سەیری ئەو نەخشەیەی کرد کە بەدەستییەوە گرتبوو.

پۆرتـا گـوتی: " بـەڵێ، چـاو لـە نەخـشەکەت بـبڕە هـەی ____. تـەنیا جیاوازییەکی بچووك هەیە لە نێوان نەخشەکەی تۆ و هینەکەی ئێمە. تۆ، وەکو ئەفسەرێك، بێگومان نەخشەیەکی باشترت لە هی ئێمە هەیە، بۆیە ئێمە پێمان وایە هەندێ لە نیشانە سوورەکانت لەلای ڕاستدا بۆ دابنێین لەجیاتی لای چەپ بۆیە نابێ بڵێی ئێمە شتمان بۆ تۆ نەکردووە " .

لە دوو دەقیقەی دواییدا هەموومان پڕ بەدەم پێی پێکەنین، ئنجا پۆرتا تفەنگـە قەناسـەکەی سـوار کـرد و بـانگی کـرد " ئێـستاش، هـۆ ئەفـسەرە خوێڕییەکە، سەمایەکمان بۆ بکە ئەگینا فیشەکێك دەخێوێنمە ورگت ".

بـە ڕەنگـی هـەڵبزڕکاوەوە، مـیر هـەنگاو بەهـەنگاو دەسـتی بەگەشـتی گەڕانـەوە کـرد، بەڵام تـەنیا یـەك دوو یـاردە بـەرەو ئێمـە هـاتبوو کـە گرمـەیێکی گـەورە لـە تفەنگـەکـەی پۆرتـاوە هـات و ڕمبـەی لـە شـانی میـرەوە هێنـا. بـە ڕاوەسـتاویی بەملاو بـەولادا هـات و لـەتاو ئازاردا ناڵەیـەکی هـاتێ و خـوێن لـە شانە شکاوەکەیەوە بەرەو سنگی هاتە خوار.

پـۆرتـا فیـشکاندی " هەڵپـەڕە، هـەی مـەلعوونی خـوێڕی. بەخۆشـییەوە سـەما بکـە ! خـەریکین لێـرە دەهۆڵـەکان ئامـادە دەکـەین لەگـەڵ تفەنگـە بچکۆڵەکانمان، ئەوانەی کە خۆت فێرت کردین بەکاریان بهێنین ! "

پیرەئان دەمانچە قورسەکەی خۆی دەرهێنا و گوللەیـەکی بەناو لاقەکانی میرەوە نا، ئەویش بازێکی وای دا دەتگوت جۆرە سەماکردنێکە. ستیگ، پلۆتۆ و مـن و ئـەوانی تـریش لـە دەسـتەکەدا لەبـەردەم ئەفـسەرە لـەرزیوە قـاچ تێکئالاوەکەدا گوللەمان بە زەوییەوە نا.

کە کەوتە خوارەوە، یەکەم مینە – زەوی تەقییەوەو بە هەوادا بەرزی کردەوە. پێنج جاران بەرکەوتنی کەوتنەکەی مینێکی تری دەتەقاندەوە، ئنجا دەست کرا بەهەڵدانی گوللە ڕووناکییەکان، چونکە تەقینەوەکان تەواوی ناوچەکەی خستە ئاگادارییەوە. ڕەشاشەکان دەستیان پێکرد و ناوناوەش گرمەی ناڕۆشنی مۆرتەرێك دەهات. لەبەری ئەڵمانەکانەوە نیشانە سووری ڕووناك کردنەوە بەرەو ئاسمان هەڵدران، ڕێنمایی تۆپخانەی دەکرد بۆ ئەوەی بەربەستێکی ئاگر بخاتە بەردەم هێڵەکانی ڕووسەوە. ڕووسەکانیش ئیشارەتی خۆیانیان نارد و داوای بەربەستێکیان کرد لەسەر هێڵی ئەڵمانەکانەوە، هەردوو لا پێیان وا بوو لایەکەی تر خەریکی پەلاماردانە.

گەردەلوولەکە وەکو باوبۆرانێکی توند بەسەرماندا هاتە خوار، زەویش وەکو دیوارێك بەرز بووەوە. بە هەڵەداوان خۆمان خزاندە پەناگەیەك و لەوێ ماوەی دوو کاتژمێر لێی پاڵکەوتین بەر لەوەی ئاوازە دوو لایەنەکە هێمن ببێتەوە، پاش ماوەیەکی کەم خۆمان تێهەڵدایە ناو کەندەکەکانی خۆمانەوەو، پیرەئان گوزارشتەکەی بۆ ئۆبەرلێفتنانت بارنگ گێڕایەوە :

– هێر ئۆبەرلێفتنانت ! ئەنتەرۆفیزەر بیر ڕاپۆرتی خۆی دەدات لەگەڵ دەستەی (۲) لە ئیستیتلاعەوە کە کاریان لە کێڵگەکانی دوژمندا دەکرد. ئیستیتلاعەکە بەپێی پلان بەڕێوەچوو بە فەرماندەی هاوپتمان میر. هاوپتمان کوژرا، چونکە سەرەڕای ئاگادارکردنەوەی لەلایەن دەستەکەوە، ئەو سووربوو لەسەر چوونە ناو کێڵگەی مینی دوژمنەوە.

بـارنگ بەبایەخـەوە سـەیرێکی ئێمـەی کـرد. چـاوەکانی بەسـەر یەکـە یەکەمان تێپەڕین و ماوەیەکیش لەسەر دەموچاوی هەر یەکێکمان دەوەستان. من قەت چاوی وا پڕ لە مرۆڤایەتیی و خەمباریم نەدیبوون وەکو هی ئەو.

– هاوپتمان میر کوژرا ؟ چاکە، ئەمەیە جەنگ و ڕووداوەکان. ئەنتیرۆفیزەر بیر، گرووپەکەی خۆت ببەوە بۆ پەناگە. کەرتی (٢) کارێکی زۆر چاکی لە کێڵگەی میندا ئـەنجام داوە. منـیش ڕاپۆرتێـك لـەم بارەیـەوە بـۆ ئەفـسەری فەرمانـدە دەنێرم. سڵاوێکی کرد. دوو پەنجە لەسەر ڕۆخی کڵاوەکەی و ئنجا گەڕایەوە بۆ پەناگەکەی خۆی.

پیرەئـان گرژییـەوە، ئەوەنـدەی ئـەو لـە ژیـاندا بێـت، هـیچ ڕاوە خوێڕییەکی تر لە سرییەی ژمارە (٥)دا نابێت.

پـۆرتا بەدڵخۆشـییەوە گـوتی: " تێبینـی تەقڵـە خواردنـەکانی ئـەو خوێڕییەتان کرد کاتێ مینە خۆشەویستە بچکۆڵانەکانمان لە پاشەڵی دەچەقین ؟ حەتمـەن دڵـی پـیرە مامۆسـتای جمناسـتیکی ئـەوی شـاد کـردووە کـە بینیوییەتی".

ئەمـە بـوو وتـاری ماتـەمینی بەسـەر هاوپتمـان میـر، ئـەو بورژوازییـە ئەڵمانییەی کە زۆر لەوە بچووکتر بوو بچێتە جەنگ و ببێ بە شتێك.

- چی ؟ ئەوان دووان نەبوون ؟

پلوّتوّ هاوارێکی کرد و بەدوای پۆرتا و کچەکاندا کەوت. هەر زوو لەبەر چـاوان بزر بوون، بەڵام ئێمە گوێمان هەر لە هاواری درێژی ئەو دوو کچە خرینە دەبوو.

پـیرەئان بەپێکەنینەوە گوتی: " بۆ ماوەی دوو سەعاتی تر ناپانبینینەوە "

باقییەکەی ترمان دووبارە لەناو گژوگیا درێژەکاندا لێی پاڵکەوتین، لەوێـدا لێـی پاڵکەوتین و خەونمان بینی و چاودێریی دووکەڵی پایەکانی خۆمانمان کرد، بەهێمنیش باسی ئەو هاورێیانەمان کرد کە هیچی تر لەگەڵماندا نەبوون.

# کورپینه، تێر بخەون

بەیانییان زوو لە هەوای بێگەردەوە کە دەهاتینە ناو کۆڵیتی قەرەباڵغی جووتیارانەوە، بۆگەنیی ئەوێ بەس بوو بۆ ئەوەی پیاو بخات، بەڵام هەتا لەگەڵ ئەو شوێنەشدا ڕادێی و، لە ماوەی چەند دەقیقەییێکی کەمدا هاوڕێ لەگەڵ پرخە وپخەی ڕووسەکاندا دەکەوێتە خەو. ئێمە دەمان زانی کە ژنەکە بەدەم نەخۆشی TB (نەخۆشی سیلەوە) داڕزابوو، بەڵام ئەمە چی تیایە ؟ تۆ بێ سێ ودوو میکرۆبت لەگەڵ شتەکانی تری وەك : ئەسپێ، مشك و پیسایی قبوڵ کردووە.

پاڵکەوتنەکەمان ئەوەندەی نەخایاند کە ڕووسە لەخەو هەستاوەکان بەئاگایان هێنایین. پۆرتا جنێوی پێدان. پیرە ڕووسەکە بە هێمنییەوە بەڵام بە توندییەوە وەڵامی دایەوە :-

- بێدەنگ بە کاکی سەرباز و، بۆ خۆت بخەوە ! .

پاش یەك سەعات مریشکێك خۆی و جووجەڵەکانی بە قرتەقرتەوە هات و کە پێی لە دەموچاوی پۆرتا نا بە یەکجاریی ئارامی لێهەڵگیرا، وەکو فیشەك لەناو کاوکۆتەوە دەرپەڕی و، ملی مریشکەکەی گرت و بەپەنجەی دۆشاوەژە شەقێکی خێوانده دەموچاوی و هاواری کرد :-

- خۆت و بێچووە بیژییەکانت لێرە دەرچن، تۆ ئەی مریشکە بێ حەیایەکە.

ئنجا مریشکەکەی لە پەنجەرەکەوە فڕێدا و دەستی کرد بە وەدەرنانی جووجەڵە زەندەق چووەکان لە دەرگاکەوە. ئەو کارە بووکەکەی وا لێکرد بە

هەڵەداوان بێت و، دەست بە هاوارکردن بکات. پۆرتا بە سەریدا هاڕاندی " پێویستیم بە ئارامییە ! "، جنێویشی پێدا تا بووکەکە میزاجی لەدەستدا و بەچەمچەیەکی گەورە بەتوندیی لە سەری دا، ئێمەش هەمووومان دامانە قاقای پێکەنین، ئەمەش پۆرتای بەتەواویی شێت کرد. بەتاقی کراسەوە بەدوای ژنەکە کەوت، دامێنی کراسەکەی لەهەوادا بەسەر لاقە لاوازەکانی لەرەلەریان بوو. بەناو کێڵگەکەدا کەوت، ڕووسەکان بەدەم پێکەنینەوە هاواریان دەکرد، پاش ماوەیەکی کەم بە هەناسە بڕکێ گەڕایەوە، دەرگاکەی وا بەتوندیی داخست کە تەواویی کۆڵیتەکەی هەژاند، سەری لە پەنجەرەکەوە دەرهێناو هاواری کرد :-

- دەمەوێ بخەوم، ئەو کەسەی ئەو جارەی خەوم لێ بزەڕێنێ دەکوژرێ، گرم – گرم، تەواو، مرد ! نزیک نیوەڕۆ بە ئاگا هاتین و، من خۆراکم لە لۆرییە چێشتخانەکەوە هێنا. یەکەم جار بوو شتی باشمان دەخوارد، شۆربای نۆك. لەگەنەکانمان تەواو پڕ کران ئێمەش وەکو ئاژەڵ قوتمان دەدا. کاتێکیش کە لەگەنەکانی خۆمانمان بەتەواویی لێستەوە ئنجا بامان دایەوە سەر پرێسکەیەك کە ستیگ لە ماڵەوە ناردبووی. چپس و، کێکی بچووك و پارچە گۆشتێکی دووکەڵکراوی گەورەی لەناو بوو. شتەکانمان هەڵگرتنە دەرێ بۆ سەر مێزێك کە بە تەنیشت ئاو دەستەوە دامان نابوو. پۆرتاش شووشەیەك ڤۆدکای هەبوو.

ئاودەستەکەمان وا دروست کردبوو کە بتوانین بەرامبەر بە یەکتری دابنیشین و مێزەکەش لەنێوانمان بێت. دوای خۆ تەنها کردنمان دەستە کاغەزە گریساوییەکەی خۆمانمان دەرهێناو دەستمان بە یاری کرد. کێکمان بۆ خۆمان دەخوارد و، ناو بەناویش پارچە گۆشتێکمان بۆ خۆمان دەبڕی. شووشەکە بەشی کردین. پەرداخ، فنجان و دۆلکە کەل وپەلی جوانکاری بوون و دەمێك بوو بەشتی نا پێویست و ژنانەمان دانا بوون. جا لەوێ هەر پێنجمان بە پانتۆڵی داکەنراو تا ئەژنۆمان، دانیشتبووین دەمان خواردو دەمان خواردەوەو یاری

کاغەزیـشمان دەکـرد جگـەرەمان دەکێـشاو سـوحبەتمان دەکـرد، ئەمـەی بـۆی هـاتبووین دەمـان کـردو لـەزەتمان لـە ژیـان وەردەگـرت. پاشـەڵە ڕووتـەکانمان بـە شـادییەوە بـەدەم خـەڵکانی سـەر شـەقامی گوندەکـەوە دەگرژینـەوە، چـونکە ئاودەستەکە کەوتبووە سەر بەرزاییێك کە لەوێوە بەچاکیی هەموو لایێکمان لیّ دیار بوو، وەکو چۆن خەلکیش بەچاکی ئێمەی لیّ دیار بوو. باڵندەیەك لەناو دارستاندا دەیخوێنـدو لـە تەنیشتیـشمانەوە سـەگێك بەسـستی لەبـەر گـەرمیی خۆرەتـاوی پـایزدا چـوار پـەلی درێـژ کردبـوو. لـە کێلگەیەکیـشدا چـەند ژنێـك گۆرانییەکی ڕووسییان دەچڕاند.

جـاریّ ئێـوارە دانـەهاتبوو کـە ڕووسـەکان لـە کێڵگەکانیانـەوە بـەرەو مـاڵ بوونـەوە، ئێمـەش بەتەمبەڵییـەوە لـەو خۆشـیی و هێمنییـەدا هەسـتاینەوەو گەڕاینەوە بۆ کووخەکەمان.

پاش نیوەڕۆیەکیان، پیرەئـان و فەرمانـدەکانی تـری تانـك بـانگ کرانـە لای فەرمانـدەی سـرییەکە. دوای سـەعاتێکیش کـە پیرەئـان گەڕایـەوە بەخۆشـییەوە پێی ڕاگەیاندین :-

- کوڕینـە هەڵمـەتێکی بـچووکی خۆشمـان لەپێـشە. دەبـیّ بـچین بـۆ ئـەو دەشـتاییەی پـازدە میـل لـەخوارووی (نـۆژی) دایـە و لـەویّ چاڵێك بـۆ کۆنـە سندووقەکە هەڵکەنین تا تەنیا هەر بورجەکەی لەسەر ئەرز بێت. ئێمە لەویّ بە شادییەوە سەربەخۆ دەبین و سیی میلیش لەپشت بەرەی جەنگەوە دەبین، بۆیێ هیچ تەقەیەك نابێت. لەوێدا دەمێنینەوە. گەشە دەکەین و چاوەڕیّ دەبین، تا ئەو کاتەی کە ڕووسەکان لە بەرەی جەنگدا بەسەر سەنگەرەکانماندا دادەدەن، ئـەو کاتـە تانکـە هاتووەکانیـان تێکدەشـکێنین. دەبـیّ بـە هـەر نرخێك بێـت سـەنگەرەکانمان بپـارێزین، هەرکـە کۆنـە سـندووقەکەشمان خـستە نـاو چاڵەوە کلیلی ئیش پێکردنەکە فڕیّ دەدرێت.

پۆرتا پێکەنی و گوتی: " گوتت کلیلی ئیش پێکردن ".
پیرەئان گرژییەوە: " بەڵێ، ئەمە هەموو ئەوەیە کە ناومان برد "
- شتێکی شکۆدارە.
چوار کلیلی سپێرمان هەبوو.

کەمێك پێش بەرەبەیان گەیشتینە سەنگەرە تازەکەمان. هەر ڕاستەوخۆ دەکەوتە ناوەڕاستی ئەو دەشتاییەی کە گیایەکەی ئەوەندە بڵند بوو کە ڕێك دەوەستاین بۆ ئەوەی بە سەرییەوە ببینین. سارد بوو، ئێمەش کڵاوی فەڕوو، پاڵتۆ، پەنجەوانەی ئەستوور و شۆرتی پێستەمان لەسەر پانتۆڵی بەدلە ڕەشەکانمانەوە لەبەر بوو. لەبەرئەوەی تەنیا دوو بێڵ و خاك ئەندازێکمان لەناو تانکەکەدا پێ بوو، تەنیا سێ کەس دەیان توانی لە یەك کاتدا ئیش بکەن، لەبەر سەرماش کێبڕکێیەکی گەورە کەوتبووە نێوانیانەوە.
پیرەئان بەتوندی دەستی درێژ کرد و بەدەنگێکی ئاوازدارەوە گوتی:
- منداڵینە، منداڵینە، منداڵە بچکۆڵانەکان، خۆش نییە لێرە لەم شوێنە کراوەیەدا زەوی هەڵکەنین. تەماشاکەن، ئێستا خۆر هەڵدێ و ئێمەش چی دی ترسی مێردەزمەمان نامێنێت. وا خەریکە دنیا گەرم دەبێت و باڵندەکانیش گەلێك گۆرانیمان بۆ دەڵێن، جا ئەگەر ئێمەش زۆر زۆر باش بین ئەوا پیرەمێردی دەشتێ لەوانەیە بێت و چیرۆکێکی درێژ و ئابڕووبەرمان بۆ بگێڕێتەوە. ئایا ئێوە هەست بە ماچی شنەبای ئەم دەشتە ناکەن لەسەر کوڵمە لووسەکانتان و کە چۆن گەمە لەگەڵ بووکلەکانتان دەکات ؟

کە خۆر بەرزتر بۆوە هەندێك حەماسەتمان لە دەست دا. دەستمان بە ئارەقەکردن کرد و یەك لەدوای یەك کراسەکانمان داکەند، تا لە دواییدا تەنیا بە شۆرت و بووتەکانمانەوە ئیشمان دەکرد. سەرەڕای ئەمەش هەر ئارەقەمان

دەردەداو، دەستەکانیشمان لەبەر ئیشی هەڵکەندنی زەوی ڕەقەنی دەشتایی کە لێی ڕانەهاتبووین، ڕووشان.

پۆرتا بە سەرسامییەوە پرسی " پێم بڵێن ئێمە سەربازین یان کرێکارین ؟ من تەنیا لەبەر قازانجی یەکگرتوو دەمەوێ بزانم.

بەردەوام تانکەکەمان دەپێوا بۆ ئەوەی بزانین چاڵەکە وا زوو دەگاتە قووڵایی تەواو، بەڵام لەکاتی نیوەڕۆدا کە ماوەی حەفت سەعات بوو هەڵمان دەکەند، تازە لەنیوەی ڕێگا بووین. پیرەئان دەستی بە جوێن پێدانی سوپا کرد، پۆرتاش دڵپاکانە پرسیاری لێکرد کە ئایا هەست بە ماچە نەرمەکانی بای دەشت ناکا و، ئایا دڵی بە تیشکە گەرمەکانی ڕۆژ و بە کاریگەرییەتی پەروەردەییانەی ئیشی بێڵ خۆش دەبێت ؟ پیرەئان بە تووڕەییەوە بێڵەکەی بۆ پۆرتا تێهەڵدا و چوو خۆی خزاندە بەر سێبەری تانکەکە.

– بەقەدەر کەوچکە چایەکی تر هەڵناکەنم. لەم جەنگەدا هیچی تر چاڵ لێدان نییە. شەو باش.

پۆرتا و ستیگ و من بۆ ماوەی نیو سەعات هەڵمان کەند، کە دەبوایە پیرەئان و پلۆتۆ ئیسراحەتمان پێ بدەن. پاش کێشەیەکی زۆر بە پرتە و بۆڵەوە بردمانن بۆ ناو کونەکەوە. دوو سەعاتی پاشتر بە باشیی تێپەڕین، ئنجا شەفتی ئەو نیو سەعاتەی کە دەبوایە کاری هەڵکەندنی تیادا بکەین کەم کرایەوە بۆ پازدە دەقیقە، لە دواییشدا هەر پێنجمان لەسەر گازی پشت لێی کەوتین و لە ئاسمان ڕامابن، توانای هیچی ترمان نەبوو.

بەڵام ئەو چاڵە هەر دەبێ لێبدرێت، ئەوەیان خۆ لێدەرباز بوونی نەبوو، بۆیێ پاش پاڵدانەوەییێکی یەك سەعاتیی پیرەئان و پلۆتۆ هەستانە سەر پێ و هەر زوو ئێمەش بە دوایاندا چووین. لە کاتژمێر پێنجی بەیانی ڕۆژی دواییدا چاڵەکە تەواو بوو، تانکەکەمان هێنایە ناوی. لەماوەی چەند ساتێکدا

چادرەکەمان هەڵدا بۆ ئەوەی تیایدا بحەسێینەوە، بەڵام لەبەر بوونمان لە شوێنێکدا کە ڕەنگبێ پارتیزانەکان تیایدا بڵاو بن، شتێکی سروشتی بوو کە پاسەوانیی بگرین. ڕێکنەکەوتین لەسەر ئەوەی کێ یەکەم نۆبەت دەگرێت. لەناوەڕاستی ئەو مشتومڕەماندا پیرەئان لەناکاو گوتی:

- من ئەنتیرۆفیزەرم، نابێ پاسەوانییەتی بگرم، ئێوە خۆتان دەبێ ئەم کارە ئەنجام بدەن، ئنجا خۆی لە بەتانییەکە لوولدا و لێی نووست.

پلۆتۆش هەڵیدایێ :

- منیش ستابس گیفریتەرم، شەوتان شاد منداڵە خۆشەویستەکان.

پۆرتا گوتی: " دەبێتە گاڵتەکردن بە سوپا ئەگەر ئۆبەرفریتەرێك لە پایەی خۆی کەم کاتەوە بەهۆی کارێکی وا چەپەڵی وەك ئەرکی ئێشکگرتن.

ئەم قسانە من و ستیگی وا لێکرد تەماشای یەکتری بکەین.

منیش گوتم : " با ئێمەش نەیکەین، هیچ پارتیزانێك لەم ناوەدا نییە ".

ستیگ بە تەوسەوە گوتی: " گوێی مەدەیێ ".

بەم جۆرە هەر پێنجمان لێی خەوتین.

یەکەم کەس کە ئەو بەیانییە لە چادرەکە دەرچوو ستیگ بوو. ئێمە تیروپشکمان کردبوو کە کێ قاوەی بەیانیمان بۆ بکات، ئەرکەکە کەوتبووە سەر ئەو. پێنج دەقیقە دوای هەستانی لە دەرەوە هاواری کرد :

- زوو وەرنە دەر، فەرماندەی سرییە هات.

لەرزمان لێهات، پێمان خۆش نەبوو لە کاتژمێر یازدەی بەیانیدا لە خەودا بگیرێین، بەڵام ئەمە تەنیا بیرۆکەیەکی گاڵتەجاڕیی ستیگ بوو، بۆیێ دووبارە خشینەوە دواوەو لێی پاڵکەوتینەوە و داوای قاوەمان کرد. لەدواییدا قاوەمان بۆ کرا. بەڵام ئەوەندەی نەبرد دوای تەواوکردنی ژەمە خواردنەکەمان و لابردنی کەل و پەلەکان لەلایەن ستیگەوە کە هاواری کرد :

– خێراکەن، دەبێ هەر ئێستا بێنە دەر ! پیاوە پیرەکە و کاپتنەکە هاتن. هۆ بەرازینە، خێراکەن ئەم جارەیان ڕاستە.

ئێمە تەنیا هەر پێکەنین، پۆرتا وەڵامی دایەوە و گوتی ئەگەر فەرماندەی سرییەکە ئەوی دەوێ پێویستە ستیگ پێی بڵێت کە پۆرتا ئەمڕۆ لە ماڵ نییە، ئەم تێبینییە لەلایەن خودی پۆرتاوە بەجرتێکی زلەوە برا. پیرەئانیش هەمان شێوازی بەکارهێنا.

دەنگێك لە دەرەوە هات " هەمووتان وەرنە دەرەوە، ئەمە کردەوەیێکی جوانە " دەنگەکە هی فەرماندەی سرییە بوو.

بەتەواویی کەوتین. کاتێکیش بە ئاگادارییەوە ڕووبەڕووی هەردوو ئۆتۆمبێلەکە وەستاین کە لەتەنیشت چاڵەکەمانەوە وەستابوون، جل و بەرگمان بە دەگمەن پێی دەگوترا نیزامیی. فەرماندەی سرییە بە تووڕەییەوە تێمان ڕاما. دەربڕینەکانی ئۆبەرلێفتنانت ڤۆن بێرینگیش زۆر بە زەحمەت دەرکیان پێدەکرا. ئێمە هەر لە نوکتەیەك دەچووین لە لاپەڕەیەکی گاڵتەجاڕیدا. پیرەئان شۆرتی خاکی و، گۆریە و کراسێکی دامەن پیسی لەبەر بوو. پۆرتا پانتۆڵی مەشقکردنی لەبەر بوو، کە کۆتاییەکەی لەناو گۆرەوییەکانی ئاخنی بوو، دەستەسڕێکی سووری ئاگرینیی لە دەوری ملیدا پێچابوو. کراسەکەی پلۆتۆش لەناو پانتۆڵەکەیەوە دەرچوو بوو، دەسرۆکەکی سەوزیشی وەك عەمامە لەسەری بەستبوو.

فەرماندەی سرییە بەسەر پیرەئاندا گرماندی " تۆ بەرپرسیاری لەم تانکە ؟ " چاویلکە تاك چاوەکەشی ڕەشبینانە بریقەی دەدا.

– بەڵێ ، هێرئۆبەرست.

– باشە ، بۆ خاتری خوا ئەتۆ بیر لە چی دەکەیەوە نابێ ڕاپۆرتێکت لێوەرگرم؟.

پیرەئان بە ڕاکردنەوە بەرەو ئۆتۆمبێلی فەرماندەوە چوو، پێڵاوە لاستیکەکانی لێك دا و بەشێوازێکی نیزامی لەم دەشتە هێمنەدا هاواری لێ هەستا :

- هێرئۆبەرست ! ئەنتیرۆفیزەر بیر ڕادەگەیێنی کە تانکی ۱ سەر بەکەرتی ۲ هیچ شتێکی تایبەتی نییە کە باسی لێوە بکرێت.

دەموچاوی فەرمانەدەی سرییەکە هەڵبزڕکا.

گوتی: " کەواتە هیچ شتێکی تایبەتیت پێ نییە بیڵێیت، بەڵام من پێمە ..... "

ئنجا سەرزەنشت کراین.

پاشان ڤۆن بارنگ بە تەنیا گەڕایەوە، سەری لێ ڕاوەشاندین و گوتی: " ئێوە بێزراوترین و ترسناکترین دەستەن لە ناو هەموو سوپادا ، خودا ئاگادارە، ئێوە دەتوانی ڕۆژی یەکەم پاسەوانییەتیی بکەن. دەبوایە بزانن کە فەرمانەدەی سرییە دێت و دەتان پشکنی. ئێستاش هەر یەکێکتان سێ ڕۆژ دەبێ بگیرێت، کە لە ماوەی ئیسراحەتدا بەسەرتاندا جێبەجێ دەکرێت. ئەو چاڵەی هەڵیشتان کەندووە جێی ڕەزامەندیی نییە، بۆیێ دەبێ یەکێکی تر هەڵکەنن بە دەوری سیی پێ لەپشت ئەوەیانەوە. دەشتوانم گەرەنتیتان پێ بدەم کە من و فەرماندەی سرییە لە دانی ئێوارەدا سەرێکتان لێدەدەین، بۆیێ دەبێ ئاگادار بن کە یەکسەر دەست پێ بکەن.

دوای ڕۆیشتنی ماوەیێکی درێژ بە بێدەنگیی دانیشتین. چاڵێکی تر لێبدەین ؟ قەت نابێ. بەڵام پاشان چی دەبێت ؟

ستیگ بیرۆکەیەکی بۆ هات. لەناکاو گوتی: " بچکۆڵە خۆشەویستەکانم دەبێ سوپاسی خوا بکەن کە پیاوێکی وا زیرەك لە نێوانتاندا هەیە دەتوانێ کاتێ بیرکردنەوە پێویست دەبێت یارمەتیتان بدات. ئەوەی پێویستە بیکەین ئەوەیە کە ئەم شرە سندووقە بەرەو دواوە لێبخوڕین بۆ ئۆسکۆڵ و لەوێ

ڕۆژێکی خۆش بۆ ڕووسەکان بخوازین و بانگهێشتیان بکەین بۆ گەشتێك، وەکو باجێکیش بۆ ئەم بانگهێشتنەیان داوایان لێبکەین بێڵەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن.

خشینە ناو گوندەکە، کە لە ئارامیی ڕۆژی یەکشەممەدا دەژیا. هیچ زەحمەتییەکمان نەدیت لە دۆزینەوەی ژمارەیێکی زیاتری خۆبەخشەران لەوەی کە پێویستیمان پێیان بوو. بەم جۆرە بە بارێکی زیاتر لە چل نەفەری ژن و پیاو بەرەو شوێنەکەمان گەڕاینەوە. ڕووسەکان ئەو سواربوونەی تانکیان لەلا گەورەترین خۆشیی بوو، لە ماوەی دوو کاتژمێریشدا بە گۆرانی و قسەی خۆش چاڵەکەیان لێدا. ئنجا بێڵەکانیان تێهەڵدا و دەستیان بە گەمەکردن و گۆرانی گوتن و سەماکردن کرد، ئاسمانیان تۆزاویی کرد. ئێمە ئەوەندە لەگەڵ ئەم ئاهەنگ گێڕانەی یەکشەممەدا خەریك بووین کە کەسمان ئاگاداری گەیشتنی ئۆبەر لیفتنانت فۆن بارنگ نەبوو. ئەو وەستاو بەجۆرە سرسامییەکەوە چاوی بڕییە ئەو کۆمەڵە دڵخۆشەوە، لەپاشان سەری لەقاند و گوتی :

– ماندوو نەبن، پێویستە ئەمە بڵێم. ئنجا بە سەر لەقاندنێکی ترەوە، دیسان لێیدا گەڕایەوە. پاشان ئێواریٚ ئێمەش ئەو ڕووسە دڵخۆشانەمان گەڕاندەوە گوندەکەیان. پۆرتا جووتە کچێکی دۆزیبووەوە و وای لیٚ کردبوون هەمیشە دەست لەملانی بن، بۆییٚ هێنانەوەی کارێکی ئاسان نەبوو.

ئایا کارێکی نانیشتمانی بوو بۆ ئەو ڕووسانەی کە یارمەتی ئێمەیان دا دژی هاوولاتییەکانیان ؟ من وای دادەنێم، بەڵام لەوە دڵنیا نیم کە ئەوەی کردیان کاریگەرتر نەبووبێت لە هەوڵ و کۆششی پارتیزانەکان یان یەکە ڕێکخراوەکانی سوپا. ئەم جۆرە کردەوە دۆستانانەیان کاریگەرییان لە هەموو شتێکی تر زیاتر بوو بۆ ئەوەی وا لە سەربازی ئەڵمان بکەن کە لە جەنگ بێزار

بێت. من زۆر کەسان دەناسم کە بە چاکیی و بە ڕاستیی خۆیان لە باوەڕکردن بە داستانە پڕوپووچەکەی گەلی هەڵبژاردە ڕزگارکردووە بەهۆی پەی بردن بەوەی کە دوژمن، دوژمنی ئەوان نەبووە و، تەنانەت لەوەیش کە ئەو دوژمنە لە پلەی نزم دایە. سەربازی ئەڵمانی زانیارییەکانی خۆی لە بارەی مرۆڤ و گەلان فراوانتر کردووە. ئەم جۆرە ڕووبەڕوو بوونانە تۆوی هاریکارییەکی بەسۆزیان لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا لە ناخی ئەودا چاند. لەسەرخۆ بەڵام بەدڵنیاییەوە خۆی لە واهیمەکانی، لە میسالییاتە لە ڕادە بەدەرەکانی، لە فۆهەرە شێتەکانی، لە جەنەڕاڵە بەفیزەکانی جوداکردەوە. چالاکانە فێری ئەوە بوو کە ڕقی لەو (SS)انە ببێتەوە کە جاران لێیان دەترسا، ترسێکی گێلانەی بە چۆک دادەر. دیارە کەس ئارەزووی لەوە نییە کە گوللە بە خەڵکانێکەوە بنێ کە دوێنێ لەگەڵیاندا سەمای دەکرد، جا جەنگ لە ئارادا بێت یان نا، بۆیێ زۆر لەوانەیە تۆ هەر گوللە بە ئاسمانەوە بنێی، مەگەر ئەفسەرێك یەکسەر لەدواتەوە نەوەستابێت و چاودێریت نەکات.

بە زەردەخەنەوە پەڕاوی مۆڵەتەکانی پێداین و گـوتی: " ئەگـەر خێـرا کـەن و خۆتان ئامادە بکەن، دەتوانن لەگـەڵ منـدا بـێن بـۆ شـەمەندەفەرەکە. چـوارده ڕۆژ مۆڵەتتان هەیە و پێنج ڕۆژیش زیادەتان پێدراوە بۆ ڕێگا ".

دەستمان بە گۆرانی گوتن کرد و دڵخۆش بووین، لەخۆشـیاندا شـێت بـووین. بەسەماکردنەوە بەرەو کووخەکەمان چووین و لەپێناو وەدەستهێنانی کۆنە گوێزانێـک کە بەلای کەمەوە شەست جار بەکارمان هێنابوو کەوتینە ململانێ. پۆرتا پـیرە دایکـە ڕووسەکەی هەر یەکسەر لە دەمە لۆچاوییەکەی ماچـکرد و لەگەڵیـدا سـەمای کـرد، بەجۆرێک کـە سـۆڵێن وێ فـڕین. پـیرە کـچەکە وەک مریـشک گارانـدی و کەوتـە خوارەوە، ئا بەم جۆرە پێکەنی.
گوتیشی: " تۆ لە کۆزاکەکان خراپتری !

## بەتالیۆنی ۹۸۸ ی یەدەگ

پاش بیست و چوار سەعات دواکەوتن گەیشتینە گــۆمڵ. شەمەندەفەری تایبەت بەمۆڵەتی ئەو ڕۆژە ڕۆیشتبوو، بۆیێ دەبوایە تا ڕۆژی دواتر چاوەڕێ بین. دەرەجەدارێك پێی ڕاگەیاندین کە دۆزەخ لە بەرەکانی جەنگدا هەڵگیرساوە. وا دیار بوو ڕووسەکان بەدرێژایی هێڵێکدا هێرشیان بردبوو کە لە (کـالینین)ەوە تا حەوزی (دۆن) درێژ دەبۆوە. هەوڵی ئەوەشیان دابوو کە لە چەند شوێنێکدا هێڵــەکانی بــەرگریمان بــشکێنن. پۆرتــا گــوتی: " ئێمــە لــە ڕادەبــەدەر بەختەوەربووین و، لەکاتی خۆیدا لێی دەربازبووین ".

پیرەئان سەری بادا. جۆرە دەربڕینێکی ناڕەحەت لەسەر دەموچاویدا هەبوو. " لە بیر نەکەی کە لە ماوەی دوو حەفتەدا دەگەڕێینەوە بۆ ناوی و، بەدەگمەن ڕەنگبێ تا ئەو کاتە کاروبار هیچ باشییەك بەخۆیەوە ببینێ ".

ستیگ گوتی: " نۆ ، دەمت داخە هەی شڕە بەتانییە، تۆ کابراییێکی بێ ئەقڵی. چواردە ڕۆژی تەواو لەماڵەوە لەگەڵ دایکدا، دەکرێ پێش گەڕانـەوەمان جەنگ بەسەر بچێت ".

زۆربەی کاتی ئەو شەوەمان بە باسی ئەوە بەسەر برد کە گەیشتینەوە ماڵ دەبێ چی بکەین. من بیرم لە لەش ولاری خڕوپڕی ئۆرسـۆلا کـردەوە. دەستلەملانێ و شۆڕبوونەوەی دەستەکانیم وەبیرهاتـەوە بەسەر پشتم. بێدەنگ و ئومێدەواربووم.

نیاز وابوو کە شەمەندەفەڕەکەمان کاتژمێر ۱۸٤۰ بەڕێ بکەوێت، بەڵام ئێمە لە کاتژمێر پێنجەوە لەسەر سەکۆی وێستگەدا بووین. کاتێ کە مۆڵەتەکانمان

پێــشانی پۆلیــسی ســەربازیی دەدا خۆمــان بەپاشــا دەزانــی. لــەناو شەمەندەفەرەکەدا شوێنێکی باشمان بۆ خۆمان دۆزییەوە. پۆرتا و پلۆتۆ بەسەر رەفـەی شـتومەك كـەوتن بـۆ ئـەوەی لەوێـدا بخـەون. ئێمـەش سـێیانەکەی تـر بووتـەکانمان داکەندن و خۆمـان لـێ تـەنها کرد. وردە وردە شـەمەندەفەرەکە پڕ بوو لە سەربازی بە هاتوهاوار کە بۆ مۆڵـەت بەسـەربردن دەچوون. لەسـەر زەوی ژووروۆچکەکان و ڕێڕەوەکەدا لێی پاڵکەوتن. هـەر شووشـەی شـناپس بـوو بـەتاڵ دەکرا. دەنگی مۆسیقا و گۆرانیش لە زیاتر لـە یـەك ژووروۆچكەوە دەردەچوو. پۆرتا نایەکەی دەرهێنا و دەستی بە لێدانی ئاوازی گۆرانییەکی یاساغ کرد، ئەوە وای لێکردین ئێمـەش دەست پێبکـەین و هەرچی گۆرانی یاساغ و پیس هەیە تێـی بچڕین. کـەس ناڕەزایی پیشان نـەدا. ئێمـەی کۆنـە سـەرباز ئـەوەی پێمان خۆش بوو چڕاندمان. ئەگەر هەر کەسێك هەوڵی بدابایە شتێك بڵێت ئەوا بەبێ سێ و دوو لـە پەنجەرەکـەوە فڕێ دەدرایـە دەرەوە، کە شـەمەندەفەرەکەش بەرێ کەوت دڵخۆش بووین. لەکاتێکی شـەودا شـەمەندەفەرەکە لە مۆگیلەڤ لە وێستگەدا وەستا. ئا لـەو کاتـەدا ئارامیی باڵی بەسـەرماندا کێشابوو، بەشـی زۆری نووستبوون و خەونیان بە مۆڵەتەکانیانەوە دەبینـی. بۆ زۆربەشیان ئەمـە یەکەم مۆڵەت بوو لە چەند ساڵێکدا.

هەستمان بە جووڵەیەك کرد و شـەمەندەفەرەکە دەستی بە ڕۆیشتن کرد، بـەڵام تـەنیا بۆ ماوەیـەکی کورت ڕۆیشت و دیسان وەستا. کـەمێك دوای ئەمـە گوێمان لە هاتوهاوار بوو لە یەکێك لە فارگۆنەکانەوە دەهات و، هەر لـەو کاتـەدا دەرگاکـانی ئێمــەش کرانــەوە ســەر پــشت و جووتێــك پۆلیــسیی ســەربازیی خودەبەسەر خۆیان کرد بە ژوورەوە، هاواریان دەکرد :

– هەمووتان بۆ دەرەوە و پێداویستەکانیشتان بهێنن. هەموو مۆڵەتەکان هەڵوەشانەوە. ڕووسەکان هێرشیان هێناوە و ئێوەش دەبێ لە بەتالیۆنێکی یەدەگی کاتییدا ڕێکبخرێن و بنێررێن.

شڵەژانێکی ترسناك پەیدا بوو. هەموومان بەیەکجار دەستمان بە هاتوهاوار کرد و بەپۆلیسەکانمان ڕاگەیاند خۆیان و گاڵتە بەدەکانیان لەبەرچاو نەمێنن.

بەلام، بەدبەختانە، شتەکە گاڵتە نەبوو. خەواڵو و تووڕە، لە بۆشایی بەردەم وێستگەکەدا ڕێکخراین : تۆپچی و تاقمی تانکەکان لە لای چەپ، ئەوانی تریش لەلای ڕاست : پیادە، فڕۆکەوانان، مارینز و ئەوانی تریش هەر چییەك بن، هەموو لەلای ڕاست. مۆڵەتەکانمان لێ سەنرانەوە، پاشان فەرمانێك هات : ستوونی _ لای ڕاست _ بسووڕێ _ خێرا _ بڕۆن !

بەدرێژایی شەو ڕۆیشتین. ڕۆیشتنەکەمان بەهۆی بەفر و ئەو بایە سەهۆڵییەی لە دەموچاومانی دەدا قورس بوو. ئێمە تا ئەو کاتەش قەت باوەڕمان بەوە نەدەکرد کە ئەم فەندو فێڵە پیسە باوەڕ پێنەکراوە ڕاست بێت. نابێ فرت و فێڵی وا لەگەڵ سەربازێکدا بکرێ. نابێ لەو شەمەندەفەرەدا دەری بپەڕێنی کە دەیباتەوە بۆ مۆڵەتێکی چواردە شەوەی بە زەحمەت وەرگیراو، ئنجا ناردنی بۆ ڕێپێوانێك بەدرێژایی ڕێگایەکی ناپەسەند لە لادێدا. گێڕانەوەی بۆ بەرەکانی جەنگ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تانکەکان و گرهاوێژ گوللە تۆپەکان. ئەمەیان ئەو برە ورەو ئارەزووی شەڕکردنە تێك دەدا کە لەوانەیە هەریەك لە ئێمە تا ئێستا هەیبێ.

بۆ ماوەی شەش ڕۆژ ڕێگەمان بەناو بەفرو بەفر بەرەو پێش گرتەبەر. پاشان کەمێك لەباکووری گوندی (لشوین) لەگەڵ هێزەکانی دوژمندا دەستەو یەخەبووین. گولله تۆپەکان شڵپەیەکی ئەوەندە سەیریان لەناو بەفردا لێوە دەهات. لەسەرخۆ بە پەلاماردانی هێزی پیادەی ڕووسەکان ڕاهاتین کە بە زیانی بێ بایەخ تەواو دەبوون. لەسەرخۆ بەلام بە دڵنیاییەوە دەستە تازە پێکهاتووەکەمان وردە وردە بەرەو توانەوەو لەناوچوون دەچوو. ئێمە، کە هیچ مافێکمان لە وڵاتی سۆڤیەتدا نەبوو توانای ئەوەمان نەبوو کە لە بەرامبەر ئەو خەڵکەدا بوەستین کە بڕیاریان دابوو نیشتمانی خۆیان لە ئێمە پاك بکەنەوە. ئەمانە مافی ئەخلاقییان هەبوو، چونکە لە ڕاستیدا بەرگرییان لە خۆیان دەکرد لە دژی پەلاماردان. کە پێشیان دەگوترێ ئەمانە بەرگری لە خۆیان دەکەن لە دژی دەست درێژی کەرێك، ئەمە دروشمێکی پروپاگەندە نەبوو وەکو ئەو دروشمانەی کە هتلەر بەسەرمانی تاقی دەکردنەوە و ئەوانەی کە خەڵکیی، وایان دەزانی دەتوانن لە دوای جەنگدا بەکاریان بهێنن.

یەکە سەربازییەکەمان پێی دەگوترا بەتاڵیۆنی ٩٨٨ی یەدەگی زەمینیی، کەچی سەیر لەوەدا بوو کە هەموو شتێکی تێدا بوو لە فڕۆکەوانان و مارنیزەوە بیگرە تا دەگاتە گاردی نیشتمانیی، بەلام تەنیا یەك نەفەری هێزی زەمینیی. هەموو جۆرە دەرەجەو نیشانەیەکی شانی تێدا بوو، بەلام بەگشتی یەك شت ئێمەی کۆدەکردەوە : هەموومان ڕقمان لە بەتاڵیۆنی یەدەگی ٩٨٨ دەبۆوە و ئارەزووی گەڕانەوەمان دەکرد بۆ یەکە سەربازییەکانی خۆمان.

لە ڕۆژهەلاتی (ڤۆلکۆڤ)دا تووشی شەڕێکی دڕندانە بووین، کە تیایدا ڕووسەکان تانك و فڕۆکەی جەنگەندەیان بەکارهێنا. لە کەلاوە خانووێکدا

لەوێ ، لە ڤۆلکـــۆڤ ، پـشیلەیەکی ڕەنـگ سـوورمان دۆزییـەوە کـە لـە نـاو گالیسکەیەکدا دانیشتبوو زۆر بە کوڵ و کۆوە بەدەم سەرماو برسییەتییەوە دەیمیاواند. بەخورتی هەندێك ئارەقی (شناپس)مان لە قوڕگی کردو هەندێك خۆراکیشمان پێداو کە کاولەکەشمان جێ هێشت لەگەڵ خۆماندا بردمان. لەبەرئەوەی ڕەنگی سوور بوو، ناومان لێنا ستالین.

ستالین هەڵمەتی (ڤۆلکـــۆڤ)ی بە دانیشتن لەناو هەگبەکەی پۆرتادا بەسەربرد. پلۆتۆ و ستیگ بەدلەیەکی تەواو، پانتۆڵ، بلوزو کلاوێکیان بۆ دروست کرد کە لە کۆتاییدا بە شریتێکی باریك بەسترا بۆ ئەوەی نەکەوێتە خوار. چونکە سەر بە بەتالیۆنێکی سزادراو بوو، هەڵبەتە ستالین نەیدەتوانی هەڵۆی نازییەکان بەسەر سنگییەوە ببەستێت. لە سەرەتادا لەبەرکردنی بەدلەی پێ ناخۆش بوو، بەلام وردە وردە هەم لەو ڕاهات و هەم لە شناپس و، وای لێ هات لە مەستییدا وەکو ئێمە بێت، ڕەنگبێ بەمە بڵێن توندو تیژیی بەرامبەر بە ئاژەڵ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ستالین ئێمەی بەجێ نەهێشت هەر زوو کوڵکەکەی بریقەدار بوو، خۆیشی بێ ڕوو و بێ شەرم بوو، وەك هەر پشیلەیەکی تر کە دنیای بەدڵ بێت.

بە نزیك بوونەوەی جەژنەکانی کریسمس بەتالیۆنەکە ئەوەندە وێکهاتەوە تا بوو بە تاکە سرییەیێك و لە پاشان هەڵوەشایەوە. ئێمە پێنچمان فەرمانی چوونمان پێدرا بەرەو گۆدنیۆ لەسەر ڕووباری ورسکلا. کە پاشان فەوجی ۲۷ی تانك چووە ئەوێ. دوای سێ ڕۆژ گواسترایینەوە بۆ بارەگای فەرماندەیی پاشەنگ و ڕۆژی پاشتریش ڕەوانەی هێڵی بەرەی جەنگ کراین کە تانکەکانی لێ بوون، سەرەتاش، هەر چۆنێك بێت پۆستەکانمان پێدرا.

پرێسکه نامەیەکم لە ئۆرسۆلا و لە دایکمەوە بۆ هاتبوو. نامەکانی خۆمانمان هەر هەڵ لووشی، دووبارە و دووبارە خوێندمانەوە، پاشان بۆ یەکتریمان خوێندنەوە، لە کاتێکدا کە خەونمان دەبینی و ئارەزوومان دەکرد و ڕێمان دەدا هەموو وشەیەك بەناخی گیانە تێنووە دڵسۆزەکەماندا ڕوو بچێت.
لەیەکێك لە نامەکانی دا ئۆرسۆلا دەڵێت :-

میونخ – ٩ی دیسەمبەر ، ١٩٤٤

خۆشەویستەکەم ...

من لەگەڵ تۆدا هاودەردم لەو ستەمە دڕندانەیەی کە لە تـۆو لـە هاوڕێکانـت کراوە، بەڵام مەهێڵـە دابڕمێـی لەبەرئـەوەی کـە مۆڵەتـەکانیان لـێ دزیـن. سـەرت بەبەرزیی ڕاگرە سەرمڕای تەڵەکە بـازیی پیـسی ئـەو سـەگە گەورانـە. بـەر لـەوەی بیناسین، ئەم کابووسە بەسەر دەچێ و، هەڵۆی نازیش پەڕو بـاڵی هەڵـدەوەرێ، کـە بەم زووانە بەبێ جیاوازی بەسەر سینگیانەوە دەبێ.

من لە خوا دەپاڕێمەوە کە دەست بەباڵتانەوە بگرێ و لە هـەموو ئـەو تـرس و لەرزەدا بتانپارێزێ کە لەوێ لە بەرەکانی جەنگدا دووچـارتان دەبـێ. هەرچـەندە تـۆ خۆت بەخۆت دەڵێی بێ باوەڕ و دەڵێی باوەڕت بەخوا نییە، من دەزانم ئەو وەکو چـۆن قەشەکانی خۆی خۆش دەوێن، ئاواش تۆی خۆش دەوێ و کاتێکیش کە جەنگ کۆتایی دێت ئەو کاتە دەتوانم قەناعەتت بەمە پێ بهێنم و ئـەو قەپێلکـە ڕەقـەی ستیـسزمە (بەد گومانییە) بتوێنمەوە کە ئێوەی هەزارە بەدبەختەکان لـە یەکـە بـێ بایەخەکانـدا خۆتانتان تێ حەشار داوە. ئازیزەکەم، لەبیرت نەچێ درەنگ یان زوو ئاشتی بەرقـەرار دەبێ و ئەو کاتەش هەموو خەونە خۆشەکانمان دەبنە ڕاستی.

من وای تێدەگەم کە تا ئەو کاتە دەتوانم پیشەیەکی باش لێرە، لە میونیخ یـان لـە کۆڵـۆن وەدەسـت بهێنـم و ئـاواتی مـەزنی منـیش ئەوەیـە کـە تـۆش وەکـو ددانسازێک یان شتێکی لەو جۆرە ڕاهێنـان بکـەیت. تـەنیا شـتێک کـە دەبـێ بـەڵێنم پێبدەی، ئەوەیە ئەگەر هەلێک بڕەخسێت بۆ سازدانی کارێک لەوێ، نابێ لـە سـوپادا بمێنییەوە.

له ماوەی شەش مانگدا ڕاهێنانە تایبەتەکانی خۆم وەکو نەشتەرگەر بـە کۆتـا دێنم، جا ئـەو کاتـە دەسـت بـە پاشـەکەوتکردن دەکـەم بـۆ دانـانی مـاڵی خۆمـان. هیواداریشم تا ئەو ڕۆژەی کە تۆ دەگەڕێیەوە هەموو شتێکم ڕێکخستبێت.

بەڵام _ نا . هیوادارم ئەوەندە درێژە نەخایەنێت، تا ئەو کاتەی بە یـەکجاری دەگەڕێیەوە لام. من پێم خۆشە ئەمڕۆ، هەر ئێستا بگەڕێیەوە.

بابە و دایـە بیرۆکـەی ئـەوەیان لا گەڵاڵـە بـووە کـە زاوایێکیـان هـەبێت. لـە سەرەتادا، بێگومان هەردووکیان حەپەسان و، خۆزگە دەموچاوی بابەت بدیبایە کـاتێ پێم گوت تۆ لـە بەندیخانـە و لـە گرتووخانـەی سـەربازییدا بوویـت و ئێـستاش لـە فەوجێکی بێ بایەخی. لە پێشا وای زانـی مـن شـێت بـوویم، کـە هەنـدێکم بـۆ ڕوون کردەوە و پێم گوت : " تاوانەکەت " سیاسی بـوو، بـەبێ دوو دڵیـی قبـووڵی کـرد و گوتی، مادام ئێوە یەکدیتان خۆشدەوێت، هیچ شتێکی دی گرنگ نییە.

مـن نـاتوانم لـە بـارەی پەرەسـەندنە سیاسـییەکانەوە بنووسـم، کـە دڵنیـام لەمەودوا شتێک لە بارەیانەوە دەزانیت، چـونکە وای بـۆ دەچـم تـا ڕادەیـەکی بـاش ئاگاداریت هەبێت. من خۆم بـەو خەیاڵـەوە ڕەحـەت دەکـەم کـە ئەوەنـدەی تـری پێناچێت هەردووکمان ئـەوەی مـاوە لـە ژیانمـان پێکـەوە دەبـین و یـەک موڵـەتیش ئەوەندە ناهێنێت.

سەرەڕای ئەمە، موڵەتی ئێستا جۆرە چەوسانەوەیەکە، چـونکە بـەردەوام بـیر لەوە دەکەمەوە کە دووبارە دەگەڕێیەوە، تۆش حەتمەن هەر بیر لەوە دەکەیەوە.

لەگەڵ ئەم نامەیەدا کرۆسێکی زێـڕت بـۆ دەنێـرم، کـە هـەر لـە منداڵییـەوە یەکسەر لەسەر پێست لەملم بووەو، دەبێ قبووڵی بکەیت. وەکو من لە ملتی بکـەی، لە هەموو بەدبیەکانی ئەوێ دەتپارێزێ، هەموو ئێوارەیەک ماچی بکە هەروەکو چـۆن من ئەڵقەکەی تۆ ماچ دەکەم. سڤن ، خۆشەویستەکەم، ئازیزەکەم، من ئەوەندە تۆم خۆش دەوێت تا ئەو ڕادەیەی دڵم ژان دەکات و، من لە بیری ئەوەی کە بەم زووانـە بەیەک دەگەین، بەخۆشییەوە دەگریێم، ئەو کاتەش قەت ناهێڵم تۆ بڕۆیت. تـۆ بـۆ منی، هی منی، تەنیا بۆ من. من چـاک لـەوە ئاگـادارم کـە ناوبـەناو هەکەویتـە داوی خۆشەویستی کچێکی ڕووسەوە، یان هی ژنێکی ئەڵمانییەوە کـە لـەناو شـەمەندەفەرە سەرباز هەڵگرەکاندا تووشی دەبیت، بەڵام من چاک ئەوە دەزانم کە بەهەمان شـێوە تووشی خۆشەویستییان نابیت کە لەگەڵ مندا تـووش بوویـت، بـۆیێ پێـشەکی لێـت دەبوورم ئەگەر ژنێکی ترت لەوێ ماچ کردبێت و بۆ ماوەیـەکی کـورت ئیـسراحەتت پێوە دیبێت. من بەنیاز نیم داوات لێبکەم کە وەک ڕەبەن بژیت، بەڵام دەبێ بـەڵێنی ئەوەم پێبدەیت کە دەست بـەهیچ شـتێک نەکـەی ئەگـەر توانـای ئـەوەت نـەبێت لەبارەیەوە ئاگادارم بکەیت.

تۆ هیچ بیرۆکەیەکت لە بارەی گریان و فیغانی منەوە نییە کاتێ ئـەو بـرادەرە سـەیرەت، پیرەئـان، نووسـیبووی و پێـی ڕاگەیانـدبووم کـە تـۆ کـوژراوی. خۆشەویـستترین، بـەڵام هـەروا خـەمبارترین نامـە بـوو کـە مـن لـە ژیانمـدا خوێندوومەتەوە. بەڵام هەرچەندە هێدمە بوو، هیچ نەبوو لە نەزەر ئەو نامەیەی کـە دوای یازدە مانگ بە دەستم گەیشت، ئـەو نامەیـەی تـۆ کـە تیایـدا باسـی ئـەوەت کردبوو چۆن زیندانی. بۆ یەکەم جار بوو لـە ژیانمـدا مـن لـە هـۆش چـووبم، پلـەی گەرمیم بـەرز بـۆوە و ناچـار یـەک حەفتـە لـەناو نوێنـدا کـەوتم. تووشـی دارمـانی تەندروستی بووم، بەڵام خوایە چەند دڵشادبووم !

تۆ دەڵێی باوەڕم بەخوا نییە، بەڵام من وا دەزانم کە ئەو بووە دەستی بەباڵتەوە گرتووە، چونکە تۆ کابرایێکی زۆر تەواوی، وەک برادەرانت کە ئەوانیش وان. تۆ هەڵەو لاوازیی خۆت هەیە، بەڵا تۆ مرۆڤیت و لە دڵدا پاکتری و لە بیروڕاشدا شەریفتری لە کەسانێک کە قەت دەستیان بەبێ تەسبیح نییە. وا مەزانە من بەشداریت ناکەم لە بێزاریت لە دوو ڕوویی و لەو قەشانەی کە تەنیا هەر خزمەتکاری دوو ڕوویی گەورەکانن، ئەوانەی کە نازانن، یان ئەوانەی کە خوای ڕاستەقینە و مەسیحییەتی دروست دەیانناسنەوە. بەڵام ئەو خوایەی کە مژدە بەخشی ڕەحمەتە ناتوانێ یارمەتی ئەو ئافەریدە دوو ڕووانە بدات، هەروەها نابێ بیر لەوە بکەیتەوە کە بەهۆی گوێگرتن لەوەی کە خوا بەهەمووماني دەڵێ ئێوە یارمەتی و پشتیوانی قەشە بەدکارەکان بکەن. ئەوەش ئەوەیە کە من زۆر داواکارم تۆ لێی تێبگەیت و دڵنیاشم لەوەی کە ڕۆژێک دێ تێی بگەیت.

ئازیزەکەم، ئەی مێردە خۆشەویستەکەم، ئێستا دەبێ بوەستم و لە دواییشدا ڕێم پێ بدە داوات لێ بکەم کە لەوێ ئاگاداری خۆت بە. من دەزانم ئەمە کارێکی دژوارە بەڵام مەهێڵە ئەوەندە بکەویتە بەر کاریگەریی ئەو گوێ پێنەدانە بەد گومانییەی کە ئەوەندە تایبەتە بە ئێوەی سەربازانی هێڵەکانی بەرەی جەنگ. باوەڕتان بەوە هەبێ کە هەروەها چاکەش لە جیهاندا ماوە. هەتا دەتوانی ئاگادار بە، ئەمە هەمیشە کەمێک یارمەتیت دەدات لەپێناو ئەوەی بە سەلامەتی بگەڕێیەوە. ئێستاش با ئەم ساڵە تازەیە ببێتە مایەی بەختەوەریی و خۆشیی بۆ هەردووکمان و بۆ ئەوانی تریش.

ژنی دڵسۆزت

ئۆرسولا

*   *   *        *   *   *        *   *   *

ئێمە پشتمان بەوە بەستبوو کە بەر لە ئێوارەی کریسمس ئیسراحەتمان پێ بدرێ، بەڵام ئاواتەکانمان شکستیان خواردو، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو کارێکی ترمان پێدراو وەکو سەربازی پیادە لە هێڵەکانی پێشەوە تووشی چەند شەڕێکی قورس بووین.

لە کاتژمێر حەفتی ئێوارەی کریسمسدا هەڵبژێررام بۆ ئەنجامدانی ئەرکی پاسەوانییەتی لەسەنگەرەکانی پێشەوەدا، کەمێك دوور لە دەرەوەی زەوی بێ لایەن. هەر یەکێکمان لە کونە ڕێوییەکدا بوو کە ماوەی نێوانیان دەوری پەنجا پێیەك دەبوو. بیرۆکەی ئەم سەنگەرە پێشڤە چووانە لەوەوە هاتبوو کە بتوانین لەکاتی پێویستدا ئاگاداریی بنێرین ئەگەر هات و دوژمن دەورییەیەکی شەوانەی نارد. بەڵام، هەرچەندە چاودێرییەکەمان باش بوو، ئەو دەورییانە کات لەدوای کات دەهاتن و دەشگەڕانەوەو، هەر تەنیاش کە دنیا ڕوون دەبووەوە دەمانزانی کە هاتوون ئەویش بەوەدا کە سەربازەکانمان لە بنکەکانی پێشەوەدا بە سەربڕاویی دەدۆزرانەوە. یان حەشارگەیەکمان بە بەتاڵیی دەدۆزییەوە، ڕووسەکان سەرنشینەکەیان بە زیندانیی دەبرد.

تیروپشکمان کرد بۆ ئەوەی بزانن کێ دەچێت. (ڤۆن بیرنگ) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەرکی پاسەوانییەتیی لە ئێوارەی کریسمسدا دەبێ بەم ڕێگایە دەست نیشان بکرێت. ئا لەو شەوەدا نەیدەویست فەرمان بە کەس بدات بچێتە دەرەوە. تیروپشکەکە خرایە ناو خودەکەی ئەوەوە – نەك تەنیا هەر سەربازەکان، بەڵکو تەواوی سرییەکە، تەنانەت خۆیشی، تیروپشکیان ڕاکێشا. یەکێك لە لیفتنانەکانمان لە کاتژمێر ٢٢ تا ١٠٠٠ ئەو ئەرکەی بەرکەوت.

ئا بەو جۆرە من ئێوارەی کریسمسی ١٩٤٢م لە کونە ڕێوییەکدا لە زەوی بێلایەن بەسەر برد. لەبەر دەمیشم لە لێواردا، نارنجۆکەکانی خۆم و ڕەشاشەکەم دانا بوو، ئامادە بۆ بەکارهێنانی.

پیاو کە کاری پاسەوانییەتی وای پێ دەسپێرێ ترسناکانە خەواڵوو دەبێ. نەك هەر تەنیا ئەو گرژییە بەردەوامە بۆ گرتن و لێکدانەوەی هەموو دەنگە بچووکە کزەکان و خستنە هزری دیمەنەکانی نهێنی تاریکیی، ماندووکەرن، بەڵکو تەنیاییش وەك خەولێخەر خۆی دەنوێنێت. پیاو بەتەواویی تەنیایە. سەرەتاو لە پێش هەموو شتێکدا، هەر چۆنێك بێ، پیاو بەهۆی جۆرە ئارەزوومەندییێك بۆ مردن ئیفلیج دەبێ. بیرۆکەی نیازی خەوتن و دوورکەوتنەوە لەم هەموو شتەوە، هەروا خەولێکەوتن و قەت هەڵنەستانەوە، شتێکی سەرنج ڕاکێشە - گەلێك ئاسان و بێ ئازارە. هەموو ئەو شتانەی هەستیان پێ دەکەی کە دەبێ شایانی ئەوە بن بۆیان بژیت تواونەتەوە بۆ جۆرە ناراستییەك، بوونەتە ئاهێکی خەیاڵیی. ناڵەیەکی دووری بێزارکەر، شتێك کە زۆر زەحمەتە بەدەستی بهێنییەوە.

لەناکاو دەنگی ئاسن لەسەر ئاسن منیان تووشی گرژبوونێك کرد. دەنگێکی کز بوو، بەڵام هەر لەو ساتەوە ئەندامەکانی هەست کردنم گرژو ئاگادار بوونەوە. نارنجۆکێکم لەدەست گرت و گوێی خۆم هەڵخست، بەڵام هەموو شتێك هێمن بوو. ئنجا خوێنم مەیی و لەناو دەمارەکانمدا بوو بە سەهۆڵ. شتێك بەتەنیشت حەشارگەکەمدا گلۆر بووەوە. دەستم بە لەرزین کرد. وا هزرم کردەوە کە بەتەواویی هەست بەچەقۆیەك دەکەم بەسەر قوڕگمەوە.

لێوەکانی خۆمم گەستن تا خوێنیان لێهات و، لە تاریکایی ڕامام تا چاوەکانم بەتوندیی ژانیان کرد و ئاویان دەڵاند. پاشان وام زانی گوێم لە دەنگی خلیسکانی ئەسکی بوو بەسەر بەفرەوە. لە خۆمم پرسی پێویست دەکا گوللەیەکی ڕووناککەرەوە بهاوێژم ؟ بەڵام نەم وێرا موجازەفە بە هەڵخەڵەتاندنی خۆمەوە بکەم، داب و نەریت ئەوەندە بەهێزە کە پیاو لە هەندێ بارودۆخی تایبەتیدا دەبێ بەگوێرەی ئەوەوە کار بکات، هەتا ئەگەر ئەم کردەوەیە ببێتە مایەی لەدەست دانی ژیانت. هەڵدانی هەر ڕووناکییەك بێگومان جێگا و شوێنی من بۆ ئەو ڕووسانە ئاشکرا دەکا کە ڕەنگبێ لەو دەرەوەدا خۆیان و چەقۆیە تیژەکانیان ئامادە بن. لە دەرەوە جووتە گورگێك وا دەیان لووراند دڵ و دەروونیان پارە دەکرد، جگە لەمە هیچی تر نەبوو تەنیا بێدەنگیی بەستەڵەکی شەوانی زستان نەبێت. ئنجا هاوارێکی توند هات و خشپەیەکی ترسناکی بەدوادا هات، جا هەر لەو کاتەدا دەنگێکی تر هاواری کرد : " یارمەتی ! یارمەتی ! ڕووسەکان گرتمیان ! " هاوارەکە لەناکاو خنکا، دەتگوت دەستێك دەمی هاوارکەرەکەی داخست. مووی سەرم قیت ڕاوەستان چونکە وام زانی هەندێك تارماییم بینی، بۆیە بەتوڕەییەوە هەندێك نارنجۆکم تێگرتن ودەسترێژێکی کورتیشم لە ڕەشاشەکەمەوە لێکردن. شێتانە گوللەیێکی ڕووناك کردنەوەم هەڵدا و لە ماوەیەکی کەمدا هەموو ناوچەکە بوو بە ئاگر باران.

نۆ کەس لە ئێمە لە دەرەوە بووین. شەشیان نەگەڕانەوە. پێنجیان قوڕگیان بڕا بوو. شەشەمیان هەر دیار نەبوو.

ئەو پۆستەیەی کریسمس کە چاوەڕێمان دەکرد هەر نەگەیشت. لە نیوە شەویشدا لە بەری ڕووسەکانەوە بەهۆی بڵندگۆوە ئەم ڕوونکردنەوەیە هات :

- هەلۆ ! هەلۆ.، فەوجی بیست و حەفتەمینی تانك ! ، كریسمسێكی خۆشتان بۆ دەخوازین. ئەگەر پرێسكە و نامەكانی كریسمسی خۆتانتان گەرەكە بیپەڕنەوە لای ئێمە. نامەكانتان لای ئێمەن لەگەڵ نامەبەرەكەتان. پرێسكە هەیە بۆ ........ ،

پاشان دەنگەكە ناوی هەموو ئەوانەی خوێندەوە كە نامە، یان پرێسكەیان بۆ هاتووە. هەركە ئەوەش تەواو بوو، دەنگەكە لەسەری ڕۆیشت :

- هاوڕێیانی سەر بە بیست و حەفتەمین، ئێستا كەمێك لەو نامانەتان بۆ دەخوێنینەوە بۆ ئەوەی بزانن كە نامەی باشن. ئەمە بۆ نموونە نامەیێكە بۆ كورت هەسنەر Kurt Hessner نامەكە دەڵێت : "ئازیزم كورت، ئەم ئێوارەیە پەلامارێكی ئاسمانی ڕوویدا .. بۆمبێك كەوت .. باوكت .. خەمێكی ترسناكە!" ئەگەر كورت هەسنەر پێی خۆشە پاشماوەی نامەكەی گوێ لێبێت هەر تەنیا ڕێی پێبدەن بپەڕێتەوە لای ئێمە.

چەند بڕگەییێكیان لەچەند نامەیەكی یەك لەدوای یەكدا خوێندەوە، بۆیێ وای بۆچووین كە خەڵكانی وڵاتەكەمان یان كوژراون یان شێوێنراون یان هەندێ كارەساتی تریان بەسەردا هاتووە. زۆرێك سەرسام و شڵەژاو خۆیان نزیك بەشێتیی كرد، كۆتایی هەموو ئەمەش بەوە هات كە پێنجیان پەڕینەوە ئەوبەر.

كە ڕۆژ داهات سێ مردووی ڕووسمان بەڕاكشاوی لەبەردەم ئەو حەشارگەیەدا دیت كە منی تێدا بووم. هەر شەش پێش دوور لەوێ ئاسەواری ئەسكی ski هەبوو.

ڕۆژێکیان پۆرتا بەبێ سەروشوێن بزر بوو، ڕێگە بەپازدە کەس لە کۆنترین و شارەزاترین سەربازی سرییەکە درا بۆ ئەوەی هێرشێك بکەن، لێفتنانت هۆلەر خۆی سووربوو لەسەر ئەوەی کە بەشداریی بکات. بەر لەوەی دەربچین هەموو روتبە و نیشانە و ئەستێرەکانی خۆی دامالین. ماوەیەك لەبەردەم خەندەکی ڕووسەکان ڕاکشاین و گوێمان هەڵخست بۆ ئەوەی بزانین پاسەوانەکانیان لە کوێن، ئنجا بەسەرماندا باراندن و جووتێك مینمان سریواندە ناو پەناگەکەیان و لوولەی تفەنگە ئۆتۆماتیکییەکان و گڕهاوێژەکانمان کردە خەندەکە تەسکەکەیانەوە. هەموو ئەو کارە ئەو پەڕەکەی دوو دەقیقەی خایاند. پاشان بەدوو دیلەوە گەڕاینەوە. هەرکە گەیشتینەوە هێڵەکانی خۆمان دەستمان کرد بە لێپرسینەوەیان، یەکێکیان کۆرنێت (واتە ئەفسەری سوارە) بوو، کاتێکیش وەسفی پۆرتامان بۆ کردن دایانە قاقای پێکەنین :

کۆرنێت بەپێکەنینەوە گوتی: " ئەو بێگومان شێتە، ئا لەم ساتەدا دانیشتووەو لەبن مێزەکەدا ئارەق دەرخواردی کۆمیسارەکەمان دەدات. ئەو نیازی وایە چاکەتێکی پێستە ورچ و کارتۆنێك ڤۆدکا بکڕێت، پێنج هەزار جگەرەشی هەیە بۆ نرخی ئەمانە ".

لە وەڵامی پرسیارە سەرسوڕمێنەکەماندا کە چۆن گەییوەتە ئەوێ کۆرنێت گوتی بەهۆی دەورییەیەکەوە دەستگیر کراوە.

دوای دوو ڕۆژیش کە ئیسراحەتمان پێدرا، هیچ سەروسۆراخێکی پۆرتامان لا نەبوو، بۆیێ دڵسۆزانە پەرۆشی لە دەستچوونی بووین.

حەفتەیەك دواتر سالان سالان بەرەو گوندەكەمان دەهات، فەرووینكی ئەستووری ئەفسەرانەی رووسیی لەبەر بوو، جانتایەكی پێستەی رەشیشی هەڵگرتبوو، كە وا دیار بوو زۆر قورس بوو.

- كەشوهەوای ئەمڕۆ زۆر خۆشە.

ئەمە هەموو گوتنەكەی بوو، ئێمەش لەشێوەی بازنەیەكدا بەدەوری كۆبوورینەوە، واقی وڕ مابوو.

- هیوادارم لە خواردنی نیوەڕۆدا دوانەكەوتبم، ئەمەیان شوورەییە، چونكە هەندێك شناپسم هێناوە.

شەش شووشە ڤۆدكای لە جانتاكە دابوو، هەروەها پێنج هەزار جگەرەشی هێنابۆوە.

پۆرتا گوتی: " قۆمیسارە رووسەكان لە vingt-et-un بێ ئومێد بوونە. ئێمەش توانیومانە هەر ئەوەندەی لە بارەی سەفەرە تایبەتەكەیەوە بۆ ناو رووسەكان لێ دەربهێنین، بۆیە هیچ روونكردنەوەیەكی مەعقوول نییە كە من بیدەم لە بارەی ئەوەی كە روویداوە.

شەش شووشە ڤۆدكاو جانتایەك بۆ تیا هەڵگرتنیان و چاكەتێكی فەرووی ئەفسەرانەی تازە بابەت.

چ شتێكی سەیرە جەنگ.

لەبـەر زۆریـی زیـانەکان فەوجـی (٢٧)ەمینـی تانـک ژمارەیـەکی زۆری پلـە بەرزکردنەوەی بەخۆیەوە دیـت کـە ئێمـەی کۆنـە سـەربازانی گرتـەوە. ئەفـسەری فەرماندە کوژرا بوو، بـۆیێ ئۆبەرسـت لیفتنانـت ڤـۆن لینـدناو بـوو بەئۆبەرسـت. مێجـۆر هینکـا بـووە ئۆبـەرسـت لیـفـتـنـانـت و، فەرمانـدەی بـەتـالیـۆنـەکەی ئێمەش، ڤـۆن باریـنگ بوو بە (هاوپێـمان)ی سرییەی (٥). پـیرەئان کرایـە فیلـدوێبل و فەرماندەی دەستە. ئێمە هەر پێنجمان ئێستاکە تانکێکی تازەمان پێدراوە لـە جـۆری پانتەر، کە تانکی دەستە بوو، تایبەت بە دەستەی (٣).

پۆرتا نیاز وا بوو بکرێت بە ئەنتیرۆفیزەر، بـەڵام بەراشـکاویی بەرزکردنـەوەی پلەی خۆی رەت کردەوە. پەڵپگرتن و هاتوباتێکی زۆر قەوما بـەڵام بەرەزامەندییـەوە بـە کۆتـا هـات. ئۆبەرسـت لیفتنانـت هنکـا گـوتی: " زۆر چـاکە هـەی مەیموونـە سەرسوورەکە. ناتەوێ ببیتە ئەنترۆفیزەر، بـەڵکو سـتابس گیفریتـەرت دەوێ. ئەمـە رازیت دەکات ؟ "

پێی رازی بوو، چونکە ستابس گیفریتەر سەربازێکی پلە بەرزە نەک دەرەجەدار.

سـتالینی، پـشیلەکەی ئێمـە، کـە ئێـستاکە کونیەیـەکی پـچووکی سـەربازیی بۆکراوە، کرا بە ئۆبەرگیفریتەرو بەشێوازێکی نیزامی دوو خـەتی لەسـەر قـۆڵی دوورا بوو ئەویش بەشێوەیەکی خەیاڵیی پابەندی ئاهەنگ گێرانی ئەم بۆنەیە بوو.

# مەرگ تەنگمان پێهەڵدەچنێت

- چەریۆ سڤن، شناپس نۆشکە. قومێکی باشی لێدە. خوێڕییەکە ! هەی زۆر خوێڕی، خوا فرسەتیان بدا کە ئێمە لێرە تەواو دەبین و ئنجا دەگەڕێینەوە !
پۆرتا پرسی چی ڕوویداوە.

پیرەئان گوتی: " ئێستاکە نامەکەت بۆ دەخوێنمەوە، ئا لێرە لەگەڵ شناپسدا، بۆ ئەوەی سڤن بخواتەوە و لە بیر بکات. بەڵام نابێ بە تەنیا بخواتەوە.
پیرەئان نامەکەی باوکی ئۆرسۆلای کردەوە :-

میۆنیخ / ئەپریل ١٩٤٣
کوڕی خۆشەویستم !

هەواڵی ناخۆشم پێیە بۆت، تا دەتوانی بەئارامییەوە وەری بگرە و بەڵێنیشم پێبدە کە خوێندتەوە دانەڕمێی یان هیچ کارێکی توندوتیژ نەکەیت.

ئۆرسۆلای ئازای خۆشەویستمان، مردووە، نازییەکان لە سێدارەیان دا. کە هاتیتە میۆنیخ بەدرێژیی بۆتی باس دەکەم، تا ئەو کاتە ئەم باسە کورتە بەسە.

پێشەوایەکی بەناوبانگی سیاسیی نازییەکان لە زانکۆدا وتاری بۆ قوتابیان دەدا، بەڵام بەنمایشکردنێکی ئاشکراوە قسەکانیان پێبڕی. ژمارەیەك قوتابی لاو دەسگیرکران و لەناویشیاندا کچە خۆشەویستەکەی ئێمە بوو. پاش چەند ڕۆژێك هێنرانە بەردەم دادگای گەل و بەمردن حوکم دران. کاتێکیش حوکمەکە خوێنرایەوە ئۆرسۆلا گوتی: " ئەو ڕۆژە زۆر دوور نییە کە ئێوە،

دادگاییکەر و تاوانبارکەرانی ئێمە، خۆتان دەوەستن و تاوانبار دەکرێن و هاڕێیانی ئێمە دادگاییتان دەکەن، دڵنیا بن لەوەی کە لەو ڕۆژەدا سەری ئێوەش دەکەوێتە بەر تەور".

ئەمانە ئەو قسانە بوون کە ئۆرسوڵا ئاراستەی دادگاییکەرە نازییەکانی کرد و، حەتمەن قسەکانی ڕاست دەردەچن ئەگەر هیچ دادپەروەرییێك لە جیهاندا مابێت.

ڕۆژێك پێش کوشتنی لە گەڵی دابووم، پێی ڕاگەیاندم کە پێت بڵێم ئەو، بەرەو مەرگی خۆی دەچێت و ناوی تۆی بەسەر زمانەوەیە، داواشی لێکردیت کە باوەڕ بەخوا بهێنیت و کە هەردووکیشتان لە ئاسماندا بە یەك دەگەنەوە.

هەتا پاسەوانەکانی بەندیخانەکەش کەوتنە بەر کاریگەریی ئازایەتی ئەو و لە چەند ڕۆژێکی دواییدا گەلێك شتی یاساغیان بۆ هێنا هەر چەندە ئەو سڵی دەکردەوە لە وەرگرتنی هەر شتێك لە کەسانێك کە بەدلە بێزراوەکەیان لەبەر بوو.

برادەرێکی من لە سێدارەدانی ئەو گەنجانەی دیتبوو، پێی ڕاگەیاندم کە ئەوان جووتە گۆرانییەکی یاساغیان تێچڕاند و بەمەش هەموو بەندیخانەکە دەنگی دایەوە و هەموو زیندانییەکانی تر لە هەموو پەنجەرەکانەوە گۆرانییەکانیان دەگوتەوە، نە گەف لێکردن و نە پەلاماردانیشیان نەیتوانی بێدەنگیان بکا، کە دوایین کەسیشیان کوژرا هاوارێکی گرمەئاسا لە وانەی لە پەنجەرەکانی بەندیخانەوە هەستا :

" تۆڵە ، ! تۆڵە ! ، ئنجا سروودی (ڕێد ویدنگ)یان تێهەڵکرد، هەرکە ئەم نامەیەت خوێندەوە، زوو بیسووتێنە. من نامەکە بەهۆی برادەرێکی باش

دەنێرم کە دێتە بەرەی جەنگەوە نزیک ئەو شوێنەی فەوجەکەی ئێوەی لێیە. وێنەیەك و چەند تاڵە موویێکی ئۆرسوڵا دەخەمە ناو زەرفەکە.

زاوا خۆشەویستەکەم، دایکە دڵ شکستەکەی ئۆرسوڵا و منیش، دیارە قەت تۆمان نەدیوە، بەڵام داوات لێدەکەین بەزووترین کات سەردانیمان بکەیت. ئێمە وەك کوڕی خۆمانت دادەنێین و داواشت لێدەکەین تۆشماڵەکەی ئێمە و، هەرچییەکی هەمانە بە هی خۆتیان دابنێیت. گەرمترین سڵاوت بۆ دەنێرین و لەناخەوە هیواداریین کاروبارت باش بێت. ئومێدە بەم زووانە لێرە لەگەڵ خۆماندا بتبینین !
زۆر دڵسۆزت

کە پیرەئان خوێندنەوەکەی تەواو کرد، هەموومان بێدەنگ بەدەم جگەرەکێشانەوە دانیشتین، لەو کاتەشدا تاریکیی لەناو ژووری کووخە بچکۆڵە پیسەکەدا زیاتر دەبوو. من لەرزم لێهات تەواویی ئەو کاتەش سەری ئۆرسوڵام دەبینی لەگەڵ ئاردە تەختەدا بۆ ناو سەبەتەکە گلۆر دەبۆوە، خوێن لە ملییەوە وەك جۆگەلە فیچقەی دەکرد و پرچە ڕەشە جوانەکەی وشك و چەسپندە بوو بەهۆی خوێنەوە، چاوە بریقەدارەکان کراوەو بێ دەربڕین تەماشای ئەو بەهەشتەیان دەکرد کە خۆی باوەڕی پێ هەبوو. من بەتەواویی دەزانم چۆن ئەو لەشە گەرمەی لەناکاو ڕاکێشراو لەدواییدا بێ باکانە خرایە ناو گۆڕەوە.
ئۆه ، من زۆر بەتەواویی دەزانم هەموو ئەمانە چۆن ڕوویان دا، هەموو وردەکارییەکان دەزانم، چونکە زۆر جار ئەمەم دیوە.
بەر لەوەی هەڤاڵانم ڕێم لێ بگرن بزماری ئەمانی دەمانچەکەمم کردەوە و خاچ و وێنەی مەسیح و وێنەی مریەمم کە بەسەر دیوارەوە بوو دایە بەر گوللە

و وردو خاشم کردن. ئنجا شووشەکەم نا بەدەممەوەو بەیەك نەفەس بەتاڵم کرد. پیرەئان ویستی هێورم کاتەوە. بەڵام من دێوانە ببووم. مستێکی کێشا بەچەناگەم و خستمیە خوارەوە.

کە هاتمەوە هۆش خۆم، کۆڕی خواردنەوەمان بەست، ئەوەندەم خواردەوە دەتگوت قەت نەمخواردۆتەوە. ماوەی چەند ڕۆژێك بەهۆی شناپسەوە سڕببووم. ئەو ساتەی کە دەهاتمەوە هۆش خۆم شووشەکەم بەدەممەوە دەنا تا بێ هۆش دەبوومەوە. لە کۆتاییدا زۆر زەحمەت بوو بۆ پیرەئان. خۆی و پۆرتا ڕایان کێشامە دەرەوە بۆ حەوشەکە و منیان خستەناو حەوزێکەوە تا هاتمەوە هۆش خۆم. لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی پاشتردا بۆ چرکەیەکیش بێت نەیان هێشت بێ کار دابنیشم. زۆر ماندوو بووم و کە چوومە ناو جێ ڕەش و شین هەڵگەڕابووم، هەر یەکسەر کە بەیانیش لەخەو هەستام بردمیانە دەرەوە بۆ ناو حەوزەکە و بە ئاوی تەزیو بە ئاگایان هێنام، ئەمە زۆر بەسوود بوو. وردە وردە هاتمەوە هۆش خۆم – هۆشدارو سەرما بردەو مردوو.

بوومە مرۆڤ کوژ، توڕەو نیمچە شێت، سەرەڕای هەموو ڕوونییەکانی بیروهۆشم. خولیای ئەوە بووم کە خۆم و قەناسە دووربین دارەکەم لە خەندەکەکەدا بوەستم و ڕووسەکان لەناو خەندەکەکانیان ڕاو بکەم هەموو جارێکیش کە یەکێکیانم دەدیت گوللە دەیپیکاو لە هەوادا دەفڕی دڵخۆش دەبووم. ڕۆژێکیان هاوڕێتمان ڤۆن بارنگ هات و لە پشتمەوە وەستاو بەبێدەنگییەوە چاوی تێم بڕی بوو. نەمزانی ماوەی چەند بوو لەوێ وەستا بوو. بەپێکەنینەوە پێم ڕاگەیاند کە لە ماوەی نیو سەعاتدا حەفتیانم لێ کوشتووە.

بەبێ دەنگیی قەناسەکەی لێ سەندم و ڕۆیی و، بۆ کاتێکی درێژ بەبێ دەربڕین لە پێش خۆم ڕامام. بێگومان، ئەو ڕاست بوو.

ڕۆژی پاشترم بەشێوەیەکی ئاشکراتر دێتەوە بیر. لەگەڵەکەم پڕ بوو لە گۆشتاو، گۆشتاوی پیرەگاییێك، گرمەیەك هات و شتێکی سووتێنەر بەر لاقم کەوت. بەخۆمم گوت، ئەو ڕۆژەیە کە لاقتی تێدا دەچێ، بەڵام دەرکەوت نیوەی پاشەی کەلەشی پیرە گایەکەیە بەرم کەوتووە. تەواوی لۆرییەکەی چێشتخانە وردو خاش بوو، لە دەوروبەریشیدا پێنج شەش لاشە لە خڵتانی خوێنی خۆیان و لەناو سووپەکەدا مەلەیان دەکرد. یەك یاردە بەو لاوەی منەوە لاقێك بەبووت و هەموو شتێکییەوە کەوتبوو.

پاشـەی کەلەشـێکم خـستەسەر شـانم و بـەرەو خـانووی سـەربازان گەڕامەوەو، ئا لەوێدا دەعوەتێکمان سازکرد. پۆرتا بەشێوازێکی فەیلەسووفانە گوتی: " لە دەستدانی پیاوێك، دیسان لەدەستدانی پیاوێکی تر ".

قەت بەبیری کەسدا نەدەهات کە بەپێچەوانەی کردارەکەی من کار بکات : گواستنەوەی گۆشتەکە و میوانداریی پێکردنی. سینیسیزم (بەد گومانیی) نەبوو کە وای لێکردم نەوەستم لە یارمەتیدانی برینداران، بەڵکو جەنگ بوو. جەنگ هەر وایە. کەسانی تر هەن یارمەتیدانەکە ئەنجام بدەن، جگە لەهاوڕێ نزیکەکانت، لە جەنگدا کەس یەك و دوو ناناسێت.

کـە بـەهار هـات دووبـارە شـەڕو پێکـدادان بـەرپا بـۆوەو، ڕێگـا و بـان و کێڵگەکان ئەوەندە وشك و ڕەق بوونەوە وایان لێهات بۆ ئەم جۆرە چالاکییانە دەست بدەن.

* * *

بۆ دوایین جار شووشەی قۆدکا بەناوماندا سووڕایەوە. پیرەئان جگەرەیەکی داگیرساوی خستە نێوان هەردوو لێومەوە، منیش چاوچنۆکانە دووکەڵی جگەرەکەم تا قوڵایی سییەکانم مژی، هەر لەو کاتەش نێوچەوانم بەتوندی لە بەرگە لاستیکییەکەی پێرسکۆپەکە گیر کردبوو چاوم بڕیبووە زەوییە شەقارکراوەکە.

– هەموو تانکەکان – ئاگر باران !

دۆزەخی گرمەو بروسکە دەستی پێکرد. گەرمیی ناو تانکەکە گەیشتە ڕادەیەکی ترسناك. وەك ڕەنووی بەفر بەسەر خەندەقە ڕووسییەکاندا باراندمان. لە دەشتەکراوەکەدا تانکێکی بێ ژمار گڕیان گرتبوو، دووکەڵێکی ڕەشیان بەرەو ئاسمانی شینی دەم بەخەندە لێ هەڵدەستا. تانکەکان ناتوانن کەس زیندانیی بکەن، تەنیا دەکوژن و وردو خاش دەکەن. ئێمە هیچی تر وەك مرۆڤی ئاسایی نەبووین، ببووینە مرۆڤی خودکار کە لاسایی ئەو جووڵە و بزاڤانەمان دەکرد کە ئەزبەرمان کردبوون.

تانکەکانی جۆری T٣٤ لە پەلامارێکی پێچەوانەدا بە گرم و هۆڕەوە هاتن، بۆیە ئێمە کاتی ئەوەمان نەما سەربازە پیادە ڕاکردووەکان بکوژین، بەڵکو وامان لێهات لەپێناو ژیانی خۆماندا بجەنگین. بورجەکە خۆی و لوولەی درێژی تۆپەکەی سووڕایەوەو، گوللە تۆپ لە دوای گوللە تۆپی دەگرتە تانکە بە گرم و هۆڕەکانی T٣٤.

من گەیشتبوومە ڕادەی خنکان. تەنگیی و فشارێك لەسەر نێو چاوان و سینگم هەبوو، وامدەزانی لەناو تێڵبەندێکی ئاسنین دام کە وردە وردە دەیهاڕیم. زانیم هەر زوو هیچی تر ناتوانم کۆنترۆڵی خۆم بکەم و دەبێ

دەرچـەكانی بورجەكـە والاّ بكـەم و خـۆم لـەو دەعبایـە پۆلاّییـنـە تـیّ هەڵدەمـە دەرەوە، ئنجا گرمەیەكی توند هات و تانكەكە بەجوولەكردنێكەوە وەستا. هـەر لەو ساتەدا گڕێكـی شین و — سوور لە یەكێك لە لایەكانی تانكەكەوە هەڵسا. وەكو چۆن لـەناو تـەم و مـژێكی سووكدا پلۆتـۆو پۆرتـام دیـتن لـە دەرچـەكانی پێشەوەدا خۆیـان تـیّ هەڵدا، كەچی ستیگ لـە دەرچـەی پشتەوەی بورجەكـەوە دەرپەڕی.

ئەم هـەموو شتە چەند چركەیەكی خایاند، ئنجا منیش هاتـمەوە هـۆش خـۆم و دەسـتم بـەكاركردن كـرد، وەكـو پێویـست : دەرچـەكەم بـەرز كـردەوە و بەبازێكی گەورەوە هاتمە دەرەوە.

گڕە ئاگری گەورە لە تانكەكەوە هەڵدەستان. هـەر یەكسەر تانكەكە وەكو باڵۆنێك پەنماو بەگرمەیەكی وا توند تەقییەوە كە هەناسـەی لـیّ بڕین و، پارچە ئاسنی گەرمی سوور هەڵگەڕاو بە تاقی ئاسماندا بەرز بوونەوە.

كـە بـەهۆی یـەكێكی تـر لـە تانكـەكانمان گەڕاینـەوە یەكـە سـەربازییەكەی خۆمـان، پۆرتـا، ستالینی پـشیلەی لـەبن هـەنگڵی خـۆی نـابوو. كوڵكی ستالین سووتا بوو، بەڵام نەك ئەوەندە خراپ كە مایـەی سـەرنج ڕاكێشان بێت. ستالین قۆدكاكەی بە شادمانییەكی ئاشكراوە خواردەوە.

ئێمەیان ناردە (دنیپرۆپترۆفسك) بۆ هێنـانی تـانكی تـازەو، پـاش دوو ڕۆژ گەڕاینـەوە نـاو ئـەو شـەڕەی كـە سـەڕەرای دەیـەمین ڕۆژی هـەر بـە هـەمان گـوڕو تینەوە بەردەوام بوو. هەموو شتێك دەخرایـە نـاو ئاگری جەنگەكە و دەسووتا. ستوونی بیّ كۆتایی لە سەربازی یـەدەگ بـەخێرایی لەسـەر ڕێگـەكان دەڕۆیـشتن لە پشتی بەرەكانی جەنگەوە و كە دەگەیشتنە بەرەی جـەنگ تیادەچوون. وەكو ئاگر خۆش كردن وابوو.

* * *

له (سینکۆ)وه، که سەردەمێك گوند بوو ئێستاش ئاگرستانێکی گەورەیە، تانکێکی جۆری T٣٤ بەهەموو خێراییەوە هات. وەك بروسك سێرەم گرت و تۆپەکەم ڕێکخست. یان ئەوانن یان ئێمەین، که یەکەم جار ئامانج دەپێکێت. سێرەم لەلای ڕاست لەو تۆقە گرت که لەژێر بورجەکە دایە که خاڵی لاوازی تانکی T٣٤ بوو. ژمارەکانی ناو پریسکۆپەکە لەبەر چاومدا سەمایان دەکرد، ئنجا خاڵە پێچەوانەکانی میکانیزمی بینین یەکیان گرت و، بەگرمەیێکەوە گوللە تۆپێك بەخێرایی ڕێی خۆی گرت و یەکێکی تریشی بەدوادا هات بەر لەوەی یەکەمیان زارکی تۆپەکە بەجێ بهێڵێت بورجی T٣٤ەکە بەئاسماندا فڕی و پێش ئەوەی تاقمی ناو تانکەکە ماوەی هاتنە دەرەوەیان هەبێت، هەموو شتەکە تەقییەوە. ئەمەیان بەم جۆرە بوو.

شەڕێکی دڕندانەی توند لەناو خانووە گڕگرتووەکاندا ڕوویدا. لە یەکێك لە خانووەکانەوە ڕەشاشێکی ڕووسیی هێزە پیادەکانی ئێمەی ئاگرباران دەکرد. پۆرتا تانکەکەی وەرچەرخاند، لەئەنجامی ئەوەی که ملمان له دیوارەکە نا خشتە و گەچ وەك پەڵە هەور بەهەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە. ڕووسە زەندەقچووەکان که خۆیان بەدیوارەکەوە نووساندبوو بەهۆی ڕەشاشەکانمانەوە درویێنە کران و، بەم جۆرە خۆمان کرد بەناو خانووەکەدا و بەناو تۆز و گەردی گێچدا چووینە دەرەوە. ئەمەشیان بەم جۆرە بوو.

سەرباری ئەوەش دەرزەنێك پیادە له پەناگەیەك دەگەڕان که خۆیانی تێدا حەشار بدەن. ئەوان بەدرێژبوون خۆیان بەئەرزە گریزاوییەکەدا نووساندبوو، پاشان ئێمەیان دیت بەرەو ئەوان دەچین، قیت بوونەوەو بەرەو یەکێك لە خانووەکان ملیان نا. یەکێکیان پێیەکی لە پەرژینێك گیرابوو، بەر لەوەی بتوانێ ڕەهای بکا، بووە هەویرێکی خوێناوی لەژێر زنجیری تانکەکەمان. ئەمەشیان وا تەواو بوو.

دارو درەختمان بەردەدایەوە، ملمان لە دیواران دەنا، بەسەر کەسانێك کە بەدلەی قاوەییان لەبەر بوو. تۆ پێویستە لەناو تانکێك بیت و گوێت لە گرمە بێت کە گوللە تۆپێك لە بورجەکەت دەدا بەر لەوەی بزانی گرمە هەر چییە. ئەو تۆپەی ئێمەی تۆپ باران دەکرد لە پشت پەناکەی شوورە بەردینەکەوە بوو.
پیرەئان گوتی: " بە گرهاوێژەکەوە ماچێکیان تێ بگرە و ئنجا گوللە تۆپێکی بەرزە تەقە ".

بەخێرایی گرهاوێژەکەم ڕێکخست و لە هەمان کاتیشدا کە لێشاوی گڕی بەسەر تۆپچییەکاندا دەباراند گوللە تۆپێکی ١٠,٥ لە تۆپەکەمانەوە هەر یەکسەر لە ناویاندا تەقییەوە. دوای سێ دەقیقە کە بەو شوێنەدا چووین، هیچ نەمابوو تەنیا بارستاییێکی لوول خواردووی نەناسراوە نەبێ کە گڕی ئاگر لە هەموو لاییێکییەوە سەمایان دەکرد و هەمووی سووتاوو ڕەش داگەڕابوو.

بەرەو پێش، بەرەو پێش. زنجیرە پانەکانی تانك بەسەر هەر شوێنێکی زەویدا بڕوات ئەو شوێنە هیچ ژیانی تێدا نامێنێ. کە پیاو کوشتاری بەهاری ١٩٤٣ دەبینێ چاك دەزانێ ئەو سەرە مردووە ددان گرە چەند چاك بۆ بەدلەی فەرجەکانی تانك دەگونجێ. لەکاتی پشووەکاندا پەلەمان دەکرد لەتەواوسازیی پێداویستییەکانمان لە پترۆڵ و تەقەمەنیی و، مەکینەکانمان بەسەر دەکردنەوە. قوڕ بەسەر ئەو تانکەی لەکاتی شەڕدا مەکینەکەی دەشکێ. لە ماوەی سێ دەقیقەدا دەبێتە سەرەدو بێژینگ.

ئێمە بەهێزێکی گەورەی T٣٤ خەریك بووین. ئەو تانکە ڕووسییە ترسناکانە زۆر بەهێزو خێرابوون، هەر تەنیا بەهۆی جۆرە تانکە تازەکانی وەکو (تایگەر) و (پانتەر)ی خۆمانەوە دەمانتوانی جەنگی ڕووبەڕوویان لەگەڵدا بکەین. پیادەکانی ئێمە و هی ڕووسەکانیش لە ماوەی ئەو شەڕە پڕ لە نەعرەتەی کەشتییە جەنگەندەکانی سەر زەویدا، گەورەترین شەڕی تانك لەو جەنگەدا، خۆیان لە پەناگەکاندا مات کردبوو. تاریکیی داهات، بەڵام سەرەڕای ئەو زیانە ترسناکانە کە لە سەربازو کەل و پەل کەوت شەڕەکە لە دەشتاییەکانی ئۆکرانیادا هەر بەردەوام بوو. چەند کاتژمێرێك خەوتین لەکاتێکدا تاقمە ئامادەکارییەکان تانکەکەیان ئامادە دەکردەوە. ئنجا بێدار کراینەوە، نیمچە خەواڵوو بەرەو تانکەکەمان چووین، کە لەوێدا پیاوانی تاقمەکە کەل و پەلەکانمانیان لێ بەستین و یارمەتیان داین بۆ چوونە سەر تانکەکان. لە تاریکیدا (فێلدۆبیل)ێکم دیت ستالیتی پشیلەی بۆ پۆرتا بڵند کردبوو، پاشان مەکینەی تانکەکە بەگڕمەگرمەوە کەوتە ئیش.

کاتێکیش، دوای چوار ڕۆژ، وەستانێك لە شەڕەکەدا هاتە پێش، فەوجی بیست و حەفتەمینی تانك تا ڕادەیەکی زۆر تارو مار کرابوو. پاشماوەی گڕگرتووی تانکەکانی ئێمە ئەو دەشتەیان ڕووناك کردبووەوە. لەو چل تانکەی هەمان بوو، تەنیا دووانیان مابوون. لە سەرجەم ئەو چوار سەد تانکەی فەوجەکەمان هەژدەیان مابوون. زۆربەی تاقمی تانکەکان ببوونە ڕەژوو، لەناو تانکەکانیان مردبوون. لەهەموو شوێنێکدا، بەدرێژایی دوو یان سێ میل تانکەکانی جۆری T٣٤ دەسووتان.

ئەوانەی لە مردنی پاڵەوانانە ڕزگاریان بوو بەهۆی سووتانەوە و بەنیمچە برژاویی گەیشتنە نەخۆشخانە نەک بۆ چەند ڕۆژێک بەڵکو بۆ چەند مانگێک و هەندێکیشیان بۆ چەند ساڵێک بەدەم ئازارەوە ناڵاندیان.

شـــەو تانـــک و تـــاقمی تازەیـــان دەهێنـــا. دەبوایـــە تانکـــە لـــەکار نەکەوتووەکانمان پێکەوە لەگەڵ ئەوانەی فەوجەکانی تر لە ئامادە باشیی دابن. لەکاتێکدا دنیا ئارام بوو هەوڵی نووستنمان دا، لەناو تانکەکەدا ڕوونیشتین، سەرمان بە پریسکۆپ و تفەنگەکانەوە نابوو. ئنجا لە ڕۆژی پاشتردا شەڕە تانک دەستی پێکردەوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش بەردەوام بوو.

لێشاوێکی نەپساوەی سەربازی تازە نەفەس لە بەتالیۆنە یەدەگەکانەوە لە ئەڵمانیا و لە بنکەکانی ڕاهێنان لە وڵاتە داگیرکراوەکانەوە هات، لاوی تەمەن حەقدە ساڵیی و هەژدە ساڵیی بەشەش حەفتەی ڕاهێنانەوە، کە لە مەشقی سەربازیدا زۆر باش بوون و بەزرنگییەوە سڵاویان دەکرد و زۆریشیان پێ خۆش بوو بیکەن. ئەوانی تر پیاوانی بە تەمەنتری پەنجا ساڵیی بوون، لە گرتووخانە سەربازییەکانەوە هاتبوون. هتلەر بنی مەنجەڵی خۆی دەکڕاندەوە. هەتا نەخۆشخانەکانیش بەشی خۆیان لە کلۆڵەکان دەبەخشی – بریندار ی ڕەنـگ زەردی، لاوازی، تەنانەت تاداریش لەناکاو پێیان دەگوترا کە تەندروستییان باشە و بۆدەرکردن دەشێن و، من پێم وایە لەفافەکانی برین تەگەرە نین لەبەردەم کوشتندا.

له كوبيانسكای سەر ڕووباری ئۆسكۆل تانكێكی جۆری T٣٤ لەگەڵ ئێمەدا پێكەوە تەقەمان كرد، گولله تۆپی هەردوو لامان ئامانجیان پێكا، بەڵام تانكی ڕووسەكان ئاگری گرت و، بورجەكەی لێ بۆوە، كەچی ئێمە هەڵاتین و پێنج ئەڵقەی زنجیری تانكەكەمان بچڕان و دوو ڕۆڵەریش زیانیان پێ كەوتبوو. ئەمەش بەد بەختییەك بوو، چونكە سرییەكەمان خەریكی كشانەوە بوو، بەم جۆرەش خۆمان و كەل و پەلەكانمان له پشت هێڵەكانی دوژمنەوە بەجێ ماین. خۆمان لەناو هەندێك تەڕاش شاردەوە تا تاریك داهات، ئنجا دەستمان كرد بەگۆڕینی بەشە زیان لێ كەوتووەكانی زنجیرەكە و دوو ڕۆڵەكەوە. كارێكی خەیاڵیی و مێشك ماندووكەر بوو، چونكە بەدرێژایی كات دەبوایە چاوێكمان لەسەر لێشاوی لەبن نەهاتووی تانكەكانی ڕووسان بوایە كە لەبەر دەممانەوە بەدرێژایی ڕێگاكەوە بەدووریی تەنیا سەد یاردەیەك گرمەیان دەكرد.

درەنگانی شەو توانیمان تانكەكە ئامادە كەین بۆ ڕۆیشتن. ئنجا چاوەڕێی بەختی خۆمان بووین. مـن و پـۆرتا لـه بورجەكـەدا دانیـشتبووین و كـڵاوی ڕووسیمان لەسەر بوو، ئامادە بووین بۆ وەڵامدانەوە بەزمانی ڕووسیی ئەگەر هێنراینە دووان. نیشانەكانی خۆمانمان له قوڕدا. له ساتەوەختیی گونجاودا لـه دواوەی سێ تانكی T٣٤ كەوتینە ڕۆیشتن و، هەر بەم جۆرە میل لـه دوای میل لێمان خوڕی تا یەكسەر گەیشتینە پشت هێڵی شەڕەكەوە، لەوێدا هەر سێ وەڵاشەكانمان بەرەو لای چەپ بایان داوە بۆ ناو گوندێك، ئێمەش ڕاستە ڕێی خۆمانمان بەرنەدا. گولله تۆپێك ئامادە بوو بۆ تەقینەوە بەڕووی یەكەم كەسێك لەگەڵماندا دەستەویەخە دەبوو ستیگیش ژمارەیەكی تری ئامادە كردبوون بۆ ئەوەی بەدوایدا ڕەوانەیان بكا. ڕەشاشەكان و گڕ هاوێژەكەش بەهەمان شێوە ئامادە بوون بۆ كاری خێرا. گەیشتینە فەوجەكەی خۆمان.

لە بەرەبەیاندا زەنگی ئاگاداریی دووبارە لێی دایەوە و، دەستەکەی ئێمە بۆ ڕاوکردنی هەندێ T٣٤ و KW٢ نێررا بوو، کە توانیبوویان هێڵەکانی ئێمە بشکێنن و جۆرە ئاژاوەیەك لە پاشەی هێزەکانمان پەیدا بکەن. بەتالیۆنێکی تەواویان لە خەو بێدار کردبوو کە لە شوێنی ئیسراحەتدا لەخانەی سەربازاندا لە ئیسیۆم بوون، بەهەموو پێوانەیەکیش ئەوانە وەکو گاڕانێك یەکانەی چەمووس ڕەفتاریان دەکرد.

وەکو تاژی (تانجی) شوێن هەڵگر، هەردوو تانکەکانمان خۆیان کرد بەناو دارستانێکی بچووك کە نیشانەی شوێنەواری زنجیری پانی تێدا بوو کە هەر دەبێ هی تانکی T٣٤ یان KW٢ بن.

لە تۆپکەی بەرزاییەکەوە ئەوانمان لە ڕۆخی گوندێکدا دیت کە دوو میلێك دوور بوو. بەپێی نەخشەکەمان ئەمە دەبێ گوندی سڤاتۆڤ بێت. ئێمە تەنیا توانیمان سێ تانکی T٣٤ بەدی بکەین و وای بۆ چووین کە ئەوانی دی چوونەتە شوێنێکی تر بۆ ئەوەی زیانی زیاتر بگەیەنن. هەر کە سێ تانکەکە لەناو خانووەکاندا بزر بوون ئێمە زۆر بەخێرایی لە گردەکە دابەزین بۆ ئەوەی پشتیان لێ بگرین. دوورکەوتینەوە بۆ پشت ئەستێرکێك و بۆ ناو بیشەڵانێکی چڕ، کە هیواداربووین لەوێدا بتوانین لێیان نزیك ببینەوە پێش ئەوەی ئاشکرامان بکەن. تانکی دووەممان لە پشت بینایەکی درێژەوە کە ڕەنگبێ قوتابخانە یان شتێکی لەم بابەتە بێ، جێگای خۆی گرت بۆ ئەوەی لە چاوەڕێدا بێت و، ئنجا ئێمە بەرەو پێش لێمان خوڕی تا تەنیا پەنجا یاردە لە دوو تانکی T٣٤ دوور بووین.

پیرەئان خۆی خزاندە خوارەوە بۆ لای من بۆ ئەوەی دڵنیا بێ لەوەی کە تۆپەکەم چاك داناوەتەوە، چونکە هەر تیرەندازێیکی خراپ مانای مردنی ئێمەیە. ئنجا تیرەندازەکە گرمەی هات. قەوانەکە فڕییە دواوە و ستیگ گوللە تۆپێکی تری لە لوولەکە ئاخنی. بەخێرایی بورجەکە سووڕایەوە تا دووەم تانکی T٣٤ لە پریسکۆپەکەدا دەرکەوت. دووبارە تۆپەکە گرمەی هات و لەو ماوە کورتەدا گوللە تۆپەکە بەتەواویی بورجەکەی لە T٣٤ەکە داماڵی. کاتێکیش کە لە بیشەلانەکەدا بەخێرایی دەرپەڕین و بۆ یاریدەدانی ئەو هەڤاڵانەمان چووین ئەوانەی کە بەهۆی ئەو ئاگر بارانە توندەدا، وا دیار بوو چاك تێوە گلابوون، بینیمان دوو تانکەکەی جۆری T٣٤ ئاگریان گرتووە. تەنیا دوو سەد یاردەیەك بە ڕێگاکەدا ڕۆیشتبووین کە تانکێکی جۆری KW٢ کەوتە بەر چاومان، ئەوانە دەعبای تواناداری نەوەد تۆنی بوون کە بە پێنج ڕەشاش و گرهاوێژێك و تۆپێکی ١٥ سانتیمەتری کە لە بورجێکی گەورەوە دەرپەڕیبوو، چەکدارکرابوون، لەم بەر بۆ ئەو بەری ڕێگاکە وەستا بوو، ڕەشاشەکانی گوندەکەیان ئاگر باران دەکرد. هەروەها تۆپە مەزنەکەشی ئاگر دەدا، بۆیە گوێچکەکانمان ویزەیان دەکردو، گوللە تۆپە گەورەکە وەکو گەردەلوولی پەلاماردانێکی ئاسمانیی بوو.

ستیگ گوللە تۆپێکی جۆری (S)ی لە تۆپەکەدا ئاخنی، ئەمە تەنیا گوللە تۆپێکە کە دەتوانێ قەپێلکی ئەستووری KW٢ دووبەدەر بکات. کە ئاگرماندا، ئاگرستانێك لە لوولەی تۆپەکەوە دەرچوو. لە بەدبەختیی بینیم کە نیشانم زۆر لە خوارەوە گرتووە. گوللە تۆپەکە لەسەر زنجیری دەعبایەکە تەقیبۆوە. پۆرتا و پیرەئان بەسەر ئابەلەدیی منیاندا هاڕاندو بورجە زلەکەی ئەو دەعبایە دەستی

بەسووڕان کرد تا بەرامبەرمان بێت. خۆشبەختانە بورجی KW۲ زۆر لەسەرخۆ دەسووڕێ.
پیرەئان هاواری کرد " ئاگردە، هەی نەفرەتبار ! لەوێ دانیشتووی چاوەڕێی چیتە ؟ ".

دووبارە تۆپەکەمان گرمەی لێ هەستاو گوللە تۆپێکی جۆری (S) بەتەنیشتی دەعبایەکە کەوت، بۆ ماوەیەك بورجەکە وەستا، ئنجا دەستی بەسووڕان کردەوە.
- یۆرتا، بجوولێ، هەی لەعنەت بار !.

پیرەئان منی لە لای ئامێری بینینەکە لابردو خۆی لەوێ دانیشت. هەر دەستبەجێ بورجەکەی سووڕاندەوە و تەماشاییێکی کرد، ئنجا تۆپەکەمان پێنج جار گرمەی لێوەهات. تەقینەوەییێکی گەورە لەناو جانەوەرە زلەکەدا ڕووی دا. سەیر بوو کە بەتەواویی ئاگری نەگرت سەرەڕای ئەوەی کە بورجەکەی لە لەشی جیابببووەوە و بەسەر لایەکیدا شۆڕ ببووەوە. سێ پیاو خۆیان تێهەڵدا، بەڵام ڕەشاشەکانمان هەر سێکیانی دروێنە کرد. پیرەئان دوو گوللە تۆپی تری خێواندێ و پاشان دووکەڵ و گڕی ئاگر لە تانکەکەوە هەستا.

بەم جۆرە تەواویی ڕۆژەکە بەسەرچوو، لە کۆتایی ئەو ڕۆژەشدا هیچ تانکێکمان بەجێ نەهێشت، بەڵکو بەقیتیی لە پشت قۆن بارنگ دانیشتین لەکاتی گەڕانەوەمان بەرەو هێڵەکانی خۆمان. پاش سێ ڕۆژ، دوای ئەوەی هەشت ڕۆژ شەڕی بێ پچڕان کرا، فەوجەکەمان لە جەنگەکە برایە دەرەوە و چوورینە خانەی سەربازان بۆ پشوودان لە گوندی (ئاکتیرکە).

لەوانەیە بۆ هەندێ کەس ئەم وەسف کردنەی شەڕەکە شتێکی ڕۆمانسیی و سەرسوڕمێن بێت. هەر زۆرانبازییەك لەگەڵ مردندا، بەهەر شێوەیەك بێت شتێکی دراميیە، دوورت دەخاتەوە، یان هەر دەتباتە ئەو سەری شتی باوەوە، بەڵام دەتوانی بە ڕێگای تر تیربازیی لەگەڵ مردندا تاقی بکەیتەوە. نەك بەچوون بۆ جەنگ و، دەتوانی هەر هەمان درامای ڕەهاکراو تاقیبکەیتەوە، تەنیا بەم جیاوازییە : کە مەبەستەکەی زۆر گەورەیە و ئامانجەکەشی ڕزگارکردنی ژیانە.

تەنیا کەسانێکی کەم جەنگ بە سەرسوڕمێن و ڕۆمانسیی دادەنێن. بۆ زۆربەی خەڵك جەنگ پیسیی و کۆڤان و تا بڵێی بێزارییەکی بێ کۆتاییە و پنتە ڕووناکەکانیشی دەوەستنە سەر پاڵدانی دوگمەیەك کە دەبێتە هۆی بەرەڵلا کردنی هەرچییەکی ئارەزووی تاقیکردنەوەیانت دەکرد، لە دووریی چەندین میلەوە. جەنگ ڕێگاییێکی خراپی تاقیکردنەوەی بەرزییەکانی ژیانە، بەنائومێدیت دەهێڵێتەوە و کاتێکیش دەستبەرداری دەبیت ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە هیچ مەبەستێکی گەورەت دەستگیر نەبووە و پەیوەندیشت بەوانە نەماوە کە دەگەڕێیەوە لایان، ئەتۆ وەکو پێت دەڵێن ناڕەحەت بوویت و ئەعسابیشت نەماوە. ئەمە هەم بۆ سەرکەوتوو هەم بۆ دۆڕاویش ڕاستە. لەوانەشە ئەم تراژیدیایە بۆ سەرکەوتوو گەورەتر بێت. ئەو، سەرکەوتوو بووە، بەڵام کێی بەزاندووە و بۆ چ مەبەستێك پەلاماری هێناوە ؟ ئەو ناتوانێت سەرەدەری لێدەر بکات. ئەو کە دەستی پێکرد شتەکە زۆر جیاواز بوو، چونکە پاشان باوەڕی بەڕاستییەکی سادە هێنا، بەڵام ئەمە سەلماندی کە نائومێدانە ئاڵۆز و شێواو بوو، سەردەمانێك هەموو وشە پڕ لە شانازییەکانی لێهاتنە داماڵین کە لە کاتی جەنگدا پێشکەشی کرابوون.

دوای ئـەوەی ڕووســەکان پاشەکـشەیان پـێ کـرا بـۆ بیلگـۆرۆد لەســەر ڕووبـاری دۆنیتـز، پـەلامارە بەهارییەکـەی ئەڵمانـەکان کـە خڵتـانی خـوێن بـوو، وەسـتا و، تـەواویی بـەرەی جـەنگیش هـەر لـە دەریـای بەسـتەڵەکەوە تـا دەریـای ڕەش ئارام بوو. تەنانەت فڕۆکەکانی هەردوو لاش بەبێ چالاکیی مانەوە. هاوینێکی خۆش بوو.

پۆرتا گوتی: " لە پێشا من دەمەوێ گەرماوێك دروست بكەم، دەبێ دووشێكی وای هەبێ، وا دروست كرابێ كە ئاوەكەی وەك نەرمە بارانی هاوینان ببارێ و، كاتێكیش كە بارانێكی تەواوم لێدەدا، دەستەیەك كچۆڵەی ڕووت و قەشەنگ دێن هەڵم دەگرن و دەمبەنە سەرەوە بۆ یەكێك لەو سیی و حەفت ژوورەی خۆم. هەموویان لەپاڵم دەبن و بەنۆرەش لە تەنیشتمەوە دادەنیشن و گەمە بە گەڵ و گوانم دەكەن. ئنجا دەستەكەی تر دێن، ئەوانیش كەسانی ناسكن و سەد پاپیی پڕ لە بۆنداترین تووتنی وەدەست كەوتوویان پێیە. كچۆڵەكان پاپیەكانم بۆ دادەگیرسێنن و دەیخەنە ناو دەممەوە بۆ ئەوەی من تەنیا هەر پاڵ كەوم و دووكەڵەكە هەڵبمژم و پفی كەمە دەرەوە. ناو ناوەش یەك دووانێكیان بەدوای زمانمدا دەگەڕێن تا قورگم. ئەو یەكە و هەر هەمووشیان بۆنی وەنەوشەیان لێ دێ. كە ئارەزووی خواردنیش دەكەم كچەكان خواردنەكە پارچە پارچە دەكەن و فووی لێ دەكەن و ئەگەر هەر شتێك پێویست بەجوین بكا ئەوا بۆمی دەجوون بۆ ئەوەی من ئەو كارە قورسە نەكەم ".

پیرەئان گوتی: " وابزانم دەبێ تیمێکی ترت هەبێ بۆ سڕینەوەی پاشەڵت کە دەچیتە زەلکاوەوە ؟.

- ئەو نامەیەت خوێندۆتەوە كە بەم دواییانە لە ئەسمۆسەوە هاتووە ؟ پلۆتۆ نامەكەی پێشكەش كرد. " ئەگەر تەنیا نیوەی ڕاست بێ ئەوا من هیچ شتێكم نییە دژی ئەوەی كە هەردوو لاقی لەگەڵ دەستێكی بڕا بن. تەنیا تۆ هزری ئەوە بكەوە كە زەلكاوەكە دەهێنرێتە ناو نوێنەكانت. پەرستارێكی خۆشەویستیش مامەڵەیەكی جوانت لەگەڵ دەكات كە خۆت پیس دەكەی. وا پێدەچێ ئەسمۆسییش هەموو تاكە ڕۆژێك پەتاتەی خووساوو بڕێكی زۆر گۆشت بەرازی پارچە كراو بخوات و ڕۆژانی یەكشەممەش دوو هێلكە ! ئەوان بۆ خۆیان زۆر ئاسوودەن، ئەو بریندارانە !

ئای ئەو ئەسموسە چ بەختێكی هەیە !.

# ئاشتییێکی جودا

ڕووسەکان بڵاوکراوە و نووسراوی پڕۆپاگەندەیان بەسەردا باراندین. لە یەکێکیانـدا هـاتبوو کـە حەفتەیـەك لەمەوبـەر هتلـەر مـردووە و سـتالینیش زۆر نەخۆشە. هتلەر بەهۆی جەنەڕاڵێکەوە تەقەی لێکراوە، بەڵام مردنەکەی لەلایەن نازییەکانـەوە ئاشـکرا نـەکراوە وەکـو چـۆن نەخۆشـییەکەی سـتالینیش لەلایـەن کۆمۆنیستەکانەوە. نووسراوەکە بەم بانگەوازە کۆتایی هات :

پیاوانی هێزەکانی سوپا و کەشتیگەلی ڕووسیا و ئەڵمانیا ! دەست لەناو دەست لەپێناو ئەڵمانیاو ڕووساییێکی ئازاد! لوولەی چەکەکانتان بکەنە دوژمنە ڕاستەقینەکانتان، پیاوانی (SS) و گۆستابۆ، ئەو بکوژانەی کە گرتووخانەکان لـە ئـەڵمانیا پاسـەوانیی دەکـەن، ئەوانـەی کـە جـەنگ درێــژ دەکەنــەوە، ئــەو بێزراوانـەی حـەز لەجـەنگ دەکـەن. ئـەی سـەربازانی ئـەڵمان ! بـەرگی دیلییـەتی دامـاڵن ! چـیتر چـاوەڕێ مەکـەن، هـەر ئێـستا جێبـەجێی بکـەن. ئێـوەش ئـەی سـەربازانی ڕووسـیای کـۆنی پـیرۆز، تەقـە لـە GPU و کۆمیـسارەکان بکـەن ! تاکـەی لەلایـەن ئـەم دەعبایانـەوە پێشڕەویی دەکـرێن، ئەوانـەی ژن و خوشـك و خۆشەویـستەکانتان لـە مـاڵی خۆیانـدا لـێ زەوت دەکـەن کەچـی ئێـوەش لـە بـەرەکانی جەنگدا خـوێنی خۆتـان دەڕێـژن ؟ سـەربازانی هـەردوو لـە شـکری ئـەڵمانیا و ڕووسـیا ! تەقـە لـە برایـانی خۆتـان مەکـەن، لـە جیـاتی ئەمـە ڕووی چەکەکانتان بکەنە بکوژەکان لە پیاوانی SS و GPU ! .

سوپای ئازادی

ئەم بڵاوكراوەیە بە بایەخێكی سەرسوڕمێنەوە خوێنرایەوە و گفتوگۆی لەسەر كرا. ئێمە هەموومان زۆر ئارەزوومەندبووین بۆ باوەڕكردن بە هەر چیرۆكێك، هەر چەندە جێی باوەڕیش نەبوایە، بێسەلماندایە هتلەر مردووە، بۆ ئەوەی هەر زوو بتوانین بگەڕێینەوە نیشتمان و كێشەكانمان لەگەڵ باندی هتلەردا یەكلا بكەینەوە. ئێمە ئاشووبەكەمان وەكو خۆی وەرگرت و، گریمانەی ئەوەمان كرد كە بەخێرایی دەیبەینەوە. پۆرتا بە بیركردنەوەیەكی قووڵ گوتی :
– پێشەكی دەبێ ئێمە هەندێك لەو ناڕێكییەی كە كردوومانە ڕێك بخەینەوە و شوێنەكە بە ڕێك وپێكی و بەجوانییەوە بدەینەوە دەست ڕووسەكان، خشتەكان بەجوانیی خڕكەینەوە، بۆ ئەوەی سەربازی ڕووس هەر یەكسەر تفەنگەكەی فڕێ بدا و دەست بە دروستكردنەوەی خانووەكەی بكاتەوە. هەروەها باشترێكە ئێمە یەك دوو پرد و هەندێكی تر لەو زەرەر و زیانانەی كە بەخشیومانن چاك بكەینەوە بۆ ئەوەی شوێنەكە ئەوەندە بێ سەروبەر دیار نەبێت كاتێك كە دەیان دەینەوە دەست.
پیرەئان هاواری كرد " ئەدی شارەكانی ئێمە لە ئەڵمانیا ؟ دەتوانم سوێند بخۆم كە سەربازە بەریتانییەكان تەنانەت بەوەندەش یارمەتیمان نادەن كە خشتەكانمان بۆ خڕكەنەوە ".

پۆرتا بە باوەڕێكی پتەوەوە وەڵامی دایەوە: " ئەوەندە دڵنیا مەبە، ئەگەر نا، كارێكی باش دەبێت كە ئێمە لەگەڵ ڕووسەكاندا بچین و سەربازە بەریتانییەكان فێری ڕەوشت بكەین. بەڵام شتێكی سروشتییە كە فرۆكەوانەكانمان بچنە ئەوێ و ئەو ناڕێكییە ڕێك بخەنەوە كە لە وێدا كردبوویان. تەنیا ئەمە شتێكی مەعقوولە ".

پلۆتۆ ناوی فەرەنسا و هەر هەموو ئەو وڵاتانەی هێنا کە ئێمە ناڕێکیی و تێکدانمان تیادا کردوون و کە پێویستە ڕێك بخرێنەوە، پۆرتاش کەوتە دەریای بیرکردنەوە و گوتی :

– وا پێدەچێت ئێمە لە داهاتوویێکی نزیکدا کاری زۆرمان ببێت، بەڵام هەر چییەکی ببێت، هەموو جەنەڕاڵ و ئەفسەرەکان دەبێ ڕوتبە و نیشانەکانی سەرشانیان داماڵن و بێن ئەوانیش کار بکەن. شتێکی باشە ئەگەر گۆبلز و گۆرینگ و ئەدۆلف و هملەر و ئەو کابرایەی ناوی ڕۆزێنبێرگە و هەر هەموو ئۆرۆستۆکراتییەکانی تر لە ڕێکخستنەوەی گیتۆی وارشۆدا* کاریان پێ بکرێ. ئەوانە دەبێ فرمێسکی خوێنین هەڵڕێژن.

دوای دوو ڕۆژ چاکتر زانیمان. جەنگ هەر بەردەوام دەبێ، نەك هەر ماوەیەکی کورتیش. نیاز وایە بەتالیۆنەکەی ئێمە وەکو پیادە بەکاربهێنرێت و بەتالیۆنی ١٤ای جاگەری پێ بحەسێنرێتەوە، کە ناوچەیەکی بەدرێژایی ڕووباری دونێتز داگیرکردبوو. شەو، کە چووینە ناو هێڵەکانی پێشەوە، بەرەی جەنگ هێمن بوو، گوێمان لە تەقەیەکیش نەبوو. ستالین لەسەر بوخچەی پۆرتا هەڵتوترکا بوو، بەدلەیەکی تەنکی سپی کەتانی لەبەر بوو، زۆر دڵخۆش بوو بەم سەفەرە.

ئەو تەنیا ئۆبەر گیفریتەرێك بوو لە هەموو سوپای ئەڵمانیا کە بەدلەیەکی سپی گەرمەسێریی لەبەر بێ، بەڵام کۆماندۆفیلد وێبلەکە ڕێ پێدانی نووسراوی بۆ ئەم مەبەستە دەرکردبوو، خستبووشیە ناو کونیە سەربازییەکەیەوە، کە بەشێوازێکی نیزامییەوە لە گیرفانی لای ڕاستی سەر سنگی دانابوو تاکو (سەگە گەورەکان) بێن و تا ئارەزوویان دێنێ تەماشا بکەن. ئەوەندەی کێشەکە

---

* گیتۆی وارشۆ Warsaw Ghetto = گەڕەکی جوولەکەکان لە وارشۆی پایتەختی پۆڵۆنیا.

پەیوەندی بە ئۆبەرگیفریتەر ستالینی سەر بە فەوجی (٢٧)ی سرییەی ژمارە (٥)ەوە هەبێت هەموو شتێك ڕێك وپێك بوو.
کە کارمان گرتە دەست، سەربازەکانی سرییەی حەفتەمی سەر بە بەتاڵیۆنی جاگەر گوتیان :
- ئێستا، تەقە لە ڕووسەکان مەکەن. ئەوان کۆمەڵێکی ئازان لەوێ. ئێمە هیچ جۆرە وڕێنەیەکی شێتانەی وەك تەقەکردنمان لێرە نییە.
ئێمەش وامان زانی ئەوان شێتن.

کەمێك دوای خۆرهەڵات گوێمان لە هەراو هۆریاییێکی ترسناك بوو لە بەری ڕووسەکانەوە، هاوارو بانگ کردن و هۆی ها. ئەوان بەئاشکرا بۆ خۆیان ڕایان دەبوارد، ئێمە گوێمان لەو شتانە دەبوو. پاشان هەندێکیان لەسەر سەنگەری خەندەکەکانیانەوە دەرکەوتن و بە هاوارکردنەوە ڕۆژباشیان لە ئێمە کردو، ئێمەش بەسەرسامییەوە زارە بەشکەمان گرت. لە هەمان کاتیشدا زۆر بەئەدەبەوە پرسیان کە ئایا ئێمە تاقمە تازەکەین و ئایا چاك نووستووین. ئەوان هیوای ئەوەیان خواست کە سەگەکەیان
بەهۆی وەڕینەوە ئێمەی هەراسان نەکردبێ، ئنجا شتەکان لەبەری ڕووسەکانەوە بەڕاستیی چالاك بوون. سەرجەمیان ڕژانە دەرەوە، ڕووت و قووت و، سەرو سەر خۆیان تێڕو دەکردە ڕووبارەکەوە، ئێمەش نیوەی لەشمان لە دەرەوەی خەندەکەکەوە بوو بەچاوی زەقەوە سەیری ئەوانمان دەکرد ڕووسەکانی ناو ڕووباریش هاوارو هەرایان بوو، ئاویان بە یەکتری دادەکرد و بەسەر ئێمەیاندا دەبۆڕاند.
- خێرا کەن وەرن. ئاوەکە گەرم و خۆشە.

پۆرتا لە پێشمانەوە، ڕووت و قووت تەنیا کڵاوێ نەبێت لەسەرمان بوو، خۆمان کوتایە ناو ئاوەکەوە. پۆرتا، کە ستالینی لە باوەش بوو خۆی فڕێ

دایـه نـاو ئاوەکـه و، ڕووسـەکان کـه بیـستیان پـشیلەکەیان نـاوی جۆزێـف فیـساریۆنۆفچ سـتالینه لەبـەر پێکـەنین خـەریك بـوو بخنکـێن. دەرەجـەدارێکی ڕووس هـاواری کـرد " ئەمـە جـۆری ڕاستەقینەی جەنگـە، وا نییـه ؟ ". ئێمـەش قـسەکەیمان پەسـند کـرد سـێ هوتافیـان بـۆ ئـەڵمانیا لێـداو، ئێمـەش سـێ هوتافمان بۆ ڕووسیا کێشا.

پیرەئان وەکو منداڵێك دڵخۆش بوو. چاوەکانی دەبریقانەوە، هـاواری کـرد " ئەمە زۆر خۆشە، لای خۆمان ڕەنگبێ وا بزانن ئەمە درۆیە ".

ئەو ڕۆژە گەلێك شتی لە ڕادەبەدەری لەخۆ گرتبوو. بۆ نموونـه، زانـرا کـه ڕێکەوتنێکی نیزامیی هەیە کە ڕووسەکان هـەموو ڕۆژێك چـەند گوللـە تۆپێـك لـه نێوان کاتژمێر چوار و پێنج و نیو بتەقێنن، ئێمەش هینـەکانی خۆمـان لـه نێـوان سـێ و چوار و نیـو بهاوێـژین. هـەر گوللـە تـۆپێکیش دەبـێ بـه ڕێکیـی لـه زەوی بێلایەنـدا بکـەوێت و ئـازار بەکـەس نەگەیـەنێت. ئـەم کـارە جەنەڕاڵـەکانی ڕازی دەکرد . هەر تەقە کـردنێکیش ئەگـەر بـه ڕەشـاش و چـەکی سـووك بکرێـت، ئـەوا ئاسـایی ئـەم تەقانـە بـە ئاسمانـەوە دەنـرێن. هـەر کـاتێکیش ئەگـەر ڕووسـەکان گوللە ڕووناکییـەکی سووری چوار ئەستێرەیی هەڵبـدەن، ئەمـە مانـای وایـه کـه ستافێك ئەفسەر هاتوون بەمەبەستی پشکنین و هەر تەنیا وەکو شتێکی ڕواڵـەت هەنـدێك چـەکی ئۆتۆماتیـك دەتـەقێنن. هـەر کـاتێکیش ئەفـسەرە پـشکنەرەکان ڕۆیـشتن ئـەوا گوللـە ڕووناکییـەکی سـەوز هەڵـدەدەن، ئێمـە هـەموو جـۆرە نیشانەیەکمان هـەبوو کـه یارمـەتی دەدایـن ژیـانی هـەموو کەسێك خـۆش بێـت. بێگومانیش سەرمان لە یەکتری دەداو، یەکتریمان بۆ فراڤین دەعوەت دەکـرد بـه ڤودکاوە، ئەوەندەی دڵمان حـەز بکـا شـتمان ئـاڵوگۆڕ دەکـرد، شـناپس، جگـەرە، خـۆراکی قوتـوو، بەتانیـە، چـەك، سـەعات و ڕۆژنامـه و گۆڤـار. گۆڤـاری وێنـەدار زیـاتر بـرەوی هـەبوو. جا ئەگـەر تووشمـان بـه تووشـی هـەر وێنەیـەك ببوایـه کـه

خۆشییەکی تایبەتیمان لێ وەربگرتایە ئەوا گەشتێکمان بۆ ئەو بەر دەکرد و تێکستی وێنەکەمان پێ وەردەگێڕان، دیارە، ڕووسەکانیش هەمان شتیان دەکرد.

جگە لەمە، ئەو مانگانەی هاوینمان بە هێمنیی و ئارامیی بە ئیشی یەك جۆریی بەسەر برد. کە لە سەربازخانەکانمان بووین لە ئاکتیرکا مەشقمان بەو سەربازە تازانە دەکرد کە بە لێشاوێکی بێ دوایی لە ئەڵمانیاوە دەهاتن. مەشق پێکردنی سەربازە تازەکان کارێکی بێزارکەرە، بەتایبەتی ئەگەر نەتوانی مەبەستی سەرەکی کردەوەکەت بەدی بکەی.

ئێمە دەستێکی باشمان وەشاند، کاتێ کە هەژدە شووشە و بەرمیلێکی پەنجا لیتریی براندی باشی فرەنسیمان دزی. لەسەر ئەم بنەمایە میوانداریيەکمان ڕێکخست. پێنج شووشەشمان گۆڕییەوە بە سیی هێلکە، سێ مریشك، دە پاوەند پەتاتە، هەندێ خۆخی ناو قوتوو و تەماتە، ئنجا مریشکەکانمان بە خۆخ و تەماتە و گەلێك شتی تر ئاخنی و یەك شووشەی تەواو کۆگناکمان بەسەر داکردو، ئەو ڕووسەمان بۆ خواردنەوە بانگهێشت کرد کە خاوەنی خانووەکەمان بوو. پۆرتا ئەسپێکی لە کۆزاکییەك خواستەوە (ئەو یەکێك بوو لەو خۆبەخشە کۆزاکییانە کە شان بە شان لەگەڵ ئەڵمانەکاندا شەڕی دەکرد)، بەڵام چونکە پۆرتا پێشتر قەت سواری ئەسپ نەبووبوو، بۆیە کارەساتەکە بەوە کۆتایی هات کە ملی ئەسپەکە شکا. کابرای کۆزاك شێرزە بوو، لە کۆتاییدا بەستمانەوە و پێکەوە لەگەڵ ئەسپە مردووەکەیدا خستماننە سەر کەڵەکێك و بەو ڕووبارەمان دادا کە بەناو گوندەکەدا ڕەت دەبوو. یەکێك لە ڕووسەکان داوای لێ کردین کە ئەگەر دەکرێ پشیلەکەی بۆ بکوژین، چونکە مریشکی دەدزین، جا بۆ ئەمەش پۆرتا شتێکی وای ڕێکخست بەشێوەیەکی

ئەوتۆ کە جێی ڕەزامەندی گشتیی بوو. ڕاستە پشیلەکە لە ئەنجامی کارەکەی پۆرتادا نەمرد، بەڵام کاتێ ڕاوەکە لەبەر نەمانی تەقەمەنی تەواو بوو پۆرتا سەگێك و سێ مریشکی کوشتبوون، مانگاییێك و بزنێکی بریندار کردبوون و، گوللەیەکیشی لە کڵاوی ڕووسە خاوەن پشیلەکە دابوو. ڕووسەکە پۆرتای بەوە هێمن کردەوە کە پێی گوتبوو بەرکەوتنی ئەو پشیلەیە لە ڕادەبەدەر دژوارو زەحمەتە.

هەروەها پیرەئانیش ددانێکی پۆرتای کێشا. پۆرتا ماوەیەکی زۆر بوو بەدەست ددان ئێشانەوە دەیناڵاند, بەڵام زاتی نەدەکرد بچێتە لای ددانساز. ئێمەش ئەو ڕێگا کۆنەمان بەکارهێنا، داوێکمان لە ددانەکە و لە دەرگاییێك بەست و ئنجا دەرگاکەمان داخست, بەڵام داوەکە پچڕا. پاشان پیرە ڕووسێك کۆنە گازێکی ددانسازیی هێنا، ئێمەش پۆرتامان گرت و پیرەئانیش ددانەکەی بۆ دەرهێنا، بەڵام ددانەکە ئەو نەبوو، بۆیە کردەوەکە دووبارە کرایەوە، ئەمەش پۆرتای تەنیا بەیەك ددان هێشتەوە، ددانە، ڕەشەکەی پێشەوە، بۆیە پیرەئان ئەویشی کێشا بەر لەوەی نەخۆشە هاوارکردووەکە بکەینەوە. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك هەردووکیانمان لەیەك جوداکردنەوە, بەڵام لە کۆتاییدا پۆرتا تۆڵەی خۆی سەندەوە. توانی پیرەئان ببەستێتەوە، ئەوجا بووت و گۆرییەکانی داکەنانەد و، هەر قاچێکی لە ستوونێك بەستەوە، خوێی لە بنی پێیەکانی هەڵسوویی، ئنجا بانگهێشتی دوو بزنی کرد تا بنی پێیەکانی بلێسنەوە. لەو کاتەی کە پیرەئان هاواری بوو، پۆرتا بیرەی فڕدەکرد و خۆی و قامچییە کۆزاکییە درێژەکەی هەمووماني لە بارێکی ناخۆشدا هێشتەوە. بزنەکان هەر دەیان لێسییەوە. پیرەئان هەنسکی پێکەوت و بۆڕاندی و بە گرژییەوە پێدەکەنی :

ئەمە کاتێکی خۆشە بۆ تۆ !

له شـوێنێکی دوور لـه ڕۆژهـەڵاتی پروسـیا کۆبوونەوەیـەکی گـەورەی هـەموو فەرمانـدەی لەشـکرەکانی ئـەڵمانیا هـەبوو، جەنـەڕاڵ ئۆبەرسـتەکان و جەنـەڕاڵ فیلدمارشالەکان خۆیان و ئەو شریتە سـوورانەی سـەر لاتەنیـشتەکانی پانتۆڵـه چـاک ئوتووکراوەکانیان لەوێ بوون. قەیتانی زێڕی سەر ملوانکە سـوورەکانیان لـه بریقـەدا پەنجەبازیی لەگەڵ خشڵەکانی ڕیتەرکروزس دەکرد کـه بـه دەوری ملـی ئـەو جـۆرە ئۆرستۆکراتانەدا شۆڕ دەبنەوە.

به چاویلکه یـەک چـاوەکانیانەوە خۆیـان بەسـەر نەخـشە گـەورەکانی بـەرەی فراوانی جەنگدا کووڕ کردبووەوە. سەعات لەدوای سەعاتیان له جوولاندنەوەی ئـاڵای بچووکی ڕەنگاوڕەنگدا بەسەر دەرزیلەی بچووکدا بەسـەردەبرد. هـەر دەرزیلەیـەک نیشانە بوو بۆ فرقەیەکی هەژدە هەزاریی تا بیست هەزار نەفەریی. هێـزو شـەڕەف بابەتی ڕازیکردنی ئەو فۆهەرە بچووکە هاوارکردووانەیە.

"... جا من داواتان لێدەکەم کە سڵاوم بەو چەندین هـەزارە بگەیـەنن کـە کۆتـایی شانازانەیان پێدەدرێت بەوەی کە لە شەڕدا دەکوژرێن و، لەپێناو دایکـی نیـشتمان و شەڕەفی سەربازییدا دەجەنگن."

بەم جۆرە فەرماندەی لەشکرەکەمان بۆ فەرماندەی لەشـکرەکان دوا، کـە لـە نێوانیاندا فەرماندەی ئەو فیرقەیە هەبوو کە لیوای (٢٧)ەمی زرێپۆش سەر بەو بـوو. ئەو مێداڵ پێدراوە بەکۆمەڵکوژە زەبەللاحە بەچـاویلکه یـەک چـاوەکەیەوە سـڵاوێکی کرد و گەڕایەوە بۆ بارەگـای فەرمانـدەیی دوور، دوور لـە پـشتی بـەرەی جەنگـەوە، کەچی فەرماندەی فیرقەکان گەڕانەوە بۆ فیرقەکانیان بۆ ئەوەی خۆیان بۆ پەلامارێک

ئامادە بکەن، بۆ ئەوەی مێداڵ پێدراوەکان بتوانن بەردەوام بن لەسەر یـاریکردن بـە ئاڵا بچووکەکانیان و بەنەخشە مەزنەکانیان.

" فەوجەکە ! بۆ نوێژکردن – چۆک دادەن ! "

پێشنوێژەکە بەدلەیەکی ئەفسەرانەی بە شـریتی ئەرخەوانییـەوە لەبـەر بـوو. پلەی مێجەری هەبوو بەم جۆرەش ئەو بەرامبـەر بـە ئەفـسەرانی سـتاد بـوو. لـەلای چەپی کراسەکەیەوە کرۆسێکی ئاسنین شۆڕ ببۆوەوە و بریقەی دەهات.

" خوداوەندا ! ئەم چەکە شکۆدارانە پیرۆز کە، کە لێرەدا لەسەر شـەرەفی تـۆ دانــراون، ماوەیــان بــۆ بڕەخــسێنە کــە ئــەو بەربــەرە ســوورانە بهــاڕن و ئــازارو ئەشکەنجەیان بدەن، ئێمە لەبەرت دەپارێینـەوە، ئـەی خوداوەنـدمان لـە ئاسمانـدا، ئەوەندە هێزەمان پێبدە بۆ ئەوەی ببینە ئامێری دەستی تۆ بۆ سزادانی ئـەو سـوورە زۆنگاو نشینانە."

پاشان ئەوەش دەگێڕمەوە کـە چـی ڕوویـدا کاتێـک مـن و پۆرتـا لـە میانـەی شەڕێکی گەورەدا ئەم قەشەیەمان لەکۆڵ کردەوە.

# سەرنویشتێکی شکۆدار

پیرەئان هاواری کرد " بۆ دەرەوە، بۆ دەرەوە، بەخێرایی، ئەمە کۆتایی فەوجی زرێپۆشی بیست و حەفتەمینە".

پاش بیست دەقیقە هەر شەش سەد تانکەکانمان ببوونە کەلەخی سووتاوی قوپاو. دوای بیست دەقیقەی تر (ئۆبەرست ڤۆن لیندناو) بەئوتومبێلە هەمە مەبەستییەکانییەوە هات و، کە تەماشاییێکی تانکە تێکشکاوەکانی کرد بەدەنگێکی ماندووەوە گوتی :

– هەموو ئەوانەی کە سەلامەتن بگەڕێنەوە بۆ پەناگە کۆنەکانمان. فەوجی (٢٧)ەمین لە ئەنجامی ئەو تێکدانەی کە هێزی ئاسمانیی کردی هیچی تر حیسابی بۆ ناکرێت.

هێزە ئاسمانییەکە هی خۆمان بوو، بەهۆی هەندێ هەڵەی پەریشانەوە، بەفڕۆکە (شتۆکا Stuka)کانی خۆمان بۆردومان کراین.

دوای چەند ڕۆژێك دووبارە بە تاقمی تازە و تانکی تازەوە کە بە پەلە لە (خارکۆڤ)ەوە هێنرا بوون کەوتینەوە کار.

هەر دوای ئەمە بوو، بۆ ترسی خۆم، زانیم کە چۆن جەنگ مێشك ژەهراویی دەکات.

من هەمیشە ڕقم لە جەنگ بووەو، ئێستاش هەر ڕقم لێیەتی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش شتێکم کرد کە نەدەبوایە بیکەم، شتێك کە ڕقم لێی دەبۆوەو نەفرەتم لێی دەکرد، شتێك کە پەشیمانم لە کردنی و تا ئێستاش تێناگەم چۆن کردم.

لەناو پریسکۆپەکەمدا پیادەیەکی ڕووسم دیت کە لە پەناگەکەیەوە دەرچوو، بازیکی خێرای دا بۆ پەناگەیەکی تر. بەخێرایی نیشانەم لێ گرت و دەستڕێژێکی کورتم بەڕەشاشەکەم لێ کرد. گوللەکان لە دەوروبەریدا بەر زەوی کەوتن. بەڵام ئەو نەپێکرا. کاتێك تانکەکانمان لێی نزیکتر بوونەوە، بەخێرایی لەم پەناگەی دووەمەوە دەرپەڕی و وەکو کەروێشك بۆ ئەوەی تریان چوو، دیسان گوللەمان بە دەوریدا پژاند. پلۆتۆش دەستی بە تەقەکرد لێی، بەڵام هیچییەکمان نەمان پێکا. پۆرتا بەدەنگی بەرزەوە پێکەنی و ستالینی بەرزکردەوە، بۆ ئەوەی لە درزی چاودێرییەوە دەرەوە ببینێ. بەستالینی گوت :

– تەماشایێکی کاری تەقەکردنەکەمان بکە.

ڕووسەکە وا دیار بوو لە ترساندا شێت ببوو، چونکە لە شێوەی بازنەدا دەسووڕایەوە. دیسان ڕەشاشەکەمان تەقەی لێکرد، بەڵام بۆ سەرسامیی ئێمە، هەر نەمانتوانی بیپێکین. پیرەئان و ستیگیش ئەوەندەی پۆرتا پێکەنین، ئنجا ستیگ بەتەوسەوە گوتی :

– خوای بەڕەحم، تۆ ناتوانی تەنانەت کۆڵەگەکە بەئاسۆیی ڕاکشێنی ؟

جوێنم بە خۆم داو، کە کابرا خۆی هەڵدایە ناو پەناگەیەکی ترەوە، ڕووی گڕهاوێژەکەم تێکردو لێشاوێك گڕم نارد کە بەسەر زەویدا هاڕەی دەهات. پاشان ڕووم لە پیرەئان کردو گوتم :

– دوای ئەوە هەڵناستێتەوە.

پیرەئان گوتی، تۆ بڵێی ؟ لە پریسکوپەکەتدا تەماشایێکی بکە !.

زۆر بە زەحمەت باوەڕم بە چاوەکانم کرد، کابرا لەوێ بوو بەهۆی تەنیی گڕ هاوێژەکەوە ڕەش داگەڕابوو، غاری دەداو یەکسەر لە خانووێکدا بزر بوو، هاوارێکی گەورەی پێکەنین لە چوارەکەی ترەوە هات.

ئێستا کوشتنی ئەم پیاوە بۆ من بووە بەخاڵی شانازیکردن بۆیە خانووەکەم دایە بەر ئاگر تا گڕی تێبەربوو.
خاڵی شانازیکردن، چۆن دەبێ ؟ چۆن دەبێ پیاوێك بکوژم هەر بۆ خاتری شانازی پێکردنی خۆم ؟
بەڵام ئەوە، ئەو شتە بوو کە من کردم و، لێی پەشیمانم. جەنگ بە کوشتن و هەراوهۆریاو گڕو بەوێرانیی بەردەوامییەوە بەدرێژییەوە منی ژەهراویی کرد.

تەنانەت توندڕەوترین نازیی ئێستاکە دان بەوەدا دەنێت کە ئەڵمانەکان هێرشە گەورەکەیان دۆڕاند، بۆیە خەریکی خۆ ئامادەکردنێن بۆ کشانەوە لە ناوچەیەکی بەر فراوان. دوایین تەقەلای لە ڕادەبەدەری مرۆڤ کرا بۆ دەستگیرکردنی سەرکەوتن بۆ هێزەکانی ئەڵمان. سرییەکەمان تا بریوتسکا گەیشت، کە لەوێدا غافلگیرانە تووشی یەکەیەکی تەواویی سوارە بووین لە خانووی سەربازاندا. لەمەوداو ماوەیەکی کورتدا ئەوان و ئەسپەکانیانمان کردن بە کۆمەڵێك پیاوی ترساوو ئاژەڵی لووشکە هاوێژ، ئنجا دەستمان بەکشانەوە کرد، چونکە هێزێکی گەورەی T٣٤ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەمان نێررابوو.
لە هەموو شوێنێکدا شەڕی قوڕس و زیانی قورس هەبوو.

یەك فەوج کە لەلایەن ئێمەوە ئابلۆقە درابوو تووشی ڕەشە کوژیی بوو، بەڵام، وەکو فەوجی نارنجۆك هاوێژی ١٠٤ی ئێمە، نەیتوانی خۆی بەدەستەوە بدات. تانکەکانی خۆمانمان بردە ناو سەنگەرو بۆ ماوەی سێ سەعات بۆردومانمان کردن. کە تێك شکان، دیمەنێکی خەیاڵیی بوو، لەهەموو شوێنێکدا لۆری تێکشکاو، چەك و سەربازی شێوێنراو بەشێوەیەکی خەیاڵیی، هەموویان سەربازی ژن بوون، زۆریشیان گەنج و جوان، بە ددانی سپی و

نینۆکی وارنیش کراو. ئەم کارەساتە لە شوێنێکدا بوو کە دەوری میلێك لە ڕۆژهەڵاتی گوندی لیقنی دوور بوو.

دەم و چاوی پیرەئان سپی هەڵگەڕابوو: "با بەڵێن بە یەك و دوو بدەین کە ئەوانەی یان هەر یەکێك لە ئێمە کە بەزیندوویی لەمە ڕادەکات، کتێبێك لە بارەی ئەو تێکدانە بۆگەنە بنووسێت کە ئێمە دەستمان تیایدا هەبوو. دەبێ ئەو کتێبە جۆرێك بێ کە حوکمی پێ لەسەر تەواویی دەستەی پیسی سوپا بدرێ، جا گرنگ نییە ئەڵمان بن، ڕووس بن، ئەمریکی بن، هەر کەسانێکی تر، بۆ ئەوەی خەڵك بزانن ئەم شەڕە شمشێرە گەمژانەیە چەند بێ مێشکیی و بۆگەنە.

فەرمانەکان وا بوون لەکاتی کشانەوەدا، هەر چییەك هەیە دەبێ تێك بدرێت. ئەنجامی ئەم کارەش لە وەسفکردن بەدەر بوو. پردو گوندو ڕێگاوبان و هێڵی شەمەندەفەر هەمووی تەقێنرانەوە. کەرەستەی هەمە جۆری خۆراك کە نەمانتوانی لەگەڵ خۆماندا بیبەین لە پترۆڵ یان لە قیر، یان لە پاشماوەی ئاودەست هەڵێنران. کێڵگە یان و بەرین و شکۆدارەکانی گوڵە بەڕۆژە سوتێنران، یان بەهۆی تراکتەرەوە پان کرانەوە. بەرازو هەموو ئاژەڵەکانی تر کوژران و ڕاکێشرانە بەر خۆر بۆ ئەوەی لە ماوەی چەند سەعاتێکدا تێك بچن و بۆگەن ببن.

تەڵەکوژە لە هەموو شوێنێکدا هەبوون، بۆ ئەوەی، بۆ نموونە هەر کۆلێتێك ئەگەر دەرگاکەی بکرێتەوە یەکسەر بتەقێتەوە. وێرانیی لە هەموو شوێنێکدا دەبینرا، دیمەنێکی ناشرینی مردن بوو.

وەك عادەتیی، لیوای (٢٧)ەمی تانك لە ماوەی چەند حەفتەیەكدا بەرەو ئەمان دەچوو، چونكە، بێگومان ئێمە پاشەی سوپا بووین و شەڕێكی ڕووبەڕوومان لەگەڵ گرنگترین هێزی تانكی ڕووسەكاندا دەكرد. ئێستاش هەر چۆنێك بێت، هیچ جێگرەوەیەكمان بۆ ڕەوانە نەكراوە.
مانی فەوجەكەمان مەسەلەی چەند حەفتەیەك بوو، لەوانەشە هی چەند ڕۆژێك.

كاتێك لە ڕێگایەكدا لە پشت یەكە خێرا پاشەكشە كردووەكانی ئەڵمانیادا بەرەو پێش دەچووین، هەندێ جار لەبەر ستوونی چڕی سوارە و پیادە و تۆپخانە و تانكە ڕاكردووەكان كارێكی دژوار بوو. كاروانی بێ دوایی لۆری و تانك و تۆپ و ئەسپ و مرۆڤ نائومێدانە بەسەر ڕێگا زیخاوییەكاندا ڕەنجیان دەدا، كە لەوێدا تۆز و گەرمیی، ژیانیان كردبووە خەونێكی تا لێهێنەر. لە گێڵگەكانی هەردوو لای ڕێگەكەدا چڕیی یەكسان و ڕیزی درێژی یەكسان لە خەڵك و ئاژەڵ هەبوون، بەڵام ئەوانە خەڵكی مەدەنی بوون سوودیان لە سەیرترین عارەبانەی چەرخدار وەردەگرت كە دەبوایە پیرە ئەسپێك یا گایێك، یا هەردووكیان، یا سەگێك یا كەرێك، یا كەسێكی پێوە لغاو بكرێ. یان هەندێكیان بە شەكەتیی ڕێیان گرتبووە بەر، هەرچی هەیان بوو بە كۆڵیانەوەبوو، هەموویان مێشكیان پڕ بوو، بەڵام بەیەك بیرۆكە : دەرباز بوون.

سەیر لەوەدا بوو كە تەنانەت سێبەری فڕۆكەیەكی ڕووسیمان نەدیت، ئەگەر وا نەبوایە لەوانە بوو ئەم جەنگە ساڵێك بەر لەكاتی خۆی تەواو ببوایە. كاتێكیش یەك لە خودڕەوەكانمان بشكابایە، جا ئۆتۆمبێلێكی بچووك یان تانكێك بوایە، ئەوا كات نەبوو بۆ چاك كردنەوەی. تانكێك دەیخستە ناو كەندێكەوە كە نەدەبوایە ڕێ لە هاتووچۆ بگرێت. ژمارەیەكی زۆر لە سەربازی

ماندوو خۆیان خزاندبووە ناو کەندەکەوە، لەوێوە داوای ئەوەیان لێمان دەکرد کە هەڵیان بگرین، بەڵام هەڵگرتن ڕێگای پێنەدەدرا. گوێلێبوونی پاڕانەوەیان بێ ئەوەی بتوانی دەنگی زەمیریان بمرێنی بەلایەنی کەمەوە بەبردنی یەکێکیان لەگەڵ خۆماندا، شتێکی جەرگ بڕ بوو. کەس نەدەوەستا بۆ ئەوەی کەسێك هەڵبگرێ. تانك بەدوای تانکەوە لە پێشیاندا بە گرمە گرمەوە ڕەت دەبوون، دووکەڵ و تۆزی هەورئاسایان بەناو گێڵگەکاندا لوولی دەخوارد. پەنابەرانیش بە سەدانیان دەکەوتن و وەك مردوو لەبەر ئەو گەرمییە سووتێنەرە درێژ دەبوون. کەسیش بۆیان هەراسان نەدەبوو. لەبنی تانکەکەوە لە شوێنی لێخوڕینەوە پۆرتا نەڕاندی :

- کوڕینە، ئەمە شتێکە وەك کشانەوە وایە. خراپترە لەو کاتەی کە لە فرۆگلانت دەجەنگین، کە لەوێ هەموو فەرەنسی و بەریتانییەکان لەبەرمان ڕایان دەکرد. لەوان ڕۆژانەدا دووچەرخە زبڵ هەڵگرەکانمان ئەوەندە خێرا نەبوون، بەڵام ئێستاکە ئێمە کاری باشتر پێشکەش دەکەین. من دەستی خۆم دەبڕم ئەگەر گۆبلز شتێك لە بارەی ئەم پێشبڕکێ بچکۆڵە شکۆدارەدا بڵێ، ئەگەر کار وا بڕوا ئەوا من بۆ جەژنی لەدایکبوونم لە بەرلین دەبم. ستالین، پشیلە پیرەکە، تۆش لەجیاتی ئەم شڕە بەدلەیە کە بە زۆر لەبەرت کراوە، دەستە جلێکی جوانی مەدەنیت دەبێ و چڕنوکێکی باشیشت لە سمتی ئەدۆلفەوە پێ دەدرێت، ئێوەش هەمووتان بانگهێشت کراون و شۆربای پەتاتە و پارچە گۆشتی بەرازمان هەیە و پاشانیش کێکی پەتاتە و شەکر و مرەبا و هەموو ئەو شتانەی کە دەتوانی قوتیان بدەیت. ئنجا ئەو کەرە بێ قاچەش، ئەسمۆس، لە نەخۆشخانەوە خۆی و قاچە تەختەیی و زۆنگاوە تایبەتەکەی دەهێنین.

شووشەکەی بەناوماندا سووڕاندو داوای لێکردین بەبۆنەی ئەو شکستە خۆشەی کە تووشی هێزە چەکدارەکانی پرووسی نازیی بووە بخوێنەوە.

لە ڕۆژهەڵاتی (خارکۆڤ)دا خراینە ناو شەڕێکی قورسەوە بۆ پاراستنی پاشەی هێزەکانمان کە تیایدا تانکەکانمان گلان، هەر بۆیەش بووینە پیادە.

پۆرتا و من هەر بۆ خۆمان بووین، چارەکە میلێك دوور لە پیرەئان و ئەوانی ترەوە، ڕەشاشێکی قورسمان لە ئەستۆ بوو، کە ئێمە لەوێدا خۆمان حەشار دابوو، ڕەشاشەکەشمان پرووسە بەرەو پێش هاتووەکانی دەکوتا، تارماییەك ملی ڕێی گرتبووە بەرو ئەگەر پۆرتا قاچێکی نەگرتایە بەرەو لای پرووسەکان دەپەڕییەوە.

ئەو تارماییە قەشەکە بوو - ئەو قەشەی کە ئەو نوێژە پڕ سۆزو خۆشەویستییەی پێش دەست پێکردنی کشانەوەکە کرد. پۆرتا بە لاق کراوەیی لە بەری دانیشت و تا خوا حەز دەکا مستێکی خێوانده بناگوێی.

- بۆ کوێ هەڵدێی، هەی قەلەڕەشی نەفرەت لێکراو ؟

قەشە بەهەنسکەوە گوتی: "ئێمە جەنگمان دۆڕاند، وا باشە خۆویستانە خۆمان بەدەستەوە بدەین، بەتەئکید ئەو کاتە هیچمان لێ ناکەن".

- من بەچاکیی تۆ بەدەستەوە دەدەم، تۆ هەی ئاژەڵە یەسوعییە پیسەکە ! وتارە کورتە پۆشتەکەی خۆتت لەبیر چوو، کاتێ تۆ پێت گوتین کە جانەوەرە سوورە زۆنگاونشینەکان بکوژین ؟ ئێستاش تۆ دەبێ یان کار بەم ڕەشاشە بکەی یان سندووقێکی تەقەمەنیت بەنێو چاواندا دەکێشم، هەتا ئەگەر لەبەر بۆگەنی بشمرین ! ئێستا تۆ دەبێ چێژی ئەو کوشتنە بکەی کە بەگەرمییەوە بۆ ئێمەت دەخواست، تۆ هەی ترسنۆکی ... !

پۆرتا مستێکی بەنێو چاوانیدا کێشا، ئنجا خوودە پۆلایەکەی خێواندیٚ، بۆیە وەکو پەڕۆی تەڕ خۆی وێك هێنایەوە.

قەشەکە بەشێوەیەکی هستیری هاواری کرد :

– ئەمە – قڕ کردنە. من پێم وایە ئێوە ئەگەر هەر ئێستا .... دەبیٚ دادگایی سەربازیی بکرێن.

کۆڵە مشتێکم بەدەم و چاویدا کێشاو لوولەی دەمانچەکەشم لە کرۆسە بەزێڕ نەخشاوەکەی سەر گیرفانی سنگی گیرکردو تێم خوڕی :

– یان دەبیٚ لە ماوەی سیٚ چرکەدا لەو لای ڕەشاشەکەوە بی و تەقەمەنیمان بدەیتە دەست یان دەتکوژین.

بەدەم هەنسکی ترس و تووڕەیی ئەم سووکایەتی پێکردنەوە بەرەو ئەو شوێنە خشی کە بۆمان دەست نیشان کردبوو. هیچ جۆرە بەزەییەکمان پیشانیی نەدا، بەڵکو دەرچەیەکمان بۆ هەموو تینوویەتییە کپ کراوەکانمان بۆ تۆڵەسەندنەوە ڕەخساند. هەر جارێك لەپی دەهێناو دەبرد بەتوندی بە دەمانچەکانمان لە پەنجەکانیمان دەدا.

– ئەمەیان بۆ خاتری هانز پیر !.

– ئەمەشیان لەبەر خاتری ئەسمۆسە !.

– ئەمەو – ئەمەو – ئەمەش یەکێکی تر بۆ – ئۆرسولا.

یەکێکی تریش چونکە من لە ماوەی یەك سەعاتدا دەرزەنێك پیاوم بەتفەنگە قەناسەکەم کوشت، ئەو کاتەی کە لەبەر کەسەری مردنی ئۆرسۆلا هۆشم لەخۆم نەبوو!.

یەکێکی تریش چونکە من ئەو ڕۆژە شەیتانە هەژارەکەم کوشت کە بەرکەوتنی زۆر زەحمەت بوو.

چاوەکانم ڕەشکەو پێشکەیان دەکرد، سوور بوون، ڕێگەمان بە پۆرتا دا ئەویش کارەکەی بکا، حیسابێکی درێژی لەگەڵدا هەبوو بۆ یەکلاکردنەوە.
- هەی بەرازەکە، ئێستا کە تۆ لەبەر دەست مرۆڤان دای و، ڕێت پێنادەین بڕۆیت.

کە لەگەڵیدا لێبووینەوە، ناچارمان کرد بۆ لای ڕووسەکان بپەڕێتەوە و کە دوو سێیەکی ڕێگاکەی بڕی هەردوو لاقەکانیمان پێکا. سێ مەنگۆڵی خشین بۆ ڕزگارکردنی. تەقەمان ڕاگرت تا هەڵیانگرتەوە.

پۆرتا بەدەم ئارەق سڕینەوەی دەم و چاوییەوە گوتی: "من هیچ لە بارەتەوە نازانم، بەڵام هەست بەپیاوێکی تازەو باشتر دەکەم".
کە گەڕاینەوە بۆ سرییەکەمان، لە ڕاپۆرتە نیزامییەکەدا ئەوەمان پیشان دا کە قەشە ((ڤۆن ویلناو)ی سەر بە فیرقەی دوازدەمی پانزەر بۆ لای دوژمن فیلاری کردو، ئێمەش لەکاتی فیلارکردنەکەی تەقەمان لێکردو بریندارمان کرد. لەبەرئەوە تەنانەت ئەگەر بۆی بڕەخسێ لە ڕووسەکان ڕابکات، ئەوا ئەڵمانەکان بەتاوانی فیلارکردن تیربارانی دەکەن.
پلۆتۆ پرسی: "ئەوانەی ڕزگاریان کرد، ڕووس بوون یان ئاسیایی" ؟. - ئاسیایی
- بۆیە نیعمەتێکی باش و پوختەی پێ دەبەخشرێ.

ڕەزامەندییێکی گشتی هەبوو لەوەی کە قەشە کەوتە چنگ جەنگاوەرانێک لە بەربەریترین بەشەکانی یەکیەتی سۆڤییەتەوە. خۆ ئەوانە هەموو ڕۆژێک قەشەیەکی نازییان ناکەوێتە دەست بۆ ئەوەی یاری لەگەڵدا بکەن.

من پێم خۆشە مرۆڤدۆست بم، پێم خۆشە بتوانم بڵێم هیچ ئارەزوویێکی خوێنڕشتنم نییە. بەڵام هەتا بەئەمڕۆش ڕادەگا من کە بیر لەوانە دەکەمەوە کە ئاگری جەنگ خۆش دەکەن چاوم سوور دەبن، جا چ جایی چاوم پێیان بکەوێ، هەموو ئەو گەمژانەی کە ڕاستەوخۆ یا بەتێڕوانینێکی فێڵبازانە، دووسەرە ئارەزووی دووبەرەکی و جەنگ بەرپاکردن هاندەدەن. من ئەنجامی چالاکییە بەدناوەکانی ئەو پڕۆپاگەندەکارانە، ئەو دەنگوباس لێکدەرەوانە، ئەو دەمارگیرانە، ئەو خاوەن مێشکە کارساردانەم بەچاوی خۆم دیوە. ئەمانە جانەوەری ئازاردەرن و، لەبەرئەوە پێویستە بفەوتێنرێن. دەبێ ئەمانە لەکون و کاژێری خۆیاندا دەربهێنرێن و دووربخرێنەوە ! خۆ من دەزانم کە مامەڵە کردنمان لەگەڵ قەشەدا بەربەرییانە بوو، بەڵام نەمانتوانی پێچەوانەی ئەمە بکەین. من هیچ بەزەییم بەو کەسانە نایێتەوە کە جەنگ دەخوازن، ئەوانەی داوا لە ملیۆنەها خەڵکی ئاشتیخواز دەکەن کە هەستە مرۆڤایەتییەکانیان وەلاوە بنێن. ئەمانە ترسناکن و، دەزانم کە دەبێ بەهەموو تواناوە بەرگری بکرێن. ئەوەش دەزانم کە، هەموو ئەڵمانییەك لە ناخی دڵەوە ئەوە دەکات. ئای، ئەگەر ئەڵمانییەکان تەنیا ئەم شتە بەچاکیی و بەڕاستیی بخەنە مێشکیان و ئەو ئازایەتییەشیان هەبێ کە بەپێی زانیارییەکانی خۆیان کار بکەن. نەفرەت کردنی یەککگرتووی ئەڵمان لە دژی جەنگ، یەکلاکردنەوەیەکی بێ بەزەییانەی حیسابات لەگەڵ گیانی عەسکەرتاریی و پیاوانی دا – دەبێتە هۆی ئەوەی شتەکان لە شوێنی خۆیاندا دابنێ.

بەر لەوەی بەیەکجاریی (خارکۆڤ) بەجێ بهێڵین ئەندازیارەکان بەتەواویی شارەکەیان تێکدا. (خارکۆڤ) شارێکی گەورە بوو، ڕووبەرەکەی ئەوەندەی ڕووبەری (کۆبنهاگن) دەبوو، لە دەسپێکی جەنگیشدا هەشت سەدو پەنجا هەزار سەرنشینی هەبوو.

(خارکۆڤ) یەکێك بوو لە خۆشترین شارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت و، هەمان ناوبانگی (مۆسکۆ) و (ئۆدێسا)ی هەبوو. لە دانیشتوانەکەی نزیکەی سێ سەد هەزاریان لێ کوژرا. هەروەك چۆن لە یەکێك لە فەرمانە ڕۆژانەییەکاندا جەنەڕاڵ زیتزلەر شانازانە ئاشکرای کرد کە هەموو شتێکیان کاول کرد بوو (Restlos Vernichtet).

– دەکرێ بەزەییم بە قەشەیەکی وا بێتەوە ؟

من تەنیا ئەوەم پێناکرێ.

- ئـەی ابـیرای خۆشەویـستم، مـن زۆر چـاک دەیـزانم. بـارینگ، کـە دەسـتەکانی خستنەسەر شانی پیرەئانـەوە، بەنیگەرانییـەوە سـەری ڕاوەشـاند "تـەواویی شـتەکە موستەحیلە. ئەمە هیچی تر بەجەنگ دانانرێت، بەڵکو خۆکوژییێکی ئاشـکراو سـادەیە. ئێمە ئەم جەنگە بەیارمـەتی منـداڵ و تەمـەن گەورەکانـەوە دەکـەین، بـەڵام دەبـێ ئەوەش بزانیت کە ئاسان نییە بۆ ئەو شەیتانە هەژارانە، بەم جۆرە بەبێ مەشقکردن ببردرێن بۆ ناو دۆزەخی ئاگر. بۆیە پێم خۆشە داوات لێبکەم کـە نـەختێک لەگەڵیانـدا چاک بیت. گریمان باوکت یان برایەکی بچووکتن، ئەو کاتە دەبێ کەمێک ئاگاداریت لێیان هەبێت. هەروا گومانم لەوەدا نییە کـە، یـەک دووانێکتـان کـە پـازدە، شـازدە ساڵان بوون بەدەنگ گریاون. ئەگەر پێتان خۆشە شتێک بۆ من بکەن ئەوا لەگەڵیانـدا باش بن، تا دەکرێ لەم بارودۆخە ناهەموارەدا یارمەتییان بـدەن بـۆ ئـەوەی لەسـەر پێیان بوەستن. من پێم وا نییە دەبێ شتەکان بۆ ئەوان خراپتر بکەین، کەسیان شایانی ئەوە نین. چونکە ئەگەر کەسانێک هەبن بەبێ سووچ بن ئەوا ئەم کوڕانەن، بەلایەنی کەمەوە شتێکی بەڵگە نەویست هەیە، ئەویش ئەو سەربازە تازانەن کە تازە بۆمانیان ناردوون، وادیارە بەم زووانە ئەوان لە کڕاندنەوەی بنـی بەرمیلەکـە دەبنـەوەو ئنجـا بەم چەشنە دەتوانین بیسەلمێنین کە جەنگ دەوەستێت".

پۆرتا بەپێکەنینەوە گوتی: " ئۆی، نا، هاوپتمان، ئنجا ئەوان هەموو کچەکان بـۆ ئێمە دەنێرن. ناکرێ ئێستا ئێمە ناوەکانمان بنووسین بۆ پێکهاتەیەکی باشی زیادەکانی فلیمێک ؟ من بەشادییەوە مەشق بەدەستەیێک لەمانە دەکەم، من چەند ڕاهێنـانێکی ورووژێنەرم هەیە لە بری لەسەر زگ خشین ... ،

**ڤۆن بارینگ بە زەردەخەنـەوە قـسەکەی پـیٚ بـڕی "مـن بەتەئکیـد دەتکەمـە بەرپرسی دەستەی فلیمەکە ئەگەر کار بکاتە ئـەم ڕادەیـە. لـە میانـەی ئـەو کاتـەدا چاکەییێکم لەگەڵدا بکەو، ئەوەی ئێستا گوتم بەبیرت بێتەوە، ئەمەش لەوەی کە تۆ لە بیرت ناچێت کاری پیٚ بکەیت ؟ "**

## شەمەندەفەرە زرێپۆشەکە

دوای هەرەس هێنانی (خارکۆڤ)، لیوای (٢٧) مم، کشایەوەو ڕەوانەی (دنیپرۆپیتروفسک) کرا، کە لەوێدا شەمەندەفەری زرێپۆشی لایپزگ بۆ ئێمە تەرخان کرا. هەر کە بار کراین، لەگەڵ شەمەندەفەرێکی تری زرێپۆش چووینە (کارۆل)، ١٠٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای (پۆلتاڤا)، لەوێ هەندێك ڕاهێنانمان لەسەر تەقەکردن کرد بۆ ئەوەی شارەزای تۆپە تازەکانمان بین. ئێمە هەر پێنجمان فارگۆنێکمان بۆ تەرخان کرا : پیرەئان بووە فەرماندەی فارگۆنەکە، پۆرتا بووە بەرپرسی هەر هەشت ڕەشاش و سێ تۆپی ئۆتۆماتیك، ستیگیش بووە بەرپرسی بورجی ژمارە ١ و ١ لە ژمارە بورجی ٢ خۆی و تۆپە لوولە درێژەکەی، کە ستیگ خۆشی یەکێکی هەبوو. پلۆتۆ بەرپرسی بێتەل و گەیاندنەکان بوو. بۆ تاقمی فارگۆنەکەش بیست و پێنج سەربازی تازەیان پێدابین کە تەنها چوار حەفتە مەشقیان کردبوو. بچووکترینیان تەمەنی شازدە ساڵان و گەورەترینیشیان شەست و دوو ساڵیی بوو. ئەوان دیمەنێکی خەفەتباریان هەبوو.

بەرەو بەرەکانی جەنگ ملمان نا بێ ئەوەی بەتەواویی بزانین بۆ کوێ دەچین. لە دواییدا دەرکەوت کە (لۆو) بوو، کە لەوێدا گوندێکمان کاول کردو بەهۆی چەکە ئۆتۆماتیکەکانمان تۆپخانەی ڕووسەکانمان خەریك کرد. پاش ئەمە بەرەو خوارووی ڕۆژئاوا ملی ڕێمان گرت. شەوو ڕۆژ بەسەدان کیلۆمەتر هێڵی ئاسنمان دەبڕی و، تەنیا بۆ وەرگرتنی ئاو یان ڕۆن، یان بۆ چاوەڕێ کردن لەسەر هێڵێکی لاوەکی دەوەستاین تا ڕێگە بەتێپەربوونی شەمەندەفەرێك

بدەین کە بەپێچەوانەی ڕۆیشتنی ئێمە دێت، ئێمە دەمانتوانی لێڕابکشێین و لەناو فارگۆنەکەماندا بخەوین و کاتێکی خۆشیش بەسەرببەین. جەنگ وەك وای بۆ دەچووین، لە ڕاستیدا ئەوەندە بەد نەبوو، ئەگەر پیاو تەنیا بتوانێ ناو بەناو بخەوێ. ئەوەی ئێمە تووشی ببووین کەمیی نووستن بوو، کە بارتەقامان نەدەکردو دەمارەکانمان هەمیشە گرژ بوون.

لە کریمانشوگ کاتێك بەدەوری ناوچەی وێستگەدا دەسووڕاینەوە لە پڕ ژنێك هاواری کرد :

– سڤن ! سڤن ! .

بەسەرسامییەوە سووڕاینەوە. شەمەندەفەرێکی بەتاڵی نەخۆشخانە لەوێدا وەستا بوو، لەناو یەکێك لەدەرگاکانی پەرستارێك وەستا بوو بەدەست سڵاوی لە من دەکرد :

– سڤن، وەرە بۆ ئێرەو پێمان بڵێ حاڵ و هەواڵت چۆنە ! .

ئەمە ئاستا بوو. دەستی کردە ملم و تێرماچی کردم. من زۆر بەزەحمەت بەو بەدلەیە ناسیمەوە، هەروەها چونکە لەو ڕۆژانەی کە لە گوتنبرگ دەمناسی ئەو کات نەختێك کەنارگیر و کەمێك هێسك قورس بوو، بەڵام لەگەڵ هەندێشدا قەشەنگ بوو. من وام دەهاتە پێش چاو کە جەنگ ئەو کچەی چالاك کردووە. هیچ دوو دڵییەك لە چاوەکانی یان لە جووڵەکانیدا نەبوو. منی کێشایە ناو شەمەندەفەرەکەیەوە، لە کاتێکدا دووان لە پەرستارەکانی تر دەستی پۆرتا و پیرەئانیان گرتبوو.

ئاستا مێردی کردبوو تەڵاقیش درابوو لە پیاوێك کە بە بیست و دوو ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. پاشان خۆی و دەستە خوشکێکی خۆیان بەخاچی سووری ئەڵمانی بەخشیبوو، ئنجا و ئنجا. خودایە، چەند ئارەزووی سێکسم هەبوو، ئەویش چەند ئەو ئارەزووەی هەبوو. چاومان لە یەکتری بڕی، بەڵام

ویستی خۆمانمان نەدرکاند، پاشان پەرستارێکی تر هاتوو شتێکی بەگوێچکەکانی ئاستادا چرپاند :

ئاستا گوتی: " وەرە، ئنجا ڕاست بردمیە ناو فارگۆنێکی ترەوەو پاڵێکی پێوەنام بۆ ناو نوینێکی نزمەوەو پاشان پەردەکانی ڕاکێشان و بەجووڵەیەکی خێرای زانایانەوە خۆی ڕووت کردەوە، هیچ شتێك نەبوو قسەی لێوە بکەین، ئێمە هەردووکمان بە یەکسانیی زۆر ئارەزوومان لێ بوو. شتێکی باش و خۆش بوو کە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کچێکی خاوێن، پاك شۆراوی تێروپڕت پێ بدرێت کە دەیزانی لەم لاو لەولادا چی هەیە و کە یەك چارەکە سەعات کاتێکی زۆرە، ئەگەر لە باسکردنی کەش و هەواو یا لە بیرکردنەوە لەو شتانەی کە نەوێری باسیان بکەی بەفیڕۆی نەدەی. ئەوەندە برسی بووین بۆی، ئەوەندە ئارەزوومەندو پێکەوە گونجاو بووین کە دووجار ئەنجاممان دا، لەبەر هۆیەکی سادە بۆ بیرکردنەوە نەوەستاین، بەڵکو بەبێ دوو دڵییەوە کارەکەمان کرد، بەمەش ملمان بۆ هاندەری کەڵەکە بووی چەندین مانگ شۆڕکرد. سەیرە ئەو ژیانە، ڕووت و بێ شەرمانە، هەرواش دەبێ بڕیاری خۆ لەکەمین گرتن بدا بۆ سێ سەربازی پیس و وەبیرهێنانەوەیەکیان پێ بدا لە بارەی هەبوونیەوە، هەبوونێکی زۆر نزیك، لە ویستگەیەکی شەمەندەفەردا، تەنانەت کۆنە ویستگەیەکی کۆن، کە ئەوە دەسەلمێنێ کە مرۆڤ هەمیشە تووشی دەبێ بەتووشی شتی چاك و، کاتێکیش کە دەیکەیت چارەکە سەعاتێك کاتێکی زیاترە لە پێویست، ئەگەر بتەوێ ببێت.

من تا ئێستا دێتە بەرچاوم و زەردەخەنەشم بەدیمەنی نابوت و سەیری خۆمان دێت، سێ سەربازی پیس کە نەك ناشانازانە لنگە لۆقێمان بوو بۆ دواوە

بەرەو شەمەندەفەرە زرپیپۆشەکەمان. لاسارانە پشتمان لەو شەمەندەفەرە نەخۆشخانەیە کردبوو کە لەسەر دەرچوون بوو. ئاوڕمان لە دواوە نەدایەوە، بەلاّم من هەمیشە هزر لەیەك پەنجەرەی فارگۆنێك دەکەمەوە کە پڕ بوو لە کچی سەرو سیما ناسك و گۆڕاو. ئەوانە سێ پەرستار نەبوون، بەڵکو ژنانی شەمەندەفەرێکی نەخۆشخانە بوون، کە دیاری خۆیانیان بە سێ پیاو بەخشی و ئەوانیش دەستکەوتێکی باشیان دەسکەوت. شتەکە زۆر بەنەرمیی ڕوویدا و زۆریش تەواو بوو.

بەچاوی بەخەندەوە سواری شەمەندەفەرەکەمان بووین.

باش بوو ؟

لە ڕاستیدا ئا.

هەتا پۆرتاش بێدەنگ بوو، کە ئەمەش ئەوە دەردەخات تەنانەت شتی پتر لە داوێن پیسییەتیی لە دنیادا هەیە.

پیرەئان لەبەرخۆیەوە دەستی بە منە من کردن کرد، پۆرتاش نایەکەی دەرهێنا.

ئنجا ئێمەش دامانە قاقای پێکەنین و وامان کرد ئەوانی تر واقیان وڕبمێنێ.

پیرەئان گوتی: " کچە بەستەزمانەکان، کۆمەڵە ئەسپێیەکی وا گەورەیان تووش بوو".

ئا بەم جۆرە ئێمە ئەو پارچەیەمان ژەنی کە لە بارەی ئەو پاشایەیە کە تووشی کێچ ببوو.

ئەمەیان موعجیزەیەکی شیعریی بوو، ئەوەندە سروشتی و سەرسوڕمێن وەك ئەوەی لە کاتێکدا لەڕۆژێکی هاویندا لەناو گیاوگۆلدا پاڵ کەوتبی و، لەناکاو ئەوەت بۆ دەرکەوێ کە بێچووە کەروێشکێك ئەوا پەنجەکانت بۆن دەکا.

لـه مـاوەی بیـست و چـوار سـەعاتی دواتـردا شـەمەندەفەڕە زرێپۆشـەکە بەرەو ناوچەکانی جەنگ هەڵکشا. لە باخۆرات لە نزیك یەکێك لە لقەکانی دۆنیتز ئەرکەکانیان پێ ڕاگەیاندین. دەبوایە پشتگیری لـە پـەلامارێك بکـەین و ئنجا تا دەمانتوانی بەدرێژایی هێلی لۆگانـسك – خـارکۆڤ بچینە خوارەوە و هەرچەند تێکدانمان لە پاشەی دوژمندا پێدەکرێ، بیکەین. دوای ئەمە دەبوایە پاشەکشە بکـەین و پـردو هێڵـی ئاسـنین لـە پـاش خۆمانـدا تێـك بـدەین – ئەگـەر هـات و شـەمەندەفەڕەکەشمان لـەکار خـرا، ئـەوا دەبوایـە بیتەقێنینـەوەو، هـەموو دەربازبووەکانیش دەبوایە هەوڵ بدەن و بگەنە هێڵەکانی خۆمان.

دەنگی ئۆبەرست لیفتنانت هنکا بەناو ڕادیۆ – تەلەفۆندا بۆ هـەموو فارگۆنـەکان دوا :

- خۆتان ئامادەکەن. دەست و برد کەن بۆ کارکردن.

پۆشـاکی تۆپـەکان لادران، گوللـە تۆپـەکانیش ئامـادەکران و هـەر پیاوێکیش لـە جێی خۆیدا وەستا. وردە وردە شـەمەندەفەڕەکە خێرایی خۆی زێدەکرد تا وای لێ هات بەملاو بەولادا بچێ، پێچکەکان ونـەیان لێـوە دەهـات و ناو بەناویش لە پێچی تیژدا زریکەو هۆڕیان لێ هەڵدەستا. پاشان بڵندگۆیـەکان فەرمانەکەیان پەخشکرد :

– شەمەندەفەڕ ! ئامادەی کارکردن بە ! .

قۆنـداغی تۆپـە گـەورەکان کرانـەوەو، گوللـە تـۆپ و بارگـەکانیان تـێ ئاخنران. تەقە تـەق و زرنگانـەوەی ئاسن لەسـەر ئاسن دەهـات، پێچکەکان بۆ گۆڕینی شوێنی تۆپەکان سووڕانەوەو، ڕەشاشەکانیش وەکو پێویـست داگیران. لەهەمان کاتیشدا خوودە ئەسبستوسەکانی خۆمانمان ڕاکێشایە سـەر سـەرمان. بەناو پریسکۆپەکەمدا چاوم بڕییە دەشتودەر. لەپێشەوە لـە لایەکدا ڕووبارەکە

درێژ دەبووەوە، پان و لەڕەنگدا زەردێکی لێڵ، وەکو شریت بەناو لێژاییە ڕەنگ خاکییەکاندا پێچی دەخواردەوە. بەخێراییەکی باوەڕ پێنەکراوەوە بەناو گوندێکی چۆڵکراو خشین و، بەم جۆرە بەپردێکی گەورەی ئاسن پەڕینەوە. ڕووبارەکە دوور لەخوار ئێمەوە لە سەربانێکی گەورەی ئاسنی چەماوەی دەکرد.

ئێمە پتر لە پێنج کیلۆمەترێك لە پشت ڕووبارەکەوە بووین بەر لەوەی بەو دوژمنە بگەین کە لەناکاو دوو گوللە تۆپی تێگرتین. شەمەندەفەڕەکە دەستبەجێ خێرای کرد، بۆیە دەنگی چەرخە قورسەکانی بەتەواویی گرمەی تۆپەکانی خنکاند. ئنجا زەنگەکانی ئاگادارکردنەوە لە هەموو بورجەکانەوە لێدران و فەرمانی ئاگر باران درا.

فەرماندەی هەر فارگۆنێك مەبەست و ئامانجەکەی پێ ڕاگەیەنرا بوو ئەویش لەلایەن خۆیەوە فەرمانی بە فەرماندەی بورجەکانی خۆی دابوو. تۆپە قورسەکان دەمی ڕەشی لوولەکانیان بەرەو ڕووی ئەو دارستان و کێڵگانە سووڕاندەوە کە بەتیشکی خۆرەتاو خۆیان دەشوشت.

ئنجا فەرمانەکە درا ! ئاگر ! کە هەر سیی تۆپە قورسەکەی ئێمە دەستیان بەگۆرانی مردن کرد بۆ ئەو دیمەنە پڕ لە زەردەخەنە هاوینییە، گرمە و هۆڕێکی گوێکەڕکەری ترسناك دەستی پێکرد. ئەوەندەی پێنەچوو بەر لەوەی لە دووکەڵ و تۆز و وەربدرێین. هەر جارەی کە هەموو تۆپەکان پێکەوە بەهێرش بردییێکی گەورەوە دەتەقینەوە، شەمەندەفەڕەکە وا بەتوندیی دەهەژا وامان دەزانی بەلادا وەردەگەڕێ. ڕووسەکان دەستیان بەوەڵامدانەوە کردو، گوللە تۆپەکان بەر تەنیشتەکانی فارگۆنەکان دەکەوتن، بەڵام ئەوەندە بچووك بوون

هیچ زیانێکیان نەبوو. زۆری پێنەچوو، بەر لەوەی ئاگر بارانەکەی ئێمە بەهۆی تۆپە قورسە (٢٨سم)ەکانیان وەڵام بدرێتەوەو، هەندێ لە گوللە تۆپەکانیان کاریگەرییان هەبوو- وەکو هەورە تریشقە بەسەرماندا دەبارین. ئێمە هەر یەکسەر ئامانجی خۆمانمان گۆڕی و ڕووی ئاگرمان کردە تۆپخانەی ڕووسیی. لەناکاو شەمەندەفەرەکە وەستا. ئەوەندەی نەبرد دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە یەکێك لە فارگۆنەکانی پێشەوە یەکسەر پێکراوەو یەك لە گالیسکەکانی تێکشکاوە. هەندێ لە ئەندازیارەکانمان دزەیان کردو لەژێر پەردەی شەمەندەفەرەکەدا فارگۆنە زیان پێگەییوەکەیان وەلانا. فەرمان وابوو کە دووبارە بەزووترین کات بکەوینەوە ڕێ، چونکە شەمەندەفەرێکی زرێپۆشی وەستاو نێچیرێکی بێ دەسەڵاتە بەرامبەر تۆپخانەی دوژمن. بەر لەوەی بتوانن ئەو فارگۆنە لەسەر هێڵی ئاسن لابدەن، هەر چۆنێك بێ، ڕووسەکان توانیان فارگۆنێکی تر تێك بشکێنن و تاقمەکەشی بکوژن.

ئەم ئاگرە بەهێزەی تۆپخانە ئێمەی ناچار کرد کە بەرەو پردە ئاسنە گەورەکەی سەر ڕووبارەکە بکشێینەوە. کە ڕۆیشتین هێڵە ئاسنەکەی دوای خۆمانمان بەتەقاندنەوەیەکی گەورە تەقاندەوە. پاشان بنکەی فەرماندەییمان کە لەو بەری دووری ڕووبارەکەوە بوو فەرمانی وەستانی لە ڕۆژهەڵاتی پردەکەوە بە ماوەی یەك کیلۆمەتر بۆ ناردین لەگەڵ پاراستنی هێزی پیادە لە کاتێکدا لە پردەکە دەپەڕنەوە. کە لێی ڕەت دەبن ئێمەش خۆمانی لێ دەرباز دەکەین و ئنجا ئەندازیارەکان پردەکە دەتەقێننەوە. شەمەندەفەرێکی تری زرێپۆش بەناوی (بریسلاو) بۆ پشتگیری کردنمان ڕەوانەکراو، هەرکە سەنگەری لە تەنیشت پردەکەوە گرت (ئۆبەرست لیفتنانت هنکا) ویستی بەدرێژایی هێڵی ڕۆستۆڤ — ڤۆرۆنیش بەشەمەندەفەرەکەی ئێمە هێرش ببات و ئەوەی پێی دەکرێ

بیکات بۆ هەراسان کردنی دوژمن. هنکا پێی وابوو ئێمە دەبێ بگەینە ئەو شارە بچووکەی کە بیست کیلۆمەترێك لێرەوە دوورە و کە بنکەیێکی فەرماندەیی سەر بەفیرقەیێکی رووسیی لێ بوو. بریسلاو دەبوایە بەوەستاویی لەلای پردەکە بمێنێتەوە و لەوێوە دوژمن ئاگرباران بکا بەو هیوایەی کە هەست بەوە نەکەن لایپزگ لەپشتیانەوە خەریکی بەرەو پێش چوونە.

لەچەند کیلۆمەتری یەکەمدا بەخێراییەکی زۆرەوە ملی رێمان گرتەبەر بێ ئەوەی تەقەمان لێ بکرێ، بەڵام لە پاشان رووی تۆپە هەرە قورسەکانیان تێ کردین و لە ماوەی پازدە دەقیقەدا ژمارەیەك فارگۆنی ئێمە بەخراپیی پێکران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانای شەرکردنیان مابوو. ئنجا خودی مەکینەکەمان دوو زەبری بەرچاوی بەرکەوت و ناچاربووین پاشەکشە بکەین، لەسەرخۆ بەرەو دواوە بخشین بەو رێیەی کە پێیدا هاتبووین.

هەندێ تانکی گەورە بەرەو ئێمە هاتن و ئێمەش لوولە تۆپەکانمانمان نەوی کردنەوەو کەوتینە خەریك کردنیان. گوللە تۆپە (١٢سم)ەکانمان چەندین تانکیان پارچە پارچە کردو پارچە پۆڵایەکان وەکو تووکی بالیفی تەقیو بەهەوادا دەفرین.

گوللە تۆپ بەبەردەوامیی لە دەورویشتی مەکینەکەماندا دەکەوتن، کە هەڵمی لە ژمارەیەك کونی زۆرەوە لێ دەردەچوو، ئەنجامەکەشی ئەوەبوو خێراییەکەمان رووی لەکەم بوونەوەکرد، بەرەو پێشڤەچوونێکی لەسەرخۆی لەرزۆك. زیاتر شتێکی گوماناوی بوو کە ئایا شەمەندەفەری زرێپۆشی ((لایپزگ)) دەگەڕێتەوە.

من کە بیر لە هەموو ئەو کەل و پەلە گرانبەها خەیاڵاوییانە دەکەمەوە، هەم هی خۆمان و هەم هی دوژمنیش کە لە تێکدانیاندا بەشداریم کردووە، مێشکم لە ئاست نرخە تێچووەکانیاندا دەوەستێ. کە بیری لێ دەکەینەوە، دەبێ هەر بەتوندیی و بەقایمییەوە پێ بکەنی، ئەگەر نا دەبێ فرمێسك ببارێنی و گوللەیەك بەمێشکتەوە بنێی. تۆ بڵێی خەڵکیی هیچ تێنەگەن ؟ تۆش، ئەی ئەو کەسەی ئەم نووسینە دەخوێنیتەوە، مەگەر نازانی چ سامانێکی خەیاڵیی چاوەڕێت دەکا بۆ بەکاربردنی، نازانی ئەگەر سوپا بۆ سوودی خۆت بەکارببەی ئەوا سەروەت و سامان و باری ڕۆشنبیریت وەکو هی دەوڵەمەندەکانی ئەمڕۆیان لێ دێت ؟ توانای ئەوەت دەبێ بەچاکیی بژیت، بەچاکیی بخۆیت و هەر یەکێکیش ئۆتۆمبیلێکی هەبێت، یاهەر شتێکی مەبەستت بێ دەتبێ، توانای ئەوەشت دەبێ بەهەموو جیهاندا بگەڕێی، دەتوانی بچیتە دەرەوە و ڕاببوێری، توانای ئەوەت دەبێ کە بەبێ ترس و بێ دڵەڕاوکێماڵێك پێك بهێنی. ئەوەندە هەیە، زیاتر لەوەی کە بەشی هەمووان بکا.

کەس باوەڕ ناکا – یان، زیاتر بڵێین کەس ناوێرێ باوەڕی پێ بکا. ئەم بەڵایە چییە کە وای لە هەمووومان کردووە ئەوەندە سست و ترساو بین کە نەتوانین دەست بخەینە ناو دەستی یەکتری و جەنەڕاڵەکان لە بەخششەکانیان بێ بەش بکەین ؟ ئێمە زۆربەمان ساویلکە و تەمبەڵ و نەفامین و، کە گوێمان لە قسەی پڕو پووچ دەبێ لە بارەی ((تەرازوو ڕاگریی هێز)) و ((کارلێکی هێزەکان)) و هەموو ورێنەکانی ترەوە سەرمان دەلەقێنین و ڕەزامەندیی خۆمان پیشان دەدەین. تەرازوو ڕاگریی هێز ؟ ئەگەر هەر ڕەشوڕووتێك خۆی ماندوو بکات و داوای ئەوە بکات کە ئەو پارەیە لەپێناو چاك کردنی باری گوزەرانی خەرج بکرێ لەجیاتی خەرجکردنی بۆ چەك و جەنگ، ئەو کاتە جەنگ نەدەبوو،

ئێمەش هەموومان گوزەرانمان باشتر دەبوو. بەڵام هەموو ڕەشوڕووتان پێویستە لەپێشا بەتوندیی مست لە مێز بدەن و ئەوە بدەنە زانین کە کێ هێز لە دەستە و ئەو هێزەش دەبێ چۆن بەکاربهێنرێت.

بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە ڕەشوڕووتان بەتەواوی ڕۆشنبیر نین، بۆیە پشت بەئیحساساتیانەوە دەبەستن، دیارە ئەمەش بەس نییە. ئەوان دەڵێن، شتەکان باش دەبن و تاڕادەیەکیش وەکو خۆمان ئاسوودە دەبن و، بەهەر حاڵیش ئێمە هیچ لە سیاسەت ناگەین و سیاسەتمەدارانیش هەر کاتێ پەنجەیان بگاتە دەستکەوتەکان تەنیا هەر فێڵی نابەجێت لەگەڵدا دەکەن. ئەگەر بێت و بەڕەشوڕووتان بڵێی کە ئەوان دەتوانن بەخۆڕایی و بەبێ باج ئۆتۆمبێل وەدەست بخەن و کە گالۆنێک بانزین لە چەند پەنسێک زیاتر لەسەریان ناوەستێ، ئەوا هەر پێدەکەنن چونکە نازانن. ئەگەر هەوڵیش بدەی بۆیانی بهێنیتە دی و ئەوەیان پیشان بدەی کە هەر شتێک چەندی تێدەچێت، ئەوا تووڕە دەبن چونکە لای ئەوان ئەوەیان وەك ئەوەیە کە ئەوان بە گێل و گەمژە دابنێی و پارەکانیان لەشتی ناپێویست خەرج دەکەن.

تەنیا چەند سەعاتێکی کەمی خایاند بۆ تێکشکاندنی شەمەندەفەرێکی زرێپۆشی تۆپدار، کە تەنیا لوولەی تۆپەکانی سامانێکی زۆری تێچوو بوو. لە هەموو لایەك بەگرمەی گوللە تۆپ گەمارۆ درابووین، بۆیە تانك لە دوای تانك لەلایەن ئێمەوە تێك دەشکێنرا، وردە وردە ئەڵقەی گەمارۆیان بەسەرماندا تەسك دەکردەوە وەك هێرشی زەردەواڵەی ترسناك.

سەنتەری کۆنترۆڵکردنی ئاگر بێدەنگ بوو. پلۆتۆ بێهوودە دوگمەکەی سووڕاند، بەڵام نەیتوانی تەنانەت پەیوەندی بەفارگۆنەکانی ترەوە بکات. ئیتر لەوە بەدوا پیرەئان خۆی لەباتی ئێمە شەڕی دەکرد. ئێمە ئێستا هەر تەنیا

هەشت سەد مەترێك لە پردەكەوە لە بریسلاوەوە دوور بووین، بەڵام لەهەمان كاتدا بریسلاو بووە كەلەخێكی سووتاوو هەموو تۆپەكانیشی بێدەنگ بوون.

تەقینەوەیەكی مەزن فارگۆنەكەمانی هەژاندو سەری گێژ كردین. هەندێك لە تاقمەكە دەستیان بەهاواركردن كرد، هاواری وا كە لە مێشكمان دەچەقی، دووكەڵ و گڕی ئاگریش لە بورجی ژمارە ١ دەردەچوو. بەركەوتنێكی راستەوخۆ بوو. بەئامێرە ئاگر كوژێنەوەكانمان كەوتینە گیانی پاشماوەی ئاگرەكە، ئنجا دەستمان بە ژماردن كرد : چوار كوژراو و حەفت بریندار. خۆشبەختانە ستیك بێجگە لەچەند برینێكی سووك نەبێ لە دەستەكانی، ئەزیەتی نەخواردبوو.

تۆپەكەی من تەنیا تۆپێك بوو كە توانای ئاگر بارانی هەبوو، كاتێ بەناو بورجە زۆر گەرمەكەدا گەڕاین، كە گڕی ئاگر لەگەڵ تەقاندنی هەر گوللە تۆپێك هورووژمی بۆ دەهێنا، ئارەقەمان كرد، یەك لەدوای یەك فارگۆنەكان تێك شكێنران و، لە دواییدا تەواویی شەمەندەفەرەكە لەكار كەوت. بۆیە دوژمن توانی بەتەواوی دەست بەسەر هەموو فارگۆنەكاندا بگرێت. ئنجا گرمەیەكی گەورە هات دەتگوت هی ڕۆژی قیامەتە و، گڕە ئاگرێكی سپی سووتێنەر بورجەكەی پڕ كرد. لێدانێكی توند بەر سنگم كەوت و هەموو شتێك لەبەر چاوم ڕەش بوو. ناڵاندم. وا هەستم كرد دەتگوت هەموو لەشم وردوخاش بوو زۆر بەئاگاداری هەناسەم هەڵدەكێشا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەناسەیەك وەكو تێژەنینی چەقۆ وابوو. نەمتوانی بجووڵێم. كەوتبوومە نێوان گیرەیەكەوە كە پێكهاتبوو لەو تۆپەی كە لە شوێنی خۆی هەڵكەنرابوو، لەگەڵ دیوارە پۆڵاییەكەی بورجەكە.

له تەوقی سەرمەوە تا بنی پێم ئالوودەی خوێن بوو. خوێنی کێ بوو، نازانم، بەڵام من وای بۆ دەچووم کە خوێنی خۆمە، لە تەنیشتمەوە یەکێك لە تاقمی تۆپەکە کەوتبوو، تەپڵی سەری وەکو تەپڵی سەری هێلکەیەکی کوڵاو برابوو. دەم و چاوم و شانەکانم بەمێشکی ئەو داپۆشرابوون. بۆگەنێکی لەڕادەبەدەر لە کونەلووتەکانمدا هەبوو، ئەویش بۆنی خوێن و هەناوی بە هەڵم بوو تێکەڵ بەبۆنی تیژی تەقەمەنی. پاشان ڕشامەوە. ئنجا گرمەیەکی مەزنی دی هات و گڕی ئاگر بەهەموو لایەکدا بڵاوبووەوە. واگۆنەکە دەستی بەلاربوونەوە کرد وا پێدەچوو خەریك بێ بەلادا وەرگەڕێ. بەڵام شتێك گرتی و بەهاوسەنگیی بەگۆشەیەکی چل و پێنج پلەیی مایەوە. ئەم لێدانی دووەمە کەمێك جێی تۆپەکەی گۆڕی بۆیە توانیم لاقەکانم و باسکێکم بجووڵێنم و، هەر بۆیەش توانیم هەندێك لەو مێشکە لیچانە بسڕمەوە کە بەسەر دەم و چاومەوە بوون. لە پشتمەوە شولتز کەوتبوو، گەنجێکی شازدە ساڵە، هەردوو لاقی وردوخاش ببوون و وەك لوولکەی سووریان لێ هاتبوو. بەسەر سەریشمەوە دەستێکی پارچە پارچە بوو بەهەڵواسراویی مابووەوە، لەیەك لە پەنجەکانی ئەنگوستیلەیەکی زێڕ هەبوو کە پیرۆزەیەکی شینی تێدابوو. سەرم دەستی بە سووڕان کردو کەوتمە هاوارکردن. بەخێرایی هاتمەوە هۆش خۆم و هەر چۆنێك بێ، هاواری پیرەئان و پۆرتام کرد. پاش کەمێك لەنێوان پلێتە ئەستوورەکانەوە گوێم لە دەنگێك بوو، داوای لێکردم تەپە تەپ بکەم بۆ ئەوەی شوێنی خۆم دەست نیشانکەم، پاشان دەنگی ئارام کەرەوەی پیرەئان هات :

– پیرەمێرد ! هەر ئێستا یارمەتیت بۆ دێ.

بەهۆی ئامێرێکی بڕین کونێکیان کردەوە کە پۆرتا دەم و چاوە بێزراوە ناشیرنیەکەی لە ناوییەوە پەستی :

به ددان گڕکردنەوە گوتی: "هەڵۆ، هەڵۆ، دێیتەدەر بۆ پیاسەکردن ؟".

بە ئاگادارییەوە بەرەڵلایان کردم. لە تاقمی واگۆنەکە نۆیان مابوون و، لەو کاتەی یەکێکیانمان برین پێچ دەکرد، گوللە تۆپێکی تر هات و ئێمەی لەناوەوە دەرگا بەندکرد.

پۆرتا و پلۆتۆ بەدوو کوتکی قورسەوە خەریکی دەرگا پۆلاییەکە بوون و، توانیمان دەرگاکە بەڕادەیەکی وا بکەینەوە کە بتوانین بەزۆر لێی دەرچین. چەکدار بە ڕەشاشەکانمان و بەهەندێك نارنجۆکەوە، بەرەو پردەکە ڕامان کرد، خۆمان لەژێر پەردەی خاکڕێژەکەوە دەپاراست. هەندێ تانکی ڕووسیی ڕاستەو ڕاست هێرشیان هێنا بۆ ئەوەی گۆشەگیرمان کەن و، ئێمەش خۆمان لە تێوەگلان لەشەڕی مان و نەماندا دۆزییەوەو، ئەوانەی لێی دەرباز بوون بێگومان لەبیریان نەچۆتەوە. لەپێشا ئێمە گەیشتینە ئەوێ. دەرحاڵ چەشنیی تەقەمەنییەکان ئامادەکران فیوزەکانیش داگیرسان. ئنجا بەو پەڕی خێراییەوە دەستمان کرد بەپەڕینەوە لەو پردەی کە لە بەینی ڕایەڵە ئاسنینەکانی ژێر هێڵی شەمەندەفەرەوە دەمانتوانی ڕووبارەکە دوور لەخوار خۆمانەوە ببینین کە گوللە تۆپ و فیشەك دەیان شڵەقاند. ڕووسەکان پردەکەیان بەڕەشاشەکانی خۆیان ڕشاندو، زۆر لە ئێمە پێکران و بە لوول خواردوویی دەکەوتنە ناو ئاوە زەردە شڵەقیوەکەوە. هاتبوو بپەڕینەوە کە گرمەیێکی زۆر مەزن هەناسەی لێ بڕین، لەسەرخۆ پردەکە دەستی کرد بەشۆڕبوونەوە.
پۆرتا هاواری کرد "هێلی ئاسن بگرن".

بەشی زۆری پردەکە کەوتە ناو ڕووبارەکەوە. ڕایەڵە ئاسنینەکان وەك گەلای دارو درەخت لە ڕەشە باییێکی پاییزدا هەڵوەرین. هێڵە ئاسنینەکە بە

ونـەیێکی بـەرزەوە تێـك شـکا، سـامووله و بـورغی وەکـو گوللـە تـۆپی تـۆپێکی ئۆتۆماتیکی بەهەموو لایەکدا پەرت دەبوون.

لە دواییـدا هەراهۆریاکە کپ بـوو. بەهۆی چەند وایەرێکەوە مـن و پۆرتـا توانیمـان بـچینە سـەر سـتوونێك و لەوێـشەوە خۆمـان بـە هێڵـە ئاسـنینێکی جوولەدارەوە هەڵواسی و گەیشتینە کەناری ڕووبارەکە لای ئەوانی تر.

دەم و چاوی فۆن بارینگ زۆر بەخراپیی تووشـی سـووتان ببـوو ژانێکـی زۆری هەبوو. لووت و لایەکی چاوی ئۆبەرست هنکاش پەڕی بوو.
هەرکە گەیشتینەوە بنکەی مەشقکردنمان ڕاست لێی نووستین.

چاویلکە هەتاوییەکانی خۆمانمان ڕاکێشایە خوارەوەو دەستە سرِی ئاوریشمیمان لەملمان پێچا. ڤۆن بارینگ ستالینی بۆ پۆرتا بەرزکردەوە، ئنجا دەنگی پیرەئـان بـەناو بێتەلدا فەرمانی بەئۆتۆمبیلەکانی تردا.

- مەکینەکان وەگەڕ بخەن، ئامادەبن بۆ کار !.

چــەکە ئۆتۆماتیکییــەکان داگیرابــوون، ڕەختــە درێــژەکان پڕکرابــوون. فەرمانــدەی ئۆتۆمبیلەکان ئامادەیی خۆیانیان ڕاگەیاند، ئنجا دەنگی پیرەئان دووبارە هاتەوە :

- یەکەم دەستەی زرێپۆشی پشکنین — بۆ پێشەوە — بڕۆن !،،

مەکینەکان کەوتنە گەڕ، لەژێر تایە قورسەکاندا چەوەکە هاڕین.

# ملشکان و لاقشکان

هەوڵم دا بچرپێنم " پیرەئان، خۆ خراپ نییە ؟ ".

– جووتـە ساچمەیەکی بچووك لـە زگ و لاقـەکانت دان. خـراپ نییـە. دەرحـاڵ دەحەسـێیتەوە. دەبینـی، هـەر زوو جـارێکی تـر بـاش دەبییـەوە. تـۆ و سـتیگ دەبەینە بنکەی هەژمارکردنی زیانەکان. ستیگ هەر بەر لاقێکی کەوتووە.

هەر کە ئۆتۆمبیلەکە هەڵزەقییەوە من ڕاچەنیم.

– پیرەئان، برینێکی سامناکە. قومێك ئاوم بدەیێ.

– نابێ هـیچ شـتێك بخۆیتـەوە تـا دوکتـۆر سـەیرێکت نـەکا، بـەم جـۆرە پیرەئـان وەڵامی دامەوە و دەستێکیشی بەسەرم داهێنا.

– خۆشت دەزانی ئاو خواردنەوە بۆ برینداری زگ بەتووندیی قەدەغەیە.

– تەماشاییێکی ناکەی. خەریکە شێتم دەکا.

– چاك بۆمان پێچاوی. هیچی تر ناکرێ تا ئەو کاتەی دکتۆر دەتبینێ.

ئۆتۆمبێلەکە وەستا. پیرەئان بازی دایە دەرەوە و پۆرتاش بۆ لام هات.

– ئەوجا، پیرە کوڕ، گەزێکی باش بەکۆنە ددانە عاجییەکانت بگرە چونگە من و پلۆتـۆ نیازمانـە لـەم کۆنـە سـندووقە ڕاتکێـشین و داتگـرین و بتدەینـە دەسـت پیرەئان و تیچ. ئەگەر ئەمە بکرێ، بارە خراپەکە بەسەر دەچێ. کۆنە دۆستم. تۆ تەنیا بیر لەو هەموو پەرستارە جحێلانە بکەوە کە ئەندامە گرنگەکانت بەکـەتانی خاوێن ڕۆژی چوار جار بۆ دەشۆن، وەك ئـەوەی لەگـەڵ ئاسمۆسـی بـرادەرە بـێ لاقەکەمانی دەکەن.

له دواییشدا كه له‌سه‌ر زه‌وییه‌كه درێژ بووم و جانتای ده‌مامكه گازییه‌كه‌م له‌ژێر سه‌ری بوو لێوه‌كانم خوێنیان لێده‌هات. له‌ناكاو وای لێ هات ئازابوون زۆر گرنگ بێت، ئه‌مانه هه‌موو، نابێ هاواریش بكه‌ی كاتێكیش (ستیگ)یان دانا به‌توندیی نالآندی چونكه لاقی به‌ر یه‌ك له پێچكه‌كانی ئۆتۆمبێله زرێپۆشه‌كه كه‌وتبوو. هه‌ڤاڵه‌كانمان خۆیان به‌سه‌رماندا شۆڕكرده‌وه بۆ خواحافیزیی لێكردنمان. پیره‌ئانیش چه‌ناگه مووادییه‌كه‌ی له هی من گیر كرد و چرپاندی :

– خۆت له ئۆردووگایان حه‌شارده تا جه‌نگ به‌سه‌ر ده‌چێ.

پۆرتا ده‌سته‌كانمانی گوشی و ستالینی بۆمان ڕاگرت بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌ویش ماڵئاواییمان لێ بكا، پاشان هه‌ر به‌ر له‌وه‌ی جارێكی تر له‌ناو ئۆتۆمۆبێله‌كه بزر بێ هاواری كرد :

– شه‌یتانی به‌خته‌وه‌ر ! له باتی من هه‌موویان ماچ بكه و پێیان بڵێ كه هه‌موو ڕۆژێ بایه‌خ به ڕواڵه‌تی ده‌ره‌وه‌م ده‌ده‌م، بۆ ئه‌وه‌ی كه ئه‌م جاره چاویان به من كه‌وت جوان ئه‌ندام بێمه به‌رچاویان.

پاشان مه‌كینه پڕ هێزه‌كه گره‌ی هات. پیره‌ئان، تیچ و پلۆتۆ له‌ناو بورجه كراوه‌كه‌وه ده‌ستیان ڕاوه‌شاند و ئنجا خۆیان و ئۆتۆمبیله زرێپۆشه‌كه‌یان له‌ناو گه‌واڵه هه‌وری تۆز و گه‌رددا بزربوون.

دوور له ژان و ژوار هه‌ستم به سامناكیی و ته‌نیایی كرد. باش بوو كه ستیگ له‌وێ بوو، هه‌ستم ده‌كرد به ته‌نیا له‌گه‌ڵ ئه‌وم.

دوو نەخۆشەوانی پزیشکیی ئێمەیان هەڵگرت و بردنیانین بۆ هۆڵێکی گەورە. کە زەوییەکەی پڕی بوو لە کاو کۆت و بە سەربازی بەدلە پیس و دڕاو داپۆشراو بوو. هەرکە لەناو کاوکۆتەکە درێژکراین ستیگ دەستەکانمی گرت.
- هاوڕێی دێرینم، خراپە ؟ دەبینی، هەر زوو باش دەبیٚ، کە دکتۆر دەتبینیٚ و دەرزییەکت لە باسکی دەدا. ئێمە دەبیٚ بە زرنگیی ڕەفتار بکەین بۆ ئەوەی بتوانین بەردەوام پێکەوە بمێنینەوە.
- بەڵیٚ، ئێمە زۆر باش دەبین ئەگەر لەیەك جودا نەبینەوە، هەرچییەکی ڕوویدا. خودایە، ئەمە ئازار بەخشە. دەڵێی هەناوت دەردەهێنن. بەڵام تۆ لاقەکانت چۆنن ؟ ئایا خراپ بەریان کەوتووە ؟
ستیگ گوتی: ئای، کەمێك ئەزیەتم دەدات. هەوڵی دا زەردەخەنەیەکی لاواز پیشان بدا. پێم زۆر خراپە. بەڵام قیرۆسیا لە لاقم، دەتوانن لە بنەوە بیبڕنەوە. زگی تۆ خراپترە.

دکتۆرێك لەگەڵ دوو نەخۆشەوانی پزیشکیی هاتن، بۆ هەر یەك لە نەخۆشەکان کارتێکی بەپێی فەرمانەکانی دکتۆر نووسی. تەنیا تێڕامانێکی بیٚ بایەخانەی گرتە باندجەکانی ستیگ و ئنجا گوتی :
- ساچمەی گوللە تۆپ لە لاقی چەپ، هۆی گواستنەوەی ژمارە ٦، هەر ئێستا باندەجی تازە، لەگەڵ ٣ سی سی تیتانۆس.

برینبەندێکی تازەی لەسەر زگم دانا : "ساچمەی گوللە تۆپ لە لاقی چەپ و، لە پێی ڕاست و لە زگ، هۆی گواستنەوەی ژمارە ١، ٣ سی سی تیتانۆس، ٢ سی سی مۆرفیا هەر ئێستاو هەمان شتیش پێش گواستنەوەی.

خۆم هانداو وێرام بپرسم کە ئایا من و ستیگ پێکەوە نامێنینەوە. بەدڵڕەقییەوە وەڵامی دایەوە :

- ئەگەر ئێوە لێرە بمرن یان لەناو شەمەندەفەرە نەخۆشخانەکەدا، ئەوەندە گرنگ نییە، تا کار وا بڕوا، بەڵام برینداراني زگ بەهۆی گواستنەوەی ژمارە ١، و ئەویش بەهۆی گواستنەوەی ژمارە ٦ دەڕوات. من ناتوانم هیچ شتێك بکەم.

ئنجا بۆی دەرچوو، چاکەتە سپییەکەی دەلەرییەوە. باوەڕ ناکەم ڕوح گەورەو دڵڕەق بێ، تەنیا لە ڕادەبەدەر باری گران بوو. لەجیاتی پایپێکی باشی ئینگلیزی و، جگەرەو توتنی خۆمانە، ئەو فێلدۆبیلەی بەرپرسی گواستنەوە بوو بەڵێنی پێ داین ئەوەی پێی بکرێ بۆمانی بکا. دەرزییەکەی خۆمم لێداو لەسەر شەپۆلی نووستن خەو بردمییەوە، لە ئەنجامیشدا تەنیا کاتێك بەئاگاهاتمەوە کە لەسەر نەقالەیەك بڵندیان کردم و بۆ ناو ئەمبولانسێك پاڵیان پێوەنام کە لە ناویدا چوار نەقالە لەسەر ڕەفەکان بوون یەك لەسەر ئەوی تر. ستیگ لەژێرەوەی من بوو، بەم جۆرە فیلدۆبیلەکە بەڵێنەکەی خۆی بەجێ هێنا.

کە ئەمبۆلانسەکە هەڵدەزەقییەوە یان دەهەژایەوە ئێمە بەر ئەو نەقالەیە دەکەوتین کە لەسەرەوە بوو، یان ئەوەی لە هەرە سەرەوە بەر بنمیچەکە دەکەوت.

ماوەی نێوان نەقاڵەکان تەنیا یەك دوو گرێ بوو، لەبەر ئەوە پیاو هەستی بە خنکان دەکرد. لەسەر ڕەفەی سەرەوە سەربازێکی تۆپچی کە حەوزی شکابوو هەر هاوار هاواری بوو داوای لە ئێمە دەکرد زەنگەکە لێبدەین، دەترسا نەبادا خوێن بەربوونی ببێتە هۆی مردنی. ستیگ جار لەدوای جار دوگمەی

زەنگەکەی پاڵەدا کە لە ژووروچکەی شوفێر رنگەی دەهات، بەڵام نە شوفێر و نە یاریدەدەرەکەی هیچ گوێیان پێنەدەدا. کە کاتی ئەوە هات ئێمە بخەنە ناو شەمەندەفەرە نەخۆشخانەکەوە، سەربازە تۆپچییەکە گیانی لەدەست دابوو. نەخۆشەوانە پزیشکییەکان بەدڵرەقییەوە رایان کێشایە دەرەوەو، فڕێیان دا سەر زەوی و قوماشێکی مشەمایان بەسەرداکێشا، ئنجا دەستیان بە داگرتنی ئێمە کرد.

شەمەندەفەرە نەخۆشخانەکە یەکێك بوو لە دەزگا سوپاییە بەدناوەکان، لە ریزە واگۆنێکی بارهەڵگری بێ کۆتایی زیاتر نەبوو کە زەوییەکەی بە کاوکۆت داپۆشرابوو، هەر یەکێکیشیان چل سەربازی لەخۆ دەگرت، تەنیا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی پۆلێن کرابوون. شەمەندەفەرەکە بەردەوام دەوەستاو دیسان دەڕۆیشتەوە هاوڕێ لەگەڵ زنجیرەیەك هەژانەوە وات دەزانی واگۆنەکان پارچە پارچە دەبن. یازدە کەس لەوانەی لەواگۆنەکەی ئێمەدا بوون مردن. من لەبەر ژان و تینوویەتی خەریك بوو شێت بم، بەڵام ستیگ شووشە ئاوەکەی لێ دوورخستمەوە. ئاو خواردنەوە مردنی بەدواوە بوو.

سەفەرەکەمان سێ شەوو سێ ڕۆژی بێ کۆتایی و سامناکی خایاند، دوایی بەڕیز لەسەر سەکۆی ئێستگەی شەمەندەفەری کییڤ درێژکراین قوماشێکی مشەما لەژێرمانەوە بوو، پاڵتۆیەك بەسەرمانەوەو ئەو سندووقە هەمیشەییەی کە دەمامکە گازی تێدابوو لەژێر سەرمان بوو. بەدرێژایی ئەو پاش نیوەڕۆیە لەسەر سەکۆ تەڕەکەدا ڕاکشابووین، لەو ماوەیەدا زۆرمان لێ مردن. من هەر تەنیا بەشێوەیەکی تەماویی دەمزانی لە دەورو بەرمدا چی ڕوودەدا. ستیگ لە تەنیشتمەوە ڕاکشابوو، دەستمان لەناو دەستی یەك بوو

دەتگوت جووتە کورێکی بچکۆلانەین نەك دوو کۆنە سەربازی توندو تۆڵ و بەهێز کە چاك لە بینینی مردنی خەڵك و هاوارکردنیان وەك ئاژەڵ ڕاهاتبوون. درەنگانی ئەو ئێوارەیە لەلایەن هەندێ نەخۆشەوانی پزیشکیی و زیندانییانی جەنگیی ڕووسەوە هەڵگیراینەوەو خراینە ناو ئەمبۆلانسەکان و بەرەو نەخۆشخانەی ژمارە ١٣ی مەیدان ڕەوانە کراین کە لە دەوروبەری پاڤیلۆ دامەزرابوو. لەوێوە یەکسەر بردنیانین بۆ مەخزەنێك و لەوێ ئەسپێماڵ کراین. ئەمە لەلایەن زیندانییانی جەنگیی ڕووسەوە دروستکرابوو، منیش قەت پەرستیاری وا نەجیب و پاکم نەدیوە. ئەگەر جارێکیان هەڵەیەکیان بکردبایە و ئێمەیان دووچاری ناڵە و هاوار بکردبایە ئەوا بەجۆرێکی وا کاریگەر دەشلەژان کە هەر تەنیا لەبەر خاتری ئەوان ئێمە ددانەکانمان دەگرساندن و بەهەموو توانامانەوە هەوڵمان دەدا ژانەکانمان پیشان نەدەین. ئێمەی برینداران بەتێکڕایی لەسەر ئەوە کۆك بووین کە ئەگەر تەنیا لەلایەن ئەم ئافەریدە مەزن و میزاج باشانەوە چاودێری بکرێین ئەوا لە ڕاستیدا بەختەوەر دەبین و، بەسوپاسیشەوە هەرچی جگەرەیەکی کە هەمان بوو پێیانمان دا. ئەوانە وەك ئێمە لەناو خەندەك دابوون و، هەرچەندە لە ڕەگەزو نەتەوەیەکی ترن و سەردەمێك تەقەمان لە یەکتری کردووە، چونکە ئەوانەی دەسەڵاتدار بوون بڕیاریان دابوو کە ئێمە دوژمنی یەکترین، ئەو سۆزەی لە نێوانماندا هەبوو بەهێزتر بوو لەهەر بڕیارێك کە زۆر لەمێژە بەتەواویی سەلماندوویەتی بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بەڕاستییەوە هەبێت کە سەربازی تایبەت دەتوانێ پێی دڵخۆش بێ.

من و چواری دیکە لە ژووری نەشتەرگەریدا درێژ کرابووین و چاوەڕێی نۆبەتی خۆمان بووین و چاومان بڕیبووە هاوڕێیەکی بەدبەخت لەسەر مێزەکە

لەژێر چرایەکی درەوشاوەوە. چوار نەشتەرگەر وەکو بروسك ئیشیان لەسەر دەکرد، ئەوان پێیەکیان دەبڕییەوە. هەر یەکسەر کە بڕایەوە فڕێ درایە ناو پەقرەجێکی سپی کە قاچێکیشی تێدابوو هەر لە بن ئەژنۆوە بڕابووەوە، هەروەها قۆڵێکیش کە بەشە بڕاوە خوێناوییەکەی بەسەر ڕۆخی پەقەرەجەکەوە دەرپەڕی بوو. ئەمە هێلنجی هێنامێ و ڕشامەوە، یان لە ڕاستیدا خۆم هەوڵمدا بڕشێمەوە، بەڵام تەنیا کەمێك خوێن و زەرداو هاتەدەر.

نەخۆشەکەی تر کابرایێکی لاوی پشت شکاو بوو. وا پێدەچوو لە هۆش خۆی چووبێ. نەشتەرگەرێکی بەتەمەن خۆی و چاویلکە تاك چاوەکەی بەردەوام جنێوی بۆ نەشتەرگەرەکانی ترو نەخۆشوانە پزیشکییەکان دەنارد، بەڵام وا دیار بوو ئێجگار شارەزا بێ، چونکە وەك بروسك ئیشی دەکرد بێ ئەوەی هیچ جوولەیەکی نا پێویست بکات. کاتێکیش کە بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك ئیشیان لەسەر کوڕە لاوەکە کرد نەشتەرگەرە تەمەندارەکە بەتوڕەیی قیژاندی :

– بەڵام، چش، قۆندەرەکە مرد. لایبەرن و کەلەشەکەی تر بهێنن و پەلە بکەن. پاڵێکیشی بە یەکێك لەنەخۆشوانە پزیشکییەکانەوە نا.

بەر لەوەی بزانم ئەوە چییە ڕوودەدات ڕاکشام و لە مێزی نەشتەرگەری بەسترامەوە. دەرزییەکیان لە قۆڵم داو یەکێکی تریش لە ورگم. یەك لە نەشتەرگەرەکان دەستی لە شانمان دا :

– کوڕە پیرەکە، ئێستا ددانەکانت بگرسێنە. زۆر ناخایێنێ، بەڵام ڕەنگبێ بە ئازار بێ، چونکە تەنیا دەتوانین سڕکردنی خۆجێبێت بدەینێ، بۆیە ئازا بە و ئێمەش هەر زوو بەچاکیی پینەت دەکەین.

پاش ماوەیەکی کەم ئاگام لە بڕینی ئەم سەر تا ئەو سەری زگم بووم و گوێم لە تەقە تەقێکی لاوازی ئامێرەکان بوو. پاشان وامزانی هەموو هەناوم ڕادەکێشنە دەرێ. وا دەسووتایەوەو دەکزایەوەو پارچە پارچە دەبوو دەتگوت بە گازی سوورکراوە کاری تیادا دەکرێ. قەت نەمدەزانی ژانی وا هەیە. وەکو شێت لە هاوارم دا وامزانی هەردوو چاوم دەردەپەڕن.

پیرە نەشتەرگەرەکە هاواری کرد " دەمت داخە، جارێ بەتەواویی دەستمان پێ نەکردووە، لوورەکانت هەڵگرە بۆ کاتێك کە شتێك هەبێ لوورەی بۆ بکەی".

کاتێ "شتێکم دەبێ لوورەی لەبەر بکەم" من نازانم، من تەنیا هەر ئەوەندە دەزانم کاتێك ئەوان لێبوونەوە کەوتبوومە ئەو دنیای ئازارو ئەشکەنجەیەی کە کەم کەس تێی دەکەون. تێك شکاوو هاڕاو بووم، بردمیانە بەشێکی نەخۆشخانە، خستمیانە سەر نوینێك، دەرزییەکیان لێدام و کەوتمە خەو.

لە چواردە ڕۆژی یەکەمدا کەمێك ئاگام لە بەسەرهاتەکانی دەورو بەرو ڕووداوەکانی پەیوەند بەخۆم بووم، بەڵام زۆر لەسەرخۆ هێزو توانام وەبەرهاتەوە. لە نوێنەکەی تەنیشتم فڕۆکەوانێك ڕاکشابوو کە بەخراپیی سووتابوو، ناوی زەپ بوو. لەولا ترەوە شەش برینداری زۆر خراپ هەبوون کە دووانیان لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا مردن. هیچ ئاگام لەوە نەمابوو کە ستیگ چی بەسەر هاتووە، کەسیش پێی نەگوتم.

سێ حەفتە پاش نەشتەرگەرییەکە ئاگادار کرامەوە کە توانای جوولانەوەم هەیە. خرامە ناو شەمەندەفەرێکی نەخۆشخانەی تایبەتەوە کە

خەوگەی ڕاستەقینە و پەنجەرەی گەورەی تیادا بوو کە پیاو دەیتوانی لێیانەوە ببینێ، تەنانەت ئەوانەی کە لە خەوگەی ناوەڕاستیشدا بوون. لەبەرئەوەی من بەبەردەوامیی دەبوایە جل و بەرگم بگۆڕم، بۆیە یەکێك لەو خەوگە ناوەندییانەیان دامێ کە هەڕمێنیان لەسەر بوو. لەسەر منەوە (زەپ)ی برادەرم ڕاکشابوو، کە ڕۆحیەتی باشی ئەو یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆم.

براینە لووۆو ، لەوێ من و زەپ ڕەوانەی نەخۆشخانەی ژمارە (٧)ی نیگەهداری کراین، دکتۆرەکە گوتی برینەکەی من بەڕاستی ساڕێژەو، زەردەخەنەی هاتێ. ڕادەی جوولە لەوێدا هیچی تر گرژیی تێدا نەبوو، دکتۆرەکانیش ئەو کاتەیان هەبوو کە لەگەڵ پیاودا وەك پێویست پێ بکەنن و قسە بکەن. جووتە ساچمەیەکی لە لاقم ڕاکێشایە دەرەوە کە دەمارەکانمی هێنایە لەرزە. بەڵام پاشان هاورێ لەگەڵ سەرسوڕمانی من پەرستارەکە برینپێچەکانی دووبارە گەڕاندەوە، هیچیان پێنەدام تەنیا گرار نەبێ و من ئەوەندە بێزم لێی دەبۆوە کە بەتەواویی شێت بووم. تەنانەت کاتێکیش داوام لە دکتۆرەکە کرد کە ئایا دەتوانم گۆڕانێك لە پارێزەکەم بکەم لەسەرخۆ دەستێکی لە گۆنام داو گوتی :

– دوایی، برادەرەکەم، دوایی.

زەپ و من لە قاوشێکی بریندارانی خەتەرناك بووین. شەوو ڕۆژ هاوارو ناڵەناڵ بوو، زۆر جاریش بەشێوەیەکی ترسناك بۆگەن دەبوو لەبەر پشیلە و گەنیویی. ڕۆژێکیان کوڕێکی لاو، کە دەیزانی بەرەو مردن دەچێت و سێ حەفتەی تەواوی پڕ لە ئازاری لەم بارەیەوە چەشتبوو، هەستایەوە، خۆی ڕاکێشا بۆ ناو داڵانەکە و لەوێوە خۆی بەسەر پیپیلکەکاندا تێ هەڵدایە خوارەوە. شتێکی ترسناك بوو، چونکە ئێمە نەمانتوانی هەستینەوە و

بیوەستێنین، زەپ هەوڵی دا بەڵام چەند پێپیلکەیەك دوور لە جێگەکەی کەوتە خوارەوە. ئێمەش دەستمان بە زەنگ لێدان کرد تا زەنگەکە شکستی خوارد.

زگم ژانێکی ترسناکی تووش کردم و، هەروا گاڵتەش نەبوو سەرەڕای ئەمە کاتێ دکتۆر گۆشتی لاقی هەڵزڕاندم بۆ دۆزینەوەی ساچمەی گوللە تۆپ. پلەی گەرمیم، لەجیاتی ئەوەی دابەزێ، بەرز بۆوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دکتۆر پێی گوتم کە بەرەو چاکیی دەچم.
بەتووڕەییەوە هزرم کردەوە "هەموو شتێك بۆ تۆ زۆر باشە".

شەوێکیان لە نیوەشەودا هەستامەوە. برینپێچەکانم تەڕو لینج بوون. داوام لە زەپ کرد زەنگ لێ بدا. پاش ساتێك پەرستارێك بە ڕاکردنەوە هات.
بەتووڕەییەوە چرپاندی " تۆ زۆر چاکی وا نییە ؟ ئایا تۆ شێتی ئا بەم جۆرە لەم کاتەی شەودا زەنگ لێدەدەی ؟ " وەڵامم دایەوە " برینەکەم تەقی. لە برین بەندییەکەوە خوێن دێت. " لە ترسانا گەیشتبوومە ڕادەی خۆ پێڕانەگیران و لە هزری خۆمدا دایکم دەبینی کارتە کورت نووسەکەی لەسوپاوە پێدەگات : " وەك پاڵەوان لەپێناو فۆهەرو نیشتماندا سەری نایەوە ".

پۆشینەکانی بەلایەکدا لادان. بۆ ئەوەی ئەوانی تر ئاگایان لێ نەبێت پەرستارەکە چراکەی دانەگیرساند، تەنیا هەر تۆرجەکەی بەکارهێنا. بەخێرایی و بە تەڕدەستی برین بەستەکانی کردنەوە. قاوشەکە تەواو هێمن بوو. کوڕێکی لاو لەو سەرەوە لە خەودا منگەمنگی دەکرد. زەپ لەناو نوێنەکانی هەستایەوە، بەڵام پەرستارەکە پاڵێکی بۆ دواوە پێوەناو داوای لێکرد بخەوێت.

- من و سڤن دەتوانین چاکتر ئەم کارە جێبەجێ بکەین. ئەوەی گوت و چوو بەلای تەشتە ئاوێکدا. سەرنجێکی پڕ ترسیم لە زەپ گرت، ئەویش سەیرێکی کردمەوە، هەردووکمان وەك یەك ترساو. پەرستارەکە گەڕایەوەو، بەبێ ئەوەی وشەیەك بڵێ منی شوشت. لەسەرخۆ لەبەر خۆیەوە زەردەخەنەی هاتێ و تەنیا سەرنجێکی لە دەم وچاوە ترساوەکەم گرت. گوتی:"ئەمە شتێك نییە ترست لێی هەبێ".

گوتم: " هەموو ئەم قسانە بۆ تۆ باشن بیانکەی، تۆ تووشی خوێن لەبەرچوون نەبوویی".

پەرستارەکە وەڵامی نەدامەوە تەنیا لەبەرخۆیەوە زۆر بەداپۆشراوییەوە گرژییەوە.

پرسیم " ڕەنگبێ زۆر خراپ نەبێت ؟ ".

وەڵامی دامەوە " هیچ خراپ نییە ".

کە تەواوی کرد دووبارە داپیۆشیمەوە. ئنجا ساتێك لەوێدا وەستا، سەیری منی دەکرد.

گوتی: " خوێن نەبوو ".

گوتم: " خوێن نەبوو ؟ بەڵام من هەستم کرد ..... "

کاتێکی زۆری پێدەچێ تا نەرمە زەردەخەنەکەی لەبیر دەکەم. دەم و چاوم سوور هەڵگەڕاو ترسناکانە شڵەژام.

- برادەر، خەونت دیبوو، بەتەئکید دیارە بەرەو باشیی دەچی. بەسووکی دەستێکی لە چەناگەم داو بەخۆی و تەشتەکەیەوە ڕۆیشت.

زەپ گرژییەوە " دەبێ خەونی بەتۆوە دیتبێ، پەرستار ! ".

- ئێستا هەردووکتان بۆ خۆتان بخەون ! .

ئنجا ڕۆیشت.

لە کۆتاییدا ناچار بووم داوای لێبکەم ئەوەی ماوە تا بەیانی هەڵیبگرێ تا بتوانین نەختێک بخەوین پـێش ئـەوەی شـەوەکە کۆتـایی بێـت، بـەڵام چـەند دەقیقەیـەکی پێنەچوو، پێش ئەوەی :

- سڤن ، ئایا تۆ خەوتووی ؟

یەکسەر سەرم کێشایە ژێر بەتانییەوە.

- سڤن !

- بەڵێ ، ئەمجارەیان چییە ؟

- مارگریت دەڵێ چـەند خـولێکی تایبـەتی قوتابییانـەی یـەک سـاڵە دەکرێتـەوە بـۆ ئەوانەی سوپا بەجێ دێڵن کاتێک کە جەنگ بەسەردەچێ. ئایا هیچ شـتێک لـە بـارەی ئەمەوە دەزانی؟ سڤن ، خێراکەو دوایین جگەرە لەگەڵ منـدا بکێـشە ... ئایـا وای بـۆ ناچی کە مارگریت ...

- ئۆ ، بۆ خاتری خوا ! .

ئەو شەوە من بەتەواویی بە نیکۆتین ژەهراویی ببـووم. ئـەو هـەر سـاتێک نـا ساتێک لـەناو نوێنەکانییـەوە دەردەپـەڕی و دەهـات لەسـەر ڕۆخـی نوێنـەکانی مـن دادەنیشت و هەموو شتێکی ڕوون دەکردەوە کە خۆی و ئەو دەیانەوێ بیکـەن کاتێـک ئەم جەنگە گڵاوە بەسەر دەچێ.

# نەخۆشییەکی درێژ خایەنت بۆ دەخوازم

بەیانییەکی زووی ڕۆژێکی پێنجشەممەی مانگی دێسمبەری ساڵی ١٩٤٣ بوو کە بە ساغ لە قەڵەم درام و پێم ڕاگەیێنرا لە ڕۆژی شەممەدا دەبێ بڕۆم و بگەمەوە یەکە سەربازییەکەی خۆم.

کوڕەکەم، داخ بۆ ئەوە دەخۆم کە بە ناچاری ئەوەم کرد، بەحەق بوایە، دەبوو بەلای کەمەوە بۆ شەش حەفتەی دی لێرە بی، ئێستاش دەبێ لەمەودوا باشترین خۆراك بخۆیت. من نازانم تۆ لەوێ هەندەت بۆ خواردن دەست دەکەوێ، بەڵام دەبێ هەر کاتێ هەلت بۆ بڕەخسێ چەندی پێت دەکرێ بخۆیت. تۆ هەر تەنیا بەوەوە دەتوانی بارتەقای شەڕ بکەی کە چاك بخۆیت و، باشتریش کەمێك زیاتر لەوە.

سەرەك دکتۆران لە نەخۆشخانە لە تروسکاوس بەم جۆرە بوو. دکتۆرێکی باش بوو، نەخۆشخانەکەشی بەپێی سیستەمێك بەڕێوە دەبرد کە نەخۆشەکان دەبێ لەوێ بمێننەوە تا بەتەواویی چاك دەبن و کە چاکیش دەبوونەوە هەوڵیدەدا بیانوویان بۆ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی کەمێك زیاتر بیانهێڵێتەوە. ئێستاش، هەر چۆنێك بێت، لە دەسەڵاتە هەرە بەرزەکانەوە فەرمانی بۆ هاتووە کە بەلایەنی کەمەوە دەبێ لەسەدا پەنجای نەخۆشەکان بەساغ دابنرێن و بیانگەڕێننەوە بۆ یەکە سەربازییەکانیان. بەڵام، بەپێی ڕێنماییەکانیش ئەگەر یەکێك بەساغ دانراو کە چی وا نەبوو ئەوا دکتۆرەکە دادگایی سەربازیی دەکرێت. بۆ ئەوەی هەر تەنیا ئەوە پیشان بدەن کە چۆن لەسەرەوە موعجیزە جێبەجێ دەکەن، بڕوانامەیەکی ساخلەمیت پێدەدەن، مۆرێك و دادگاییێکی سەربازیی و — تەماشا بکە و تێفکرە — نەخۆشەکان بە ساغ و تەندروست

دادەنرێن. کە دەکرێ ئەم پیاوە " ساغانە " ببنە بارگرانییەکی کارەساتاوی بەسەر یەکە سەربازییەکانیان بەوەی کە پیاوەکانیان ناچار بکەن کە کاری نەخۆشەوانیی یا هەر کارێکی تر بکەن لە گەرمەی جەنگدا. ئەمە شتێك نەبوو کە بۆ هیچ یەك لەوانەی لە تۆبکەن ڕووبدات.
سەرەك دکتۆران کە خواحافیزیی لێکردم بەداخەوە سەری لەقاند.

که هاتم و دەنگوباسە ناخۆشەکەم بە بەربارا ڕاگەیاند دەستی بە گریان کرد. ئەوەندە لێدراوو خەفەتبار بووم کە هەستم بەهیچ پاڵنەرێك نەدەکرد بۆ هێورکردنەوەی. تاقیکردنەوەی هەر شتێکی ئەوەندە نادانی وەکو دڵدانەوەی ژنێکی دڵدار کە خۆت خۆشت بوێ دەبێتە هەڵەکردنێك. ئەمە بەلایەنی کەمەوە ئەو هەستە بوو کە لەو ساتەدا منی داگرت. من خۆم گرت بۆ ئەوەی بەتەواویی لەئارەزووە هەستییە دڕندەییەکاندا نقومی بکەم. دەرگاکە دانەخرابوو، بەڵام من وای بۆ دەچووم کە هیچ کام لە ئێمە تووشی ناڕەحەتی نەدەبوو ئەگەر تەواویی گەلی ئەڵمان بهاتانەتە ژوورەوە. ئێمە ڕاست بووین. گەل ئەوەندە زۆری لە ئێمە خواستووە — یان بەلانی کەمەوە ڕێگەیان داوە کە بەناوی ئەوەوە بکرێن — کە ئێمەش لە بەرامبەر ئەوەدا مافی ئەوەمان هەبێت شتێکی کەم داوا بکەین. ئێمە خۆشمان تەنیا هەر ئەوەمان داوا کردووە, بەڵام دەبێ ڕێگەشمان بدەن لەسەری بەردەوام بین و شتێك نییە لە کەسمان ستاند بێ. کاتێکیش ئەو بەپەلە ڕای کردە قاوشەکەوە بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانی، من بەڕاکشاویی لەسەر نوێنەکەی مامەوە، لەوێشدا جگەرەیەکم کێشاو بەهێمنییەوە بیرم لە ڕێ وشوێنی خۆم کردەوە.

لە ڕاستیدا هیچ شتێك نەبوو بیری لێ بکەمەوە، ئەوە نەبێ نیەتم هێنا فیلار بکەم، من ترسم لەم کردەوەیە نەبوو، هەروا لە ڕاستیدا ترسم لە گەڕانەوەش نەبوو، وام لێهاتبوو لە هیچ نەترسم، هەر تەنیا گیرۆدەی

بوغزوكينەيەكى ساردو سڕ و دڕندانەی ئەو شتە بووم كە هەموومان ڕقمان لێیەتی و كە لەژێر ناوە بلاوەكەی ((جەنگی پیس)) دایە، چیتر لە هیچ نەدەترسام، هەروا دەبوایە بچم و كارەساتەكان لە گۆشەی هێمنیی و بەدبەختییەكی بێباكانەوە سەیر بكەم، كە لە وێوە پیاو دەتوانێ بەدروستی تێبینی بكات.

جگەرەكەم بەنیوە كردبوو كە مارگرێت خۆی كوتایە ژوورەوە و بەهەنیسك هەنیسكەوە خۆی تێهەڵدایە سەر نوێنەكە بێ ئەوەی تێبینی من بكات. نامەیەكی لە دەست بوو.

كەواتە هۆگوستیك كوژراوە.

ئەمەم لەبەر خۆمەوە گوت و هەستم بە هیچ سەرسامییەك نەكرد. پێویستیم بەوە نەبوو نامەكە بخوێنمەوە. هۆگو مردبوو.

بەبێ دەنگییەوە، جگەرە و شقارتەم بۆ فڕێدا. مارگریت لە ترسانا ڕاچەنی.

– ئۆ ، ئەوە لێرەی ؟ ببورە، نەمدیتی.

گوتم ، ئەمە لە بیر كە، تا جلەكانم دەكەمە بەر دەرگاكە دابخە. دوو خولەكم پێدەچێت.

بەم جۆرە جلەكانم كردنە بەر، لە كاتێكدا مارگریت لەوێدا ڕاكشابوو، ئنجا دەرگاكەم كردەوە و نامەكەم خوێندەوە :-

بەرەی ڕۆژهەڵاتی جەنگ، نۆڤەمبەری ١٩٤٣

فیلد پۆست نەمەر

فیلد ویبل ویلی بیر

ئازیزەكەم خاتوو مارگریت شنیدەر ...

من وەکو دۆست و هەڤاڵێکی هۆگۆ ستیگ بۆت دەنووسم، بۆ ئەوەی هەواڵی دڵتەزێنی گلانی ئەوت پێڕابگەیەنم. ئەو ئەوەندە شتی خۆشی لە بابەت تۆوە بۆ گوتیمە، بۆیە من زۆر چاک لەوە دەگەم کە ئەم نامەیە چ خەمێکی ترسناکتان بۆ دێنێت. لەوانەشە بەهۆی زانینی چۆنیەتی ڕووداوەکە کەمێك دڵت ئاسوودە بێت.

بەیانییەکیان زوو کاتێك خۆمان و ئۆتۆمبێلە زرێپۆشەکەمان لە دەرەوە کاری دەورییەمان بەڕێوە دەبرد، لەپڕ تەقەمان لێکرا. گوللەیەك ڕاستەوخۆ لاجانگی دەزگیرانەکەتی پێکا و دەرحاڵ کوژرا. لە مردنیشدا هەمان ئەو زەردەخەنە جوانەی لەسەر لێو بوو کە هەیبوو. بۆیە دەبینین کە زەحمەتییەکی ئەوتۆی نەکێشا. ئێستاش، تۆ نابێ بێ ئومێد بی. تۆ گەنجیت و پێویستە بەڵێنم پێ بدەیت کە هەرچی زووە لە بیری بکەیت. بێگومان، ئێستاش ژیان گەلێك ڕۆژی درەوشاوە و پڕ لە خۆشیی بۆ تۆ تێدایە و، ژیرترین و تەنانەت ڕاسترین شت بۆ تۆ کە بیکەی - ڕەنگبێ لەم ساتەدا ئەم ئامۆژگارییەی منت پێخۆش نەبێت - ئەوەیە کە کوڕە لاوێك بدۆزیتەوە و ئەوەندەی ئێستا (هۆگۆ)ت خۆشدەوێت بکەویتە داوی خۆشەویستی ئەوەوە. بۆ خاتری خۆشەویستە پێکراوەکەت و برادەرەکەی منیش، مەگری، چونکە بەمە ئەو تەنیا خەفەتبار دەبێ ئەگەر هەستی پێ بکات. نەخێر، پێبکەنە و تەنیا بیر لەوە بکەوە کە ئەو چەند لێبوورد بوو. ئەمە نوشوستییێکە - مردووەکانمان چییان بەسەر دێ ئێمە نازانین، بەڵام ئەوە دەزانین کە ئەوان بەختەوەرن.
بەهەموو دڵمەوە من هاوسۆزتانم .

زۆر دڵسۆزتان

ویلی بیر

ئەو نامەیە، بەو سۆزە باوکانەیەی، چەند لە پیرەئان خۆی دەچوو. هەر هەمان پۆستە نامەیەکیشی بۆ من هێنا بوو.

ئازیزەکەم کوڕە گەورە،

سوپاس بۆ نامەکانت. بەیەکەوە پێنجیانمان پێگەیشت، بێ بەختانە ماوە تەنیا بۆ کاتێکی کورت هەیە، چونکە ئێمە خەریکی هەندێ ناپاکی چاکین. ئەگەر ڕووسەکان پەلامار نەدەن، ئەوا ئێمە دەیدەین.

ئاشتی لە ئارادا نییە. دۆزەخێکی تەواوە. هەرچییەکت پێدەکرێ بیکە بۆ ئەوەی درێژترین ماوە لە پاشەی بەرەی جەنگدا بمێنییەوە.

ستیگ کوژراوە و تیچ بێ سەروشوێنە، لە پەلاماردانێکدا بزربووە. هەرکە ئەوە ڕوویدا، نامەیەکم بۆ مارگریت نووسی و تیایدا پێم گوت گوللەیەك سەری پێکا – بەڵام تۆ دەزانی کە سەربازێکی تانك چۆن ئەم دۆڵی خەم و خەفەتە جێ دەهێڵێت. ستیگی قوڕ بەسەر هەردوو قاچەکانی سووتابوون. لە ماوەی ئەو دە دوازدە سەعاتەی کە تا مردنی خایاندی، گوێ لێگرتنی خۆش نەبوو، شتێکی سەیرە کە ئەمانە ئەم هێزو توانایە لە کوێ دەهێنن بۆ ئەوەندە هاوارکردنە. بەر لەوەی ئەم جەنگە بۆگەنە بەسەر بچێت لەوانەیە هەمووومان تێ بچین و، بەم جۆرە گەورە پیاوانی پارتی، جەنەڕاڵەکان و هەموو ئەوانەی کە خۆیان لەم جەنگە دوورخستەوە تاجەگوڵینەی سەرکەوتن و هەموو شتێکی تریش وەدەست دەهێنن.

ئێستا داوای ڕێپێوانمان لێدەکرێت، بۆیە، خۆشەویستم سڤن لە ڕیزەکانی پشتەوە لە نەخۆشخانەکەتدا بمێنەوە، بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە یەکێك لە جۆرە چاکەکان لە شوێنێك دا بێت کە بتوانێت لەوێوە هەڵی بەردەوام

بوونی ژیانی بۆ بڕەخسێت، ئەوەشت لەبیر نەچێت کە ئێمە بەڵێنمان بەیەك و دوو داوە کە کتێبێك لە بارەی تەواویی ئەم کردارە پیسەدا بنووسین.
بە سۆزترین سلاو لە ( پۆرتا و پلۆتۆ و پیرەئان )تانەوە.

ئەو دوایین ئێوارەیە (ئەقۆکات و کێك)مان خواردو بێتەل مۆسیقاییێکی خۆش و لەسەرخۆی لێدەدا. بەربارا دەستبەرداری کارەکەی کرابوو، بەڵام ئێمە نەمان هێشت ئاهەنگەکە لەدەست بچێت. لەدەرەوە ڕەشەبا هاشەی دەهات بارانیش بەترپەترپێکی توڕەوە بەر پەنجەرەکان دەکەوت. زەپ بەخەمبارییەوە تەماشاییێکی پەرداخەکەی کرد و گوتی :
– لە ئێوارەیەکی وادا من زۆر دڵخۆشم بە ئیفلیجیم. بیر لەوە بکەوە لە کەش و هەواییێکی وادا لەناو کەندەکدا بیت.
مارگریت بۆ نووستن سەرکەوتە لای ئەلیزابیت، بۆ ئەوەی من و بەربارا ئەو شەوە بەتەنیا بمێنینەوە. لە کاتێکدا مارگریت خۆی و کەل و پەلەکانی شەوییەوە خەریك بوو لە دەرگاکە بچێتە دەرەوە، باسکی لە ملم ئالاندو، بەچاوی بەفرمێسکەوە تێی ڕوانیم، بەبایەخەوە گوتی: " سڤن ، دەبێ لەوێ ئاگاداری خۆت بیت. هەروەها نابێ، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، پیرەئان بۆ باربارا بنووسێت.
پاشان ماچێکی کردم و بەسووکیی لە دەرگاکەوە بزربوو.
سبەینەی پاشتر من بەدلە بێزراو و پالتۆ بۆرە درێژەکەم داماڵین. جۆرکەکەم پڕی بوو لە شتی باش کە کچەکان تێیان ئاخنی بوو. دوو کێکی گەورە کە بەربارا خۆی دروستی کردبوون، دوو گۆزە مرەبا لەلایەن ئەلیزابێتەوە، گۆشتی دووکەڵکراو لەلایەن مارگریتەوە، قوتوویێك هەڵووژە لەلایەن زەپەوە. گریان قوڕگی گرتم و، وەکو هەر ئارەزوویێك لە دنیادا،

نەمدەتوانی هزری ئەوە بکەم کە چۆن قەت دەتوانم شتێك لەمانە بخۆم. دەمانچە سەربازییە قورسەکەی خۆمم لە قەد بەست، گازماسکەکەم بەسەر شانمدا شۆڕکردەوە و دوایین شتیش کڵاوە ڕەشە بچکۆلانەکەم خستە سەر سەرمەوە.
هەرسێ کچەکە لەگەڵمدا هاتن بۆ وێستگە. فرمێسکەکانی بارباران ماچ کرد.
– کچە جوانەکان، مەگرین، پێویستە پێبکەنن. لە یادتان بێت، بەپێداگرتنەوە لەسەری ڕۆیشتم، ئەمە ماڵئاوایی کردن نییە، بەڵکو تا بەیەك گەیشتنەوەیە.
– سڤن ، بەڵێنم پێ بدە کە ئاگاداری خۆت بیت.
کە زەنگەکە لێیدا هەرسێکیان ماچییان کردم، دوایین پاداشتی دۆستایەتی، هی خۆشەویستی.
خواحافیز، تروسکاوس ! خواحافیز، هۆ مێرگەکەم، خواحافیز، ئەی ژووره هێمنە خاوەن نوێنە پاك و فێنکەکان، خواحافیز ئەی ژنە خاوەن پرچە بریقەدارە بۆندارەکان.
نیوچەوانم بەشووشە ساردو سڕەکەی پەنجەرەی ژووروچکەکەوە ناو فرمێسك بەکوڵمەکانمدا هاتنە خوار.

که بینیم ئەوەنـدە گـۆڕاوە موچـرکێکی سـاردو سـڕ بـە دڵـم داهـات. پرچـی بەتـەواویی سـپی ببـوو، پێـستی زەرد هەڵگـەڕابوو، ئەڵقـەی ڕەش بـەدەوری چـاوە ماندووەکانیدا هاتبوون. لاوازو کووڕ ببووەوە، بەدلەکەی بەسـەریدا شـۆڕ ببـووەوە، زۆر گەورە ببوو، ئای پیرەئانە هەژارەکە !

پلۆتۆش هەمان شێوەی پیرەئانی هەبوو.

ڤۆن بارنگ لە هەردووکیانی دەکرد.

هەموویان بەم جۆرە بوون.

هەموویان ؟

ئەوەندەیان نەمابوون.

لە سەرەتادا کە پێکهێنراین ژمارەمان شەش هەزار پیاوی بەهێز بوو.

ئێستا تەنیا حەفتمان ماوین — حەفت پیاو.

# جەنگ بە پێی پلان بەردەوامە

تۆزێك دانیشتن تەماشای (کێکە)کەیان دەکرد، وەکو ئەوەی شتێکی بەرزو پیرۆز بێت، لە پاشان پۆرتا شەرمی وەلانا، بەلام پیرەئان بە کەوچك لەسەرە پەنجەکانی دا.

کێکەك کە لەلایەن کچانی ڕاستەقینەوە برژابێت، دەبێت بەڕێزو چەشەو هەستەوە بخورێت نەك بەپەنچەی پیسەوە.

بۆیە مێزێکی تایبەتیمان ڕازاندەوە، دوو خاولیمان کردن بەسەرمێزو سەرپۆشی لەگەنەکانمان کردن بە ئامان. نینۆکەکانمان شوشتن و پاکمان کردنەوەو پرچمان داهێنا، فلچەمان لە بەدلەکانمان دا

بووتەکانیشمان سڕینەوەو بەم جۆرە دوای بیست دەقیقە لە دەوری مێزەکەدا ڕوونیشتین و بەشێوەیەکی ڕەسمی کێکەکەی باربارامان خواردو (ئەڤۆکاتە)کەی مارگریتیشمان خواردەوە.

– خۆش بوو ؟

– بەڵێ ، زۆر خۆش بوو.

تەماشای یەکتریمان کرد. من سەیری دەم وچاوە چاوەڕێ کردووە لۆچاوییە گرژەکانیانم کرد، بەخۆمم گوت: ئێستاش دەبێ ئەوەی هەتە و نیەتت بیڵێی. ماوەیێك بیرم کردەوە بەر لەوەی دەست پێبکەم.

– جلکەکانیان خاوێنتر بوون لەهەر جلکێکی کە دیوتانە. کە بەسەر نوێنەکانتدا شۆڕ دەبوونەوە بۆ ڕێکخستنیان یان بۆ ڕاکێشانی ئەو چەرچەفەی لەژێرتدا قایم بوو، بۆنی کەتانی تازە ئوتوکراوی کەمێك نەشاستە لێدراوت بۆن دەکرد کە هەر تازە لە دۆلابی تایبەت بەکەتان هاتبوونە دەر. بەتەواویی دووربوون لە

بۆنی پیسیی و شێداریی، وەکو ئەوەی کەمێك سووتێنرابن. کاتێکیش کە کاریان تەواو دەبوو جلکە تایبەتەکانی خۆیانیان لەبەردەکرد ئەمانەش خاوێن بوون و بۆنی شتێکی ڕووناك و گەرم و لە هەمان کاتیشدا فێنکیان لێدەهات. پۆشاکییان هەبوو. پۆشاکێکی ئاوریشمی تەنکی شینم دیت کە وێنەی باڵندەی سپی و خاکیی لەسەر بوو. ئەم پۆشاکە قۆڵ کورت بوو، لەلای ملی چین چین خڕ ببووەوە بۆ ئەوەی قەد قەد بکەوێتە سەر مەمك و سەر پشتی. کاتێك کە قەیتانێکی سپی ئاوریشم ڕادەکێشی، پۆشاکەکە لەسەر شانەکانی دەترازێ، بەڵام ئەو کاتە ئەو دوو داوە ئاوریشمییەی سەر قۆڵە کورتەکانت لە بیر چووە. پۆشاکی ئاوا بوو، خۆشەویستەکەم.

مارگریتیش کە خۆشەویستی ستیگ بوو، چاك لە بیرمە پۆشاکێکی سووری گرداری لەبەر بوو لە قوماشێکی تەنکی خوری. وا بە لەشییەوە نووسا بوو دەتگوت ڕەنگە بەسەر لەشییەوە. وەکو گڕی ئاگر وابوو. کچێکی تریش هەبوو تەنوورەیەکی لەبەربوو بەسەر سمتەکانیدا شۆڕ ببووەوە، کاتێکیش کە وەردەچەرخا هەمیشە چارەکە سوورێك لەسەر پشتییەوە بوو. ئەو کچەی کە پۆشاکە ئاوریشمییە تەنکە شینەکەی لەبەر بوو. بەم جۆرە پێداچووم کە دەتگوت سروود خوێندنەوەیە، لە کاتێکدا چاوەکانم داخستبوون و تەرکیزم لەسەر دیتنی بەربارا کردبوو" ئەوەی کە هی من بوو، کاتێك کە ئەو قەیتانەت دەکردەوە و خۆشی کە هەردوو قەیتانە بچووکەکەی تری ڕادەکێشاو کە تۆش هەردوو قۆپچەکانت دەدۆزییەوەو لەگەڵ ئەو نێرو مێیەی لە تەنیشتەوە بوون، ئنجا کە دەتکردنەوە، ئەو کاتە تەواوی پۆشاکەکە وەکو شتێکی سووك و نەرم دەکەوتە خوارو، خۆشی لەوێدا لەناو بازنەیەکی شینی کاڵدا کە دەوری

پێیەکانی دابوو دەوەستا، کچەکان تەواو وەك جلەکانیان پاك و خاوێن بوون و بۆن گوڵاوێکی سەیریان لێدەهات.

- گوڵاو ؟

- بەڵێ، پۆرتا، با بۆتی ڕوون بکەمەوە، بۆ ئەوەی تۆو ئەوانی تریش لێی تێبگەن. کچەکان وەکو تفەنگی پێش نمایشکردن لە سەربازخانەدا خاوێن بوون. سەرو پرچیان وەکو ڕووباری دانوب لە شەوێکی زستاندا دەبریقایەوە، کاتێك تریفەی مانگ سەهۆڵی وەکو ملیۆنەها دانەی ئەڵماس دەتروسکاندەوە. لەش و لاریشیان بۆنی ئەو دارستانەی پشت (بەریفا)ی دەبەخشی لە بەیانییەکی بەهاردا یەکسەر دوای باران. ئەمانە تێدەگەن ؟

بۆ ماوەی چەند سەعاتێك لە بارەی ئەو دنیا خۆشەدا بۆیان دوام کە منی تێدا بوو، نەیانتوانی گوێ لە زیاتر بگرن.

پلۆتۆ گوتی: " شتێك هەیە ناتوانم بەدروستی لێی تێبگەم ،، چۆن کابرایەکی وەکو تۆ، کە وەکو میرێکی ڕۆژهەڵاتیی دەژیاو، کێك و مراوی برژاوی هەڵدەلوشی و ئارەقی فڕدەکرد و ئەو ژنانە بەپارووی بچووك باشترین خۆراکیان دەرخوارد دەدا، وا لاواز و باریکە وەکو تیرۆك ؟ "

بۆیە لەدواییدا ئەوەم پێڕاگەیاندن کە چۆن، پاش ئەوەی برینەکانم ساڕێژ بوون، من و، ستیگ و، زەپ و پیاوێکی دیکە هەندێك ئاومان بە سێ هەزار جگەرە کڕی و خواردمانەوە. دوو جۆر ئاوی ڕاستەقینە : یەکێك بە تایفۆئیدو ئەوی دیکەیان بە کۆلێرا. پرسیم " ئایا ستیگ پێی نەگوتی زۆر بەسەختیی نەخۆش کەوتین ؟ . زەپ تا ئێستاش لەناو قەد بەرەو ژێرەوە ئیفلیجە و، پیاوی چوارەمیش مرد. منیش بۆ ماوەی نۆزدە ڕۆژان بێهۆش کەوتم، پاش ئەوەش هیچم پێنەدەخورا. باربارا و کچە پۆلۆنییە بەرپرسی قاوشەکە بەزۆریی

خۆراکیان دەرخوارد دەدام. هەر جارەو یەك کەوچك، بۆ ماوەی چواردە ڕۆژ. پێنج جاران دکتۆر دەستی لێ شوشتم. دەرزی هەموو جۆرە دەرمانێکیان لێدام لەگەڵ خوێ ئاو و کلۆکۆز.

ئێستاکەش شەش حەفتە زووتر منیان وەدەرنا. هایل هتلەر ! "

– ئایا گۆریە و سوّلی بە پاشنەشیان هەبوو ؟

– پاشنەی فەرەنسی ؟ بەڵێ، ئەوانی تر سەریان ڕاوەشاندو بەنائومێدییەوە تەماشای یەکتریان کرد.

پۆرتا بەکورتی گوتی: " سڤن ، دەزانی هەموو جۆرە مۆڵەتێك وەستاوە، دەتگوت ئەم قسەیە شتێك ڕوون دەکاتەوە، شتێك کە من تێی نەدەگەیشتم.

گوتم : پۆرتا، شتێك هەیە من لێی تێناگەم.

– چییە ؟

– تەنیا ئەگەر بمزانیبایە، شتێکت لێ قەوماوە. نازانم چییە.

من وا دەبینم، تۆ تووشی گەلێك شتان هاتووی. تا ئەندازەیەك بۆنێکی بەهێزی ناپاکیی لەم هەرێمەدا هەیە. بەڵام تەنیا نابێ هەر ئەوەندە بێت بەڵکو دەبێ شتێکی زیاتر هەبێت. هەمان شتیش لەگەڵ بێرینگ دا بووە کاتێ من ڕاپۆرتی خۆم دا. بۆچی وشەیەکی ناپاکییم لە تۆ نەبیست، پۆرتا ؟.

سەیری منیان کرد. پاشان سەیری یەکتریان کرد، یان ڕاستتر، سەیری ئەملاو ئەو لای یەکتریان کرد، وەکو ئەو کردارەی کە مرۆڤ لەکاتی ناوهێنانی شتێکدا دەیکات کە نەوێرێت باسی لێوە بکات. کەش و هەوا لەو زنجە تاریك و ئەسپێونە نادروست و ترسناك هەڵگەڕا. پۆرتا هەستاو پشتی لە ئێمە کرد و ڕاوەستا، ڕووی لە پەنجەرەکە بوو.

بە ترسەوە گوتم : "پیرەئان، پێم بڵێ چی بووە ؟ دەڵێی لە پرسەی داپیرەت دانیشتووی. هەر دەڵێی مردووی".

لەناو هێنانی وشەی ((مردوو)) شتێك لە مێشكمدا تەقییەوە من كابرایێكی واهمە پەرست نیم و، ئەوەی لە مێشكمدا ڕوویدا بەلای كەمەوە شتێك نییە بەرجەستە بێت یان ڕوون نەكرێتەوە.

لەناكاو بۆم دەركەوت كە ئەوان مردوون، مردوون بێ ئەوەی هیچ هەستێكی نهێنیمان لەبارەیەوە هەبێت. ئەوان هیوا بڕ ببوون لەوەی كە جارێكی تر بەزیندوویی بگەڕێنەوە وڵاتەكەیان. ئەوان هەموو شتێكیان، تەنانەت ژیانی خۆشیان بەبێ ئومێد دانابوو. بۆ ئەوان گێڕانەوەكەی من دەبوایە لە بارەی شتێكەوە بێت كە ڕووی نەدابێت. خەونەكانیان لە بابەت بێهۆشییە گەورە، بەرزەكەیاندا وردوخاش بوو. ئەو شۆڕشەی كە دەبوایە لەكاتی گەیشتنیاندا بۆ وڵاتەكەیان ڕووبدات و، دەبوایە لە ماوەی چواردە ڕۆژی خوێناویدا بەكۆتا بێت، بووە گیاندارێكی خەیاڵاویی ترسناك، بووە پاپۆڕێكی تەماویی بەسەر دەریای ڕەشی مردنەوە. تەنیا لەنگەرگا پتەوەكەی پۆرتا لە ژیاندا، پەناگاكەی گەرمی كۆشی مێیینە، هەتا ئەمەش واتای خۆی لەدەست دا. ئەمەش مانای وا نییە كە ڕەفتاری پۆرتا كەمتر بێ ڕەوشت بووبێت، چونكە لە هەر كاتێكدا چاوی بەسمتێكی خڕ بكەوتایە مڵچەی لێوە دەهێنا و خۆی تووشی ڕیسوایی دەكرد. بەڵام هەروەك خۆی پاش چەند ڕۆژێك گوتی - تەنیا هەر لەگەڵ كچە جووتیارەكە بووە و وەسفی ئەو پێشكەوتنەی كردووە كە لە زیندە ڕەفتاریدا ڕووی داوە، كاتێ لەناكاو لە ناوەڕاستی ڕستەیەكدا وەستا و بەدەورووبەری خۆیدا سەیرێكی ئێمەی كرد :

- هەندێ جار وام بۆ دێت وەكو ئەوەی لەوێدا وەستابم و چاوەڕێی شتێك بكەم، ئێستا ئەمەم نەكرد. وەستام و لە پەنجەرەكەوە سەیرێكم كرد، لەكاتێكدا

هێر پۆرتا، لەوێدا بەنیعمەتی خودا پاڵ کەوتووەو خەریکی فێڵبازییە. ئەگەر تەنیا شتێکی دڵخۆشکەر هەبوو بێت کە لە پەنجەرەکەوە سەیر بکرێت : مەشقی تیپی ئاگر کوژانەوەیە، یان ئەگەر هتلەر نیوەی سمێڵی خۆی بتاشیبایە بەر لەوەی بچووبا وتارێك بخوێنێتەوە - بەڵام هیچ شتێك نەبوو بۆ سەیرکردن و هەتا ئەگەر هەشبوایە، ئەوا من هەر لەجێی خۆم نەدەجوولام. دیارە، بێگومان ئێوەش وەکو من تێناگەن، بەڵام ئەمە گرنگ نییە.

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە هەوڵی ئەوە دابووم ئەم قەناعەتە ترسناکە وەلا بنێم کە ئەوان مرۆڤی مردوون، چونکە نەمدەتوانی زۆر بەباشیی گفتوگۆیان لەمەڕ ئەمەدا لەگەڵ بکەم. پاشان ڕۆژێکیان بەڕاشکاویی لێم پرسین کە ئایا ئەوەی من هەستی پێدەکەم هەر تەنیا هزرکردنە یان ئایا ئەوان بەڕاستی ئەوەندە شکست خواردوو بوون وەکو من دەیانبینم، هەر چەندە ئێمە بەڕواڵەت کاتی خۆمان تەنانەت وەکو پێشوو بەسەر دەبرد.

پیرەئان گوتی: " لە ڕاستیدا من ناتوانم چۆن وەڵامت بدەمەوە ".

پۆرتا گوتی: " هەموو مۆڵەتێك وەستاوە ".

- لە فەوجێکدا کە ژمارەی پیاوانی لەکاتی دامەزرانیدا لە ١٩٤٣دا شەش هەزار کەس بوو، حەفت کەسی لێمایەوە. ئنجا بەپەنجەکانی ژماردنی: " ئۆبەرست فۆن لیندناو، ئۆبەرست لێفتنانت هنکا، هۆپتمان فۆن بارنگ، لەگەڵ ئەندامە بەشەڕەفەکانی ئەم سرییەیە. خوا گەورەیە، بەڵام لیستی زیانەکان گەورەترە".

- سوپاس بۆ خوا، دەست بەباڵتانەوە بگرێت !

- ئامین.

بەهاوارێکی توندەوە گوتم: " لە کاتێکدا بەترسەوە لە قوڵایی سگمەوە هەناسەیەکم هەڵکێشا " بەڵام نابێ ئەو کتێبە بێ ئومێد بکەن کە بەڵێنمان بەیەکتری دابوو بینووسین ".

تەماشای منیان کرد، نیگام بەهەراسانییەوە بەسەرییاندا ڕەتی کرد، ئەوان منیان نەناسی، یان ڕاستتر ئەوان منیان باشتر لەخۆم دەناسی و قوڵترین و هێمنترین سۆزیان بۆمن هەبوو، چونکە تا ئێستاش ئاواتی گێلانەم بەهزردا هەڵزناوە و دڵێکی ئارەزوومەندی شکستەم هەیە کە با و زریان بەسەریدا هەڵی دەکرد.

پۆرتا خەریکی لێك بەستنی شمشاڵەکەی بوو، گوتی: " کە کتێبەکەمان نووسی، سڵاوم بەهەموو کچەکان ڕابگەیەنن. هیچ کەسێك نابێ لە خوێندنەوەیدا بێزار ببێ، چونکە ئێوە ناتوانن کتێبە گشتییە گرانبەهاکان کە لە بارەی مس سویچ بۆردی بچکۆڵانە و کوڕە نازاکەی سەرۆك نین لە ژوورێکی دەبڵدا پێشکەش بکەن. یان کچەکە پەرستارە و ئەویش سەرۆکی نەشتەرگەرانە. بەڵام، لەهەر بارێکدا، هیچ یەك لە کەسایەتییەکان نابێ حەقیر بێت. هەروەکو گوتم، ئێوە قەت بە کتێبەکەی ئێمە ساماندار نابن. خەڵکیی تەنیا هەر گوێ نادەنێ. بۆیە تۆ دەبێ دەستت بخەیتە گیرفانی خۆتەوە کاتێ لەسەر حیسابی ئێمە زۆر دەخۆیتەوە لەو ڕۆژەی کە تەواوی دەکەیت.

ئـا لەم بارودۆخەدا جەژنی کریسمسی ١٩٤٣ هاتوو، ئێمە هەوڵماندا ئەوەندەی پێمـان دەکـرێ شـادی بـەخش کـەین. درەختـە کـاژێکی بـچکۆڵەمان لـە سـندووقە تەقەمەنییەکی بەتاڵدا ڕواند.

# پرۆپاگەندەی سۆڤییەت لە بەرەکانی جەنگدا

ئەو پرۆپاگەندەی لەو دیوەوە بۆمان دەهات لە جۆری هەڵبەستنیدا خەیالاویی بوو. هەندێك جار چیرۆکی وا ترسناکیان بۆ دەهانین کە هیچ مرۆڤێکی ئاسایی باوەڕی پێ نەدەکرد، بەلام هیچ یەك لە ئێمە ئاسایی نەبوو، بۆیە ئەوانیش قەت لە ئامانجی خۆیاندا شکستیان نەدەهێنا. ئێمەیان تووشی سەرسوڕمان دەکرد، لەو بارودۆخەماندا بە گومان و بە داڕمان دەیان ئاخنین. بارودۆخە ناشایستەکەی ئێمە و ڕووسە پرۆپاگەندە هەڵبەستەکان دەیانتوانی ئەنجامێکی باش وەدەست بهێنن. مەبەستم لەوەدا ئەو هەموو پیادانە نییە کە هەلاتنە ئەو دیوو خۆیان وەکو زیندانیی بەدەستەوەدا – هەندێك جار یەکەیەکی سەربازیی بەتەواویی بە سەرکردایەتی دەرەجەدارەکانیان بۆی دەردەچوون. ئەوانە حیسابیان بۆ دەکرا. ئەوەندەی پەیوەندی بەزۆربەی ئێمەوە هەبوو، بەرزەفتی پرووسیی و پرۆپاگەندەی گۆبلزیی دەربارەی ترسەکانی بارودۆخ لە یەکیەتی سۆڤییەت بینا قاقایان گرتبووین و، تەنانەت بەبێ ئەوەش، ئەو هەستپێکردنە کەمە بەربلاوەی کە ئێستاش لە بیرمانە ئەوەی پێ دەگوتین کە، بە لەبەر چاوگرتنی ئەو شێوازەی سوپای ئەڵمان بەکاری هێنا بۆ تێکدان و وێرانکردنی وڵاتی ڕووسیا، بە دەگمەن دەتوانین چاوەڕێی ئەوەبین کە بەو باوەشە گەرمەوە پێشوازیمان لێ بکەن وەکو ئەوەی بڵند گۆیە نەوازشکەرەکانی ناو خەندەك هەولیان دەدا قەناعەتمان پێ بهێنن کە بارودۆخەکە وا دەبێ. ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە کە پرۆپاگەندەی ڕووسەکان کاریگەرییەکی ئیفلج کەریان بەسەر ئەو کەسانەوە هەبوو کە پێیان پەسەند بوو

لەو شوێنە بمێننەوە کە لێی بوون. پڕۆپاگەندەکە عەقڵ و هۆشی ئێمەی ونجڕو ماندوو کردبوو.

بەزۆری ڕووسەکان بەڵگەی کاریگەرو مەوزوعی وایان بەکار دەهێنا کە بە عەقڵەوە دەلکا، هەرچەند زۆرت بەخۆت و بەئەوانی تر بگوتبایە : پڕۆپاگەندە ! پڕۆپاگەندە بوو، بەڵام چاك دروست کرابوو – ئەوان بەڵگەی خۆیان هەبوو – بڵند گۆیە ڕووسییەکان دەیان بۆڕاند :

– هاوڕێیانی ئەڵمان ! بپەڕنەوە لای برادەرە ڕووسەکانتان ! بۆچی لەوێ ڕاکشاون و لە سەرما دەقرسێن، وەرن بۆ لای ئێمە نوێنی گەرم و ژووری خۆش وەربگرن. ژنی جوان چاودێریتان دەکەن نەبادا شتێکتان پێویست بێ. ئەو ڕۆژییەی پێتان دەدرێت سێ ئەوەندەی ئەوەیە کە نازییەکان پێتانی دەدەن. ئێستاش گریفریتەر فریبورگ دێتە سەر مایکرۆفۆن وپێتان دەڵێت ئەوەی ئێمە گوتمان ڕاستە.

ئەو، ماوەی دوو ساڵە لەگەڵ ئێمە دایە. ئەو سەردانی هەموو کامپەکانی زیندانییانی جەنگی کردووە لای ئێمە و بۆی دەرکەوتووە کە بەلایەنی کەمەوە وەکو ئەو کەمپانە نین کە ئێوە بەهزرتاندا دێت. کەمپەکانی ئێمە لە هۆتێلی گەورە یان لە کامپی پشوودان دان و بەزۆریش دوو پیاو و دوو ژن لە ژوورێك دان. بەڵام ئەوەتا گریفریتەر فریبورگ قسەتان بۆ دەکات، بۆیە دەتوانن خۆتان گوێی لێ ڕابگرن.

پاش ماوەیەکی کەم دەنگێکی بەهێز گرمەی هات :

– هەلۆ ، هاوڕێیانی فەوجی بیست و حەفتەمی زرێپۆش من گریفریتەر جۆرجن فریبورگم لەفەوجی ٣٠٩ یەمی نارنجۆك هاوێژ. لە ٢٠ی مایسی ساڵی ١٩١٦ لە لایبزگ لە دایك بووم و لەئەدلەرسترەس ٧ لە درسدن ژیاوم. لەوەتی ئابی ١٩٤١ من زیندانیم لای ڕووسەکان و ئەم ماوەیە زۆر خۆش بوو.

من نزیکەی لە هەموو کەمپەکانی ڕووسیا بەسەرم بردووەو، هەموو شتێکی کە دڵ حەز بکا هەمان بووە.

پاشان بۆ ماوەی یەك کاتژمێر باسی ئەو بەهەشتەی کرد کە تیا بووە. لە نێوان شتی تردا لیستی خۆراکی حەفتەیەکی خوێندەوە کە ئەمانەی لەخۆ دەگرت، کاڤیار، ڕۆستی بەراز، گۆشت قازو کۆتر. لە باسکردنی ئەم جۆرە خۆراکانەدا دەممان ئاوی تێدەزا.

ئێوارەیەکیان شاشەییەکی گەورەیان بەسەر سەنگەری خەندەکەکەیانەوە دامەزراندو دەستیان کرد بە نمایشکردنی فلیمێك کە زۆر لە ئێمەی بەتەواویی بێزارو دێوانە کرد. دیلە ئەڵمانەکانی جەنگمان دیتن لە ساڵۆنێکی جوان دانیشتبوون. بە شوێن جووتێك لەو دیلانەدا کەوتین هەر لە ساتی بە دیل گرتنیانەوە. بینیمانن وەکو شازادە لە ژووری نایابدا چاودێری دەکران، لەو ژوورانەدا مێزی گەورە بەکۆمەڵێك خۆراکی شکۆدار داپۆشرابوون کە لە هەموو سووچێکی بینراوو زۆر لە نزیکەوە وێنەیان گیرابوو. زۆر لە ئێمە بێ ئەوەی پێی بزانین کە ئەو وێنانە پیشان دەدران، لەوێدا دانیشتبووین ملچە ملچمان لێوە دەهات و من لەو باوەڕە دابووم کە ئەگەر بەردەوام بوونایە لەپیشاندانی وێنەی ئەو خۆراکانە ئەوا تەواویی فەوجی بیست و حەفتەمی زرێپۆش هێرشیان دەبردە سەر شاشەکە.

نمایشەکەی تر لە ژوورێکی ڕازاوە پیشاندرا کە جێ خەفێکی گەورەی تیا بوو. کیژۆڵەیەکی جوانکیلە لەسەرخۆ لەبەردەم سەربازێکی ئەڵمانیداخۆی ڕووت کردەوە. پارچە لەدوای پارچە جلەکانی دادەماڵین، لەبەردەم سەربازەکەدا خۆی بادەدا، کە بەتەواویی ڕووت بوو، سەربازەکەشی ڕووت کردەوە و ئنجا جەلسەیەکی خەلاعی بەدوا داهات کە لە شەهوەت پەرستیدا بێ هاوتا بوو. خامۆشییەك باڵی بەسەر هێڵەکانی ئەڵماندا کێشا. زۆریان بەدەنگی نزم ئاهو

ئۆفیان دەکێشا بیّ ئەوەی پێی بزانن. گویّ لێگرتنیان کارێکی ترسناك بوو.
هاوارمان کرد ،، براڤۆ ، براڤۆ ، ڕووسەکان، دووبارەی کەنەوە بۆمان. دووبارە !
دووبارە !.
هاوارمان کرد و بەئاوازەوە چەپڵەمان لێدا.
پاشان بڵند گۆیەکە نەڕاندی و ئێمەش بێدەنگ بووین :
- هاوڕێیان. خۆتان بۆ مەبەستێك بە کوشت مەدەن کە هی خۆتان نییە، با ڕێگرە (SS)ەکان وپاڵەوانە ئینگلیزەکانی ساڵۆنەکانی پێشوازیکردن کە لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا ژیانیان بەخۆشی دەبەنە سەر، با ئەوان بۆ هتلەرو دارو دەستەی بجەنگن، ئێوە ئەی سەربازە کۆنەکانی سوپای تایبەتی ئەڵمان حەیفە ئەم کارە بەدە ئەنجام دەدەن. وەرن، بپەڕنەوە لای ئێمە، ئەوانەی کە دەیانەویّ پەیوەندی بەسوپای سوورەوە بکەن و لەپێناو مافەکانیان بجەنگن، هەمان پلە و پایەیان پیّ دەدرێت کە ئێستا هەیانە، بەڵام بۆ ئەمە دەبیّ هەر ئێستا بێن !.
هەندیّ جاری تریش، ڕاستەوخۆو بەبیّ درێژە پێدان ڕوونیان دەکردەوە کە چۆن هتلەر هەموو بەڵێنە جوانەکانی خۆی شکاندووە. یاخود دکتۆرێکی ڕووس پێی ڕاگەیاندین چۆن خۆمان وەك نەخۆش کەوتوو پیشان بدەین یان خۆمان بەڕاستی تووشی نەخۆشی بکەین.
- هاوڕێینە، چەکەکانتان فڕیّ بدەن و بپەڕنەوە لای ئێمە ! بەردەوام بوونتان لەسەر جەنگ کردن گەمژەییە. نابینن چۆن لەلایەن ئەم نازییە خوێڕییانەوە لە کەلك خراون ؟ ئایا نازانن کە سێیەکی ڤێرماختی ئەڵمان بۆ چوارەمین ساڵە لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا ژیان بەخۆشی دەبەنە سەر، خۆراکی باش دەخۆن، کە چی ئێوە برسی و سەرما بردەن ؟ سێیەکی دووەمیش لە ئەڵمانیایە لەگەڵ کچەکانتان دەخەون، کە چی ئێوەی سێیەکی دوایی، لێرە لە نیشتمانی هاوڕیّ ڕووسەکانتاندا، هەژاریی و نەداریی دەچێژن.

هاوارمان کرد " گوێ بگرن !. خوودەکانیشمان وەکو ڕەزامەندییەکی بەئاووتاو لەگەڵ ئەو جۆرە دەربڕینە ڕاستەقینەیە تێهەڵدایە هەوا.

لەشکرێکی تەواوی ساکسۆنی، بە سەرکردایەتی کۆلۆنێلەکەی پەڕییەوە ئەو بەر. فەوجێکی یەدەکی تۆرنگیش لە کەرتەکەی تەنیشتمانەوە بەهەموو ئەفسەرەکانییەوە بۆی دەرچوون.

زۆر جاریش وادەبوو کە فیلارە ڕووسەکان دەپەڕینەوە لای ئێمە و بەدیلگیراوە ئەڵمانەکانیش دەگەڕانەوە وەکو چۆن جارێك لە جاران من وام کرد. بێگومان ئەوانە هیچیان نە لە بارەی هۆتێلە نایابەکانەوە و نە لە بارەی سەیرانگا شکۆدارەکانەوە پێبوو کە بیگێڕنەوە. زۆربەیان وەکو خۆم تووشی زەحمەتیی ببوون : لە هەندێ کامپدا بەناسکیی مامەڵەیان لەگەڵدا کرابوو، لە هەندێکی تردا بەتوندیی، لە هەندێ شوێنیشدا ڕووسەکان زۆر بەپەرۆش بوون بۆ زانینی ئامانجی پڕۆپاگەندەکەیان و قەناعەت پێهێنانی دیلەکانی جەنگ بە میسالییات و سەرەتاکانی سۆشیالیزم. لە شوێنی تریشدا بەهیچ شێوەیەك ئەمەیان نە دەکرد و، دیسان لە هەندێك شوێندا بەتەواوی نامرۆڤانە بوون و زۆر جاریش بەئارەزوویەکی تەواو دەرك پێکراو بۆ تۆڵەسەندن نامرۆڤانەییەکەیان بەهێز دەکرد، کە من ئەوە لە خۆمدا نابینم تا خۆمی پێ تاوانبار بکەم. بۆ نموونە، ئەو شێوازەی کە ڕووسەکانی پێ دەکوژرا کاتێك کە پیاوانی (SS) دەکەوتنە کار لە هەموو وەسف و هۆیەك بەدەربوو، بۆیە کە بەرەبەیانی تۆڵە کردنەوە لە نازییە شکست خواردووەکان هەڵات، سەرکەوتووە زۆر بەئەزموونەکان داوای تۆڵە کردنەوەیان کرد بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ئازار خواردەو ڕەنج دیدەکان. من ئەو باسە بۆ ئەوە ناکەم کە پاساو بهێنمەوە یان تراژیدیاییێك بڕازێنمەوە یان شتێك تەئویل بکەم، بەڵکو بۆ ئەوە باسم کرد کە

نیشانی بدەم دۆزینەوەی بەڵگە بۆ ئەو شتەی لە ڕووی جوانی دەربڕینەوە پێی دەگۆترێ ((بارودۆخی ڕووسیی)) کارێکی زەحمەت نییە – بەڵام لەگەڵ ئەو جۆرە بەڵگەیەدا دەتوانیت ئەوە بسەلمێنیت کە بارودۆخی ڕووسیی لە هەموو وڵاتێکدا بڵاودەبێتەوە کە لە جەنگدا بێت.

هەندێ جار شتی وا ڕووی دەدا کە لەبەر سەرسامیی تووشی زارە بەشکە دەبووین. بۆ نموونە، لە یەکێك لە هێرشەکاندا ژمارەیەك گەنجی تەمەن شازدە ساڵ و حەڤدە ساڵیی ئێمە بەدیل گیران. هەر بۆ ڕۆژی پاشتر ڕووسەکان ئەوانیان بۆ ناردینەوە، بەڵام قاچی پانتۆڵەکانی ئەوانیان بڕیبوو بۆ ئەوەی وەکو شۆرتی لێبکەن. لەسەر پشتی یەك لەوانە ئەم تێبینییە بەدەرزیلە قایم کرابوو :

سوپای سوور لەگەڵ منداڵاندا ناجەنگێت، لەبەرئەوە ئێمە ئەوانەتان بۆ دەنێرینەوە و داواتان لێدەکەین بیان نێرنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان بۆ لای دایکەکانیان، تا شیرپێدانیان تەواو دەبێت.

سڵاو لە سوپای سوورەوە

یان لێقەومانەکەی پیرە ئەنتیرۆفیزەرەکە :

لە سرییەی ژمارە ٣ دا کابراییکی پیریان لابوو کە ئەنتیرۆفیزەر بوو. ڕۆژێکیان تەلەگرافێکی پێگەیشت کە تیایدا هاتبوو ژنەکەی و سێ منداڵەکەی لە هێرشێکی ئاسمانیدا بۆ سەر بەرلین کوژران. هەر یەکسەر کابرا چووە لای سەکردەی سرییەکەی و داوای مۆڵەتی لێکرد، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە سەرکردەی سرییەکەی ئەوەی پێی کرا کردی داواکارییەکەی پشتگوێ خرا.

بەهۆی تووڕەیی و نائومێدییەوە ئەنتیرۆفیزەرە پیرەکە فیلاری کرد، بەڵام هاوکات لەگەڵ سەرسوڕمانی ئێمە ڕۆژی پاشتر گەڕایەوە. پێی گوتین کە خودی

فەرماندەی ئەو فیرقە (تیپە) ڕووسییەی کە لە کەرتی بەرامبەرمان مۆڵەتی پێداوە. وامان زانی کابرا شێت بووە، بەڵام بۆ سەرسامیی ئێمە کابرا نامەیەکی داخراوی بۆ کۆلۆنێلەکەمان و سێیەکێک کاغەزی مۆڵەتی ڕووسیی پێ بوو، کە بەتەواویی پڕ کرابوونەوە و ئیمزا کرابوون، بۆ ماوەی چواردە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژانی سەفەرکردن و گەڕانەوە لە بەرلین، ڕووسەکان تەنانەت کاتی دروستی شەمەندەفەرەکانیان پڕ کردبۆوە کە سەفەری پێدەکردن. لە پاشان ڤۆن بارینگ ناوەڕۆکی نامەکەی پێگوتم کە بۆ ئۆبەرست ڤۆن لیندناو نووسرا بوو، دەقی نامەکە بەم جۆرە بوو :-

خۆشەویستم ئۆبەرست ...

ئێمە بێ غایەت سەرسامین لەوەی کە کاروباری سوپای ئەڵمان بەجۆرێکی وا تیکچووە کە ناتوانن تەنانەت مۆڵەت بە ئەنتیرۆفیزەرەکی هەژار بدەن، یەکێکی وەکو ئەوەی کە، هەموو شتێکی لە دەست چووە. هەر چۆنێك بێت، سوپای سوور چواردە ڕۆژ مۆڵەت بەدیلەکەی خۆی دەدات و لە هەمان کاتیشدا بەتەواویی بەڕەڵلای دەکات.

من ترسم لەوەیە کە ئێوە، ئۆبەرست ڤۆن لیندیناو، لەوانەیە ئێستاکە سزای ئەم ئەنتیرۆفیزەرە بدەن بەهۆی دۆستایەتی کردنی لەگەڵ دوژمندا، بەڵام من پێشنیاز دەکەم کە ئەمجارەیان چاو بپۆشن لەوەی کە ڕوویدا هەلی پێبدەن کە بە مۆڵەت بچێتەوە ماڵ. من، خۆم وای بۆ دەچم کە ئەو سزای خۆی وەرگرت بەوەی کە لەکاتی هێرشە ئاسمانییەکەی سەر بەرلیندا هەموو شتێکی لە دەست دا.

ستیپان کۆنستانتینۆڤچ ڕادۆن

لیفتنانت جەنەڕاڵ

فەرماندەی فیرقەی ٦١ی پیادە لە سوپای سوور

ئەم نامەیە و کاغەزەکانی مۆڵەتە ڕووسییەکە ڕەوانە کران بۆ فەرماندەی فیرقەکەمان جەنەراڵ لیفتنانت ڤۆن ڕێچتنێگل بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر کارێکی وا نائاسایی بدات وەکو کاری ئەو ئەنتیرۆفیزەرەی کە پەڕییەوە لای دوژمن و بەئاسانی مۆڵەتەکەی پێ ببەخشرێت. لە چەند ڕۆژی پاشتر دا تەواویی فەوجی بیست و حەفتەمی زرێپۆش بەپەرۆشەوە چاوەڕێی ئەنجامیان دەکرد. ڕووسەکان بەردەوام بەبڵند گۆیەکەیان پرسیاری ئەوەیان دەکرد کە ئایا پیاوەکە مۆڵەتی پێدراوەو هەموو جارێکیش ئێمە بە (نا) وەڵاممان دەدایەوە. گرەو لەسەر ئەم مۆڵەتە کرابوو. زۆربەمان وای بۆ دەچووین کە ئەم پیاوە گوللە باران دەکرێت. ئەوان تەنها سووڕ بوون لەسەر سزادانی. ئەمەش نابێ جێبەجێ نەکرێ بەبێ دووبارە نووسینەوەی تەواویی دەستووراتی سەربازیی.

لە دواییدا گومانەکەمان ڕەوییەوە. کابرا مۆڵەتەکەی پێ بەخشراو بە سێ ڕۆژ گرتنی توند حوکم درا لەبەر بەجێ هێشتنی پۆستی خۆی بێ ئیزن وەرگرتن. ئەمەش کاتێك جێبەجێ دەکرێت کە لەمۆڵەتەکەی دەگەڕێتەوە.

ڕووسەکان، هۆی بەهێزتریان هەبوو بۆ پڕۆپاگەندە کردن. بۆ نموونە شتیان هەبوو پێیان دەگوتن (نامەی ڕادیۆیی) ئەمانە بەشانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕیی دەستیان پێدەکرد لەسەر پڕۆگرامی بێتەلێکی ئەڵمانیی، کە تا ڕادەیەك خراپ بوو، ئنجا دوای ئەمە پڕۆگرامی داواکراو دەهات. دەنگی قسەکەرێکی چاك ڕاهێنراو دەیگوت :

– ئێستا گوێتان لە ئاهەنگێکی داواکراوی مۆسیقا دەبێت بەجۆرەها ئامێر. لە پێشا ئاوازێك لەسەر ئامێرە سووکەکان.

بەم جۆرە کۆمەڵێك ڕەشاش و هاوەنی سووك دەستیان بە ئاگرباران کرد و سەنگەری خەندەکەکانی ئێمەیان تێکشکاندن و گڵ و خۆڵیان بە دەوری گوێچکەکانماندا پەڕاند

ئێستاش، گوێگرانی هێژا، گوێتان لە (فانتازیا)*یێك دەبێت لەسەر ئامێری ستالین ئەوەندەی پێنەچوو دەتگوت دونیا بەرەو نەمان دەچێت. گوللە مووشەکە ئەعساب تێکشکێنەرەکانی ئامێرە بەناوبانگەکە بە لوورە لوورەوە بەسەرماندا دەهاتن و بەگرمەی گوێ کەڕکەرەوە دەتەقینەوە.

جا بۆ کۆتاییێکی شاد ئێمە تێکەڵەیەکمان هەڵبژارد لە هەموو ئامێرەکانی ناوسیمفۆنیا ئۆرکێسترا گەورە و چاك ڕاهێنراوەکەمان.

ئۆە ! لەو دەنگە پێکەنین ئاوەرە پڕ گۆیە !

تەواویی ناوچەکە لە ماوەی ئەو گەردە لوولەدا کە لە پاشان بەسەرماندا باری لە ترساندا هاتە لەرزین. کاتێك لە ترساندا خۆمان شۆڕ کردەوە، هەر یەکێکمان چاوی لە پیاوەکەی تەنیشتی بوو، ئامادە بۆ ئەوەی هەر ساتێ نیشانەی ئەوەی تیادا دەرکەوت کە بووەتە قوربانیی دێوانەییێکی کاتیی لە ئەنجامی ترسی تۆپ باراندا، لەناوی ببات. گەلێك یەکەی جیاوازی خۆبەخشەری ڕووسیی لەناو سوپای ئەڵماندا هەبوون. وەکو خائینەکانی فیرقە بەدناوەکەی جەنەراڵ ڤلاسۆڤ، هەندێ فەوجی (کۆزاك)یش هەبوون کە ڕووسەکانیان دەکەوتە دەست تەواو وەکو شەیتان وابوون. هەر چۆنێکیش بێت، ترسناکتریان، بەتالیۆنێکی ژنان بوو. ئەم جەردانە وا ڕاهاتبوون کە جل و بەرگی دیلەکانیان داماڵن و لە مێزێك یان لە جێخەوێکیان ببەستنەوە ئنجا ئەو هەژارە کلۆڵانە بووروژێنن تا بەخۆشیی و ناخۆشیی ئامادەبن بۆ تێرکردنی غەریزە سێکسییە ئاژەڵییەکەی ئەوانی تر. کۆتاییە ئاساییەکەی

* فانتازیا : جۆرە ئاوازێکی مۆسیقایە کە خۆی لە کۆت و داوی شێوەی لاسایی کەرەوە ڕزگار کرد.

ئەم داوێن پیسییە بەوە دەهات یان ئەندامی نێرینەی قوربانییەکەیان ببڕن و لە دەمی بئاخنن یانیش بە چەکوچ گونەکانی بهاڕن. ئەم دیمەنەی دواییەیان جارێکیان لەلایەن پۆرتاوە بینرا بوو، ئەو دیتنەش بووە هۆکاری ئەوەی کە هەر ئەو شەوە بەتفەنگە قەناسەکەی سەرو گوللە بدات لەسەری حەفت لەو ژنانە.

ڕووسەکان کە پەیوەندییان بەهەر یەك لەو کۆزاکانە دەکرد یا بەرتیلیان پێدەدا، بەدراوی خۆیان دەیان دا. ترسناکترین جۆری سادیزم وەکو دۆمەڵان گەشەی کردو بڵاو بووەوە. هەروەها، هەندێ ئۆکرانیش هەبوون کە لە بەتالیۆنی سەربەخۆدا ناونووس کرابوون و هەندێکی تریشیان بەشێوەی تاك چووبوونە ناو فەوجە ئەڵمانییەکان و بەهیوی (هیلفزولگ) دەناسران و، بەتێکرا تا جەنگ لە کۆتاییە حەتمییەکەی کە بۆ ئەوان ترسناك بوو، نزیك دەبووەوە، ئەوان نائومێد ترو بێ هیواتر دەبوون. ئەوان لە بێ قەناعەتییەوە بێ یان لە نەزانینەوە گرەویان دۆڕاندبوو، زانینی ئەم ڕاستیەش بە تواناترین کەسی ئەوانی شێت دەکرد.

بەشێوەیەکی ئاسایی وا دەبوو هەندێك لەو فیلارە ڕووسانە لە دیسیپلینی ئەڵمانی بێزار دەبوون و ڕایان دەکردەوە لای ڕووسەکان. لە پاشاندا چییان لێ بەسەردەهات، قەت ئەوەمان نەدەزانی. لەوانەیە بەتاوانی خیانەتی گەورە لە سێدارە دەدران. پاشان ڕووسەکان کۆتاییەکی لەناکاو و بنەبڕیان بۆ ئەم هاتوچۆیە دانا. هەموو فیلارە ڕووس و ئۆکرانییەکانیان بۆ لای ئێمە گەڕاندەوە بە بیانووی هەڵفڕاندنیان بەسەر هێڵەکانی ئەڵمان و لەوێش فڕێدانیان بۆ دەرەوە. گیرفانی سەر سنگی هەر یەکێك لەوانە زەرفێکی زەردی ڕاژەی تێدا بوو لەگەڵ تێبینییەکی تەحویل کردن :

یەکەی پۆلیسی سەربازی ژمارە ١٧٤ بەپێی ئەم بەڵگەنامەیە (SS)ی خۆبەخشەر بۆریس بترۆفچ ترگۆیسکی لەدایکبووی ١٨ی ئاداری ١٩١٩ لە تفلیس، دەنێرێتەوە.
ناوبراو لە ٢٧ی دیسەمبەری ١٩٤٣ لە لێبل لە بەتالیۆنی ١٨ی (SS) فیلاری کردووە و لەلایەن فەوجی تفەنگداری ١٩٢ی سوپای سوورەوە گیرابوو.
ئەم فیلارە لەلایەن لیفتنانت بارۆبج، فرۆکەوانی هێزی ئاسمانی سوپای سوورەوە گەڕانراوەتەوە بۆ سوپای ئەڵمان.

## پسوولەی وەرگرتن

بەپێی ئەم بەڵگەنامەیە داندەنرێت بە وەرگرتنی فیلارکردوو:-
پلەکەی :
ناوی :
یەکەکەی :
داواش دەکرێت کە پسوولەی وەرگرتنەکە دوای تەواوکردنی بەزووترین کات بگەڕێنرێتەوە بۆ نزیکترین یەکەی سوپای سوور.

ئەم جۆرە دڕندەتییانە کاریگەرییەکی سەرسوڕمێنیان بەسەر مرۆڤەوە هەیە. ماوەیەکی درێژ کەوتمە بارێکی سەیرو بێزارکەری داڕمانەوە. ئەوەندەی نەمابوو باوەڕو بۆچوونی هەڤاڵانم تووشی منیش بێت لەوەدا کە ئێمە تیاچووین و کە هیچ شتێکیش گرنگ نییە مادام هەموو پیاوان شەیتان و شەڕاوین بەبێ جیاوازی.
هاوپێتمان ڤۆن بارنگ دەستی بەخواردنەوە کرد.

تەنیا ڕەشاشەکان لابران. لە جووتیارەکەوە گەیشتینە ڕاستیی و لیمان پرسی بۆ خاتری خـوا تانکەکـە چـۆن چـووەتە نـاو عـەمباری دانەوێلەکـەی. ئـەو بەخۆشـییەوە کاغەزێکی پیشان داین کە بە ئەڵمانی لەسەری نووسرا بوو :

" ئێمەی تاقمی تانکەکە، ئەم سندووقە تەنەکەمان فرۆشتە پیتەر ئەلیکـساندرۆ ویـچ بە مانگایەک، هەردووکیان لە بارودۆخێکی باشدا بوون ".

هایل هتلەر

ماچێک لەسەر ____ " ئەندامە خۆشەویستەکەی پارتی"

لـە زۆربـەی زۆری کێڵگـەکانی ئۆکرانیـا گـەورە یـان بـچووک دەتوانیـت ئۆتۆمبێلێکی یان کامیۆنێکی ئەڵمانی لە هەر جۆرێک بێت بدۆزێتەوە.

## کشانەوە لە کییڤ

ئەو بیانوەی دایان ئەوەبوو کە (ئەنتەرستۆرم فۆهەر)ێکی (SS) هەر لە دەرەوەی گوندەکەدا کوژرا. وەك ورياكردنەوەيەك بۆ ئەوانی تر فەرماندەی (SS) فەرمانی دا هەموو ژن و پیاوێکی تەمەن نێوان چواردە ساڵيی و شەست ساڵیی لە سێدارە بدرێن. ئەمانە خرانە ناو دوو لۆری کە پشتاو پشت گەڕانەوە بۆ بن هەندێك سێدارە. پەتك خرایە گەردنیان و ئنجا لۆرییەکان بۆی دەرچوون.

ناڕەزاییەکی توندو ئاشکرا لەناو ڕیزی سەربازەکاندا هەستا کاتێك بە بەردەمیاندا ڕەت بووین. پیاوانی (SS) بە تووڕەییەوە تێمان ڕامان و چەکەکانیان قایمتر گرت، لە کاتێکدا ئەفسەرەکانمان بۆ پێشەوە پاڵیاندایین بۆ ئەوەی لە پێکداادان دوورمان بخەنەوە.

ململانێی نێوان سوپا و پیاوانی (SS) گەیشتبووە ڕادەی ئەوەی ببێتە ململانێییەکی ئاشکرا. هاملەر هەموو ئەو هەوڵانەی تێکشکاندبوو کە بۆ خوڵقاندنی بزووتنەوەیەکی ژێر زەمینیی دژی ڕژێم درابوو. خۆی سەگی پاسەوانی ئەو ڕژێمە بوو بەڵام بەبێ ئامانج، چونکە ئەو دوژمنی خۆی دەست نیشان نەکردبوو.

لــە ڕاستیــشدا ئــەو، دوژمنــە ناڕاســتەقینەکانی هــاڕی بــوون. دوژمنــە ڕاســتەقینەکە – کــە دیــارە بەشــێوەیەکی ئاســایی خــۆی ئەمــە نازانێــت – ئــەو چەکی تیرۆرکردنە بوو کە پێی وابوو وەکو چۆن پێی چاکە وای بەکار دێنێت. ئەمەش، لە ڕاستیدا بەتەواوی بەبێ پلان بەکارهات و لە دواییشدا بووە خراپە بۆی. هەر ئەوەش بوو، بەرهەڵستی ئەڵمانەکانی ورووژاندو تا بوو بەبزاڤێکی ژێر زەمینیی، کە ڕووداوەکانی تا ئێستا نەنووسراون و قەتیش نانووسرێن، چونکە هیچ تۆمارگەیەك نییە. بزاڤێکی ڕێك و پێك نەبوو، بەڵام لەوێدا هەبوو، هەر بەهەمان شێوازی نائاشکراو ڕەنگبێ بەهەمان ڕێکەوت وەك ئەوەی کاتێ میری خوێڕیمان لە ناوبرد.

کە چووینە ناو کیـیف ، ڕووسەکان نیوەی شاریان داگیرکردبوو. لەناو شاردا بەسەر چەند گروپێکی شەڕ دابەش کراین کە بەناو شەقامەکاندا پەرت بوون. من بەتانکەکەمەوە بە گرم و هوّڕ بەتەواویی لە دوو تانکەکانی پۆرتا و پیرەئانــەوە دەخــشیم. بــەناو (وسدوچنۆســـکیە) ڕەت بــووین ئنجــا لــەمێڵێکی شــەمەندەفەڕ پەڕینــەوەو، بەشــەقامی (دژاکـــۆوا) شــۆڕبووینەوە کــە هــەموو خانووەکانی لەلایەن ئەڵمانەکانەوە داگیر کرابوو، ئنجا ڕوومان بەرەو (پــاقۆلۆ) وەرچەرخاند کە دەکەوتە لای باکوری شارەکە، بەناو تەسکە شەقام و کۆڵانــدا ڕەت بووین و پاشان هەر کە ڕۆژ بووەوە گەیشتینە کۆنە کارگەیەك.

لە گۆڕەپانە گەورەکەدا هــەژدە تــانکی جۆری T٣٤ و پێنج (KW٢٥)مان دۆزینــەوە کە بەتەنیشت یەکەوە ڕیزیان بەستبوو لە کاتێکدا تاقمەکانیان بۆ بانگکردن لەبەردەم تانکەکاندا نمایشیان دەکرد. دەرکەوتنی لە ناکاوی هەر سێ تانکەکەی ئێمە لە دووریی بیست یاردەوە ئەوانی شپرزەکرد.

من ئەنتیرۆفیزەرە ناشارەزاکەی خۆمانم ڕاکێشاو لە ئامێرەکانی بینینەوە دوورم خستەوەو، گڕهاوێژ و ڕەشاش و تفەنگەکان پێکەوە دایانە گرمە. تاقمە نمایشکەرەکە وەکو بلّقی سەرئاو توایەوەو، لە ماوەیەکی کورتدا هەموو تانکە ڕووسییەکان گڕیان گرت. پاش ئەمە هەتا هێزمان تێدابوو بەناو دوو لاشەقامدا شۆڕبووینەوە و تووشمان بوو بەتووشی کۆمەڵە پیادەیەك و لە پێشا بەبەکارهێنانی گڕهاوێژەکانمان و ئنجا ڕەشاشەکانمان لێیان دەربازبووین، هەر لەو کاتەشدا زنجیری پۆلاّیینی تانکەکانمان کەوتنە گیانی ئەو ژمارە کەمە دەربازبووەی کە مابوونەوە.

بەردەوام بووین، هەرچی دەهاتە پێشمان وردو خاشمان دەکرد. لەناکاو گرمەیەك هات و تانکەکەی پیرەئان بەزنجیری شکاوەوە وەستا. بەهەموو خێراییمەوە بەدەوری خۆمدا سووڕامەوەو بەگرم و هۆڕەوە بەلا شەقامێکدا شۆڕبوومەوە بۆ ئەوەی بگەمە پاشەی تۆپە دژە تانکەکەی ڕووسەکان. ئەم تۆپە و تاقمە هەشت نەفەرییەکەیم بە ئاسانی لەکارخست، بەلاّم ئەوان توانیبوویان بەتەواویی ئاگر لە تانکەکەی پیرەئان بەردەن و دووانیش لە تاقمەکەی بکوژن. پیرەئان هاتە ناو تانکەکەی ئێمە و، دووانەکەی تریش چوونە ناو تانکەکەی پۆرتاوە.

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە وامان بەسەربرد. ماندوو بوون و، بێزاریی و گرژیی بەردەوام ئێمەی گەیاندە لێواری شێت بوون، کە گەڕاینەوەش زانیمان کە سرییەی ژمارە (٥) هەموو تانکەکانی خۆی لە دەست داون و (ئۆبەرست ڤۆن لیندناو)یش بە سووتان مردبوو.
کییف دەسووتا.

هیچ شتێکی جەنگ لە پێکدادانی ناو شەقامەکان مێشك ماندووکەرتر و دژوارتر نییە. لەڕاستیدا پیاو قەت نازانێت ڕووبەڕووی چی دەبێتەوە. کاتێك کە لە دەرگاییێکەوە بۆ دەرگاییێکی تر دەردەپەڕێت، هەندێك جار لەناکاو خۆت دەخزێنیتە پەنای ستوونێکی چیمەنتۆیی کارەبا، چونکە شتی لوورەکردە و، فیکەکردە و گرمەکردەت لە خانووەکانەوە تێدەگیرێت.

زۆر جاری وا دەبوو خانوویەکمان بەجێدەهێشت چونکە لە ژێرماندا دەڕما، بۆیە لە سێ چوار نهۆم دەکەوتینە خوارەوە، شەڕی دڕندانەی دەستەویەخەمان دەکرد، چەقۆ و بێڵمان بەکاردەهێنا و بەردەوامیش شارەکە دەسووتا، هەمیشە گڕی ئاگر و گرموهۆڕ دەورەمانی گرتبوو، خەڵکیش لەسەرما ڕەق دەبوونەوە چونکە پلەکانی گەرمیی ٤٠ – ٥٠ پلەی سەدیی لەژێر سفرەوە بوون، پردە ئاسنینە گەورەکەی سەر ڕووباری دنیپەر تەقێنرایەوە و تەنیا پارچە ئاسنی لوول خواردوو مابوونەوە لە ناو ئاوەکەوە دەرپەڕیبوون. شانازیی شارەکە، وێستگەی بێتەلەکەی بەجەمسەرە ئاسنینەکانی بەخشکردنییەوە، ببووە کەڵەکێك ئاسنی تێکشکاو و کێبڵی لوول خواردوو. لە کوشتارگە گەورەکەدا هەزاران لاشە بەئەسید تەڕ کرابوون. سەدان تۆن تۆوی گوڵەبەڕۆژە و ڕۆنی گەنمەشامی بەبەنزین پیس کرابوون و گڕیان تێبەر درابوو. دوکانە گەڕیدە گەورەکان وەکو گۆڕستانی فیلیان لێهاتبوو.

لەکاتی کشانەوەدا ڕق و کینەمان بەرامبەر بە پیاوانی (SS) تەقییەوە و دەرگای دەربڕینی بۆ والا بوو کاروبار گەیشتە ڕادەیەك کە هیچ یەکەیەکی (SS) زاتی ئەوە نەکات لەکاتی پەلاماردا بجووڵێتەوە ئەگەر یەکەکانی ئاسایی سوپا لە پشتییانەوە بێت. بەردەوام وا دەبوو ڕووسەکان و ئەڵمانەکان هەر

یەکەو لەلایەکەی خۆیەوە لە شەقامێکدا کە یەکتریان ئاگرباران دەکرد و یەکەیەکی (SS) لەو کاتەدا بەو شەقامەدا بەهێمنیی دەخشی، پێکدادانەکەیان دەوەستاند بۆ ئەوەی ڕێگا بەئەڵمانەکان بدەن تا هێزەکەی (SS) تارومار بکەن. هەر کاتێکیش ئەمەیان چارەسەر دەکرد شەڕەکە دەستی پێدەکرایەوە. بەیانییەکی زوو، کەمێك پێش بەرەبەیان، گەیشتینە ناوچەیەك لە نزیك (بێردتچەڤ) کە لەوێ هەندێ شت خەریك بوو ڕوو بدەن. لە وێنەی فەوجەکەی ئێمە، فەوجێکی تری پیادەی یەدەك لەوێ بوو. بە لە دەستدانی تانکەکانمان ئێمەش وەکو پیادە بەکاردەهاتین.

ئێمەی سەر بە فەوجی (٢٧)ەمین هەر یەکسەر بەرەو زەوی بێلایەن خشین کە شوێنی هەمیشەیی ئێمە بووە. پەناگەی تەسکی یەك نەفەرییمان بۆ خۆمان لێدا، کە لە وێدا دەمانتوانی بەبێ ترس پاڵکەوین لە کاتێکدا تانکە ڕووسییەکان بەبەردەممماندا دەڕۆیشتن، بیرۆکەکە وا بوو هەرکە تانکەکان ڕەت دەبن ئەو کاتە هێزی پیادە بەکاربهێنین و بە ڕەشاش و، گرهاوێژەکانمان و، بە چەکە بەردەستەکانی شەڕی نزیك، بە سونگی و بێڵ بە دوایان بکەوین.

لە سەنگەرەکانی پشتمانەوە نارنجۆك هاوێژەکانمان کەوتنە بەر بۆمبارانێکی توندەوە. سەعات دوای سەعات تێپەڕی و شەڕە تۆپ تا دەهات توندتر دەبوو، ئنجا لە کاتژمێر سێدا وەستانێکی لەناکاو و کورت ڕوویدا و دیواربەندی ئاگری تۆپخانە گواسترایەوە بۆ پشت هێڵەکانی بەرەی جەنگ و تۆپ بارانەکە بە گڕوتینێکی بروسك ئاسا دەستی پێکردەوە.

ئـەو دیمەنـەی کـە ئێـستا دێتـەوە بـەر چـاوە ترسـاوەکانمان لـە لـە هۆشخۆچوونمان نزیك دەکاتەوە. بەناو ئەو تەمومژە نزمەدا ڕەوە گەلی تانکی T٣٤ بە گرمەگرم بەپیرمانەوە دەهاتن و، لە پشتیانەوە ژمارەیەکی زۆری پیادە بە سونگییە ئامادەکانیان دەرکەوتن.

لـەناکاو نـاو پەناگاکـەم تاریك داهـات و هەنـدێ خـۆڵیش بەسـەرمدا پـژا. ئارەقەیـەکی سـارد لەنێوچاوانم هـەڵقولا و ئـەژنۆکانم دەسـتیان بـە لـەرزین کـرد. دووبارە تانکێك لەسەرەوە بەسەرمدا ڕۆیشت و هەرکە ئەو ئاوابوو یەکێکی تر پەیدا بوو.

پاشـان ڕەشاشـەکانمان بـە یـاوەریی لەگـەڵ ڕمبـەی تۆپـەکان دەسـتیان پێکـرد. ئەمـەش ئـەوەی دەگەیانـد کـە لەگـەڵ نـارنجۆك هاوێـژ و تۆپـە دژە تانکەکانمان تووشی پێکدادان بوونە.

من نەمدەوێرا سەرم لـە کونەکەوە بهێنمـە دەرو تەماشـایێك بکـەم نـەبادا T٣٤ یـك بێـت و سـەرم بپـەڕێنی، بـەڵام کاتێـك ڕەشاشـی کونەکـەی تەنیـشتم دەستی بەتەقەکردن کرد ئەو کاتە خۆم قیت کردەوە.

لـە دووریـی پـەنجا یاردەیـەك ڕەشاشـێکی قورسـی ڕووسـیم لـە شـوێنی ڕاسـتەقینەدا دیـت کـە دوازدە سـەرباز بـە دەوریيـەوە ڕاکـشابوون. لـە مـاوەی ساتێکدا گڕهاوێژەکەی خۆمم ئاڕاستەی کرد و ماشەکەیم (تەقێنەرەکەیم) پاڵدا، هەرکە گڕە سوورەکەیان تێگیرا ڕمبەیەکی گەورە هـات. دووانیـان لە زەوییـەوە بەرز بوونـەوە و دووبارە کەوتنـەوە سـەر زەوی، بەتونـدیی گڕیـان گـرت. پاشـان منـیش کەوتمـە ژێـر ئاگربارانـەوە لـە ڕەشاشـێکی تـرەوە کـە کـەمێك لـەلای ڕاستمەوە بوو، بۆیە بەخێرایی خۆم تێڕوکرد و گڕهاوێژەکەم ڕاگرت.

بە وریاییەوە لوولەی گرهاوێژەکەم لەسەر لێواری پەناگەکەی خۆم دانا، پریسکۆپەکەی خۆمم بۆ نیشانە گرتن بەکارهێنا و تەقێنەرەکەم پاڵدا. ڕەشاشەکە بێدەنگ بوو.

پاشان شەپۆلی تری تانکەکان هات و ئەمجارەیان خراپتر بوو، چونکە دەیانزانی ئێمە لەناو کونەکانین لە پەناگە. شێوازی شەڕی ڕووبەڕوو لە نێوان سەربازی پیادە و تانکی حەفتا تۆنی بەم جۆرەیە : سەربازی پیادە ئازایانە بەپێی فەرمانەکان، لە کونە پەناگەکەی خۆیدا دەردەپەڕێت و، لەلای پێشەوە پەلاماری تانکەکە دەدات و خۆی تێهەڵدەداتە سەر سینەی تانکەکە و بەخێرایی بە دەستێك خۆی بەقولابە گەورەکەی ڕاکێشانەوە دەگرێت، بەدەستەکەی تریشییەوە بۆمبێکی موگناتی دەگرێت.

کۆششی سەختم بۆ خۆ بڵندکردنە سەر ئەو تانکە زلەی کە بەهەموو خێراییەوە بەرەو پێش دەچوو وای لێکردم خڵتانی ئارەقە بم. خۆشبەختانە بۆ یەکێکی وەکو من، تاقمی T٣٤ لە نیوە تیرەی دە پێ دوور لە تانکەکەیانەوە ناتوانن هیچ شتێك بەدی بکەن. زۆر جاران ئەوەندەی نەدەما تێهەڵدرێم. دەستەکانم شەق ببوون و خوێنیان لێدەهات و نینۆکەکانیشم شکابوون، بەڵام سەربازی ئازا هەستایەوە و بۆمبەکەی بەو کەمەرە پۆڵاییینەوە نووساند کە بەدەوری بەشی دواوەی بورجەکە دەسووڕێتەوە. ئنجا پەتکی ڕەهاکردنی ڕاکێشاو، خۆی هەڵدایە خوارێ و لە کونی پەناگەکەدا خزی، کە دەرزەنێك نارنجۆك هاوێژی تێدابوون لەگەڵ ڕەشاشێك. پاش پێنج چرکە گرمەیەکی گەورە لەتانکەکەوە هەستا، تانکەکە وەستاو لمووزی لەناو کونی پەناگەیەکدا بوو، تەواویی تاقمەکەی دەرحاڵ بەهۆی تەقینەوەی بۆمبە مەگناتیسییە بەهێزەکە کوژران. کە (ت٣٤)ەکەی تر بە گرمە گرمەوە هات سەربازە ئازایەکە

یەکێك لەو مینانەی هەڵگرتەوە کە نارنجۆك هاوێژەکان پێیان بوو، بەرێکیی خۆی بە تانکەکەوە هەڵواسی، چەند نینۆکێکی تری شکان، ئەم جۆرە شتە تا رادەیەك دەبێتە شتێکی رۆتین. رۆتینەکە چەند کاریگەر بوو، تەنیا کاتێك زانیم کە پارچەیەك لە بورجی تانکەکە کێرڤێکی لەهەوادا دروست کردو لە دووریی یەك پێ لەمنەوە بە شرقەیەکی گەورەوە کەوتە خوار. قورساییەکەی لە نیو تۆن کەمتر نەبوو.

تۆپخانە دژە – تانکەکانمان هەموو تانکەکانی دوژمنیان بەرەو دوا گەڕاندنەوە، بە مین و بۆمبای مەگناتی بە دوایان کەوتن ئنجا تۆپە ڕووسییەکان کەوتنە کارو، نارنجۆك هاوێژەکان و هەموو سەربازە تازەکانی فەوجی (٢٧)ەمین هۆشیان لەسەر نەما. بۆی دەرپەڕین و بە ڕاکردنێکی سەرسامانە بەهەموو لایەکدا ڕایانکرد. هەتا ئێمەی سەربازە کۆنەکانیش پەتاکەمان لێگرتنەوە و چاومان لەوان کرد. هەر یەکسەریش سەربازە پیادە ڕووسەکان دەستیان بە ڕاوەدوونانمان کردو وەك گەردەلوول بە دوامان کەوتن، دڕندانە هاواریان دەکرد " یورای ستالینۆ ! یورای ستالینۆ ! "

سەرگوردێکی بە تەمەن ویستی بمان وەستێنێت و ناچارمان بکات ڕووبەڕووی ڕووسەکان بینەوە، بەڵام دەمانچە ئۆتۆماتیکییەکەی لێ سەنراو کەوتە ژێر پێی سەربازە زەندەق چووەکان و مرد. ئەوەی ئێمەی لەناکاو گەڕاندەوە هۆش خۆمان و وای لێکردین بوەستین نازانم چی بوو، بەڵام بەهەر حاڵ وەستاین و، دەستەو یەخە لەگەڵ ڕووسەکاندا کەوتینە جەنگ کردن. من بە هەردوو دەستەکانم تفەنگی مەنگۆلییەکم گرت و هەوڵی ئەوەم دا لێی بستێنم. وەك دوو دڕندە قەپاڵمان لەیەك داو نەڕاندمان، چونکە دەمانزانی

یەکێکمان دەبێ بمرێت. لەژێر کاریگەرییەتی هارییەکی شێتانە، تفەنگەکەم لێ ستاندو بروسک ئاسا سونگییەکەم لە پشتی چەقاند. بە بۆڕژنەوە دەماودەم کەوت، تفەنگەکەی لە دەست کردمەوە. بۆیە دەبوایە پێم بخەمە سەری بۆ ئەوەی سونگییەکە بکێشمە دەرەوە. کە لە سۆنگییەکەم ڕەهاکرد، هێرشم برد، وەکو گا لە بۆڕژنم دەداو وەکو شێت هاوارم دەکرد، سونگییەکەم بەئاسۆیی لە پێش خۆم هەڵگرتبوو، بەتاوێکی وا پەلاماری سەربازێکی ڕووسیم دا کە سونگییەکە لە پشتی دەرچوو، بەدەمی کراوەوە هاواری کرد. هیچ شتێك نەبوو جگە لەو بۆڕژن و هاوارکردنانە نەبێت، هەموو هاواری ئاژەڵانەو، دەم و چاوی تێك قوپاو.

لەناکاو خوێن لە دەمارەکانم مەیی، بە زارە بەشکەوە چاوم بڕییە ئاسمان کە لێشاوێکی خەستی مووشەکی لوورەکردەی ورشەدار خۆیان و کلکە گڕدارەکانیان لە پشتیانەوە بەرەو لای ئێمە هاتن کە لە هەموو گیانە بەدکارەکانی دۆزەخ خراپتر دەیان هاڕاند. هاوارێکی وا ترسناك کە هەستم دەکرد لەسەرخۆ هەموو دەمارێکی لەشم ڕادەکێشێ. هەریەکەمان خۆی بەزەوییەوە نووساندو بەترسێکی بێ وێنە دەمان لووراند، لێدراوو تێ هەڵدراو، ئەمە ئامێری ستالین بوو ترسناکترین ئامێری زەمانە.

پاش سیی و شەش سەعات شەڕکردن، هێرشی ڕووسەکان لاوازبوو و دامرکایەوە، ئەنجامی دواییش ئەوەبوو کە هەردوولامان ئێمە و ڕووسەکان کشاینەوە بۆ شوێنەکانی بەراییمان. پاشان شەڕە تۆپێکی گەورە قەوما، گەردەلوولێك کە بۆ ماوەی شەش ڕۆژ و شەش شەو بەردەوام بوو، گەلێکیش بەهۆیەوە عەقڵییان لە دەست دا. بەماوەی دوو سەعات دارستانێکی بچووك

لەگەڵ زەویدا خشت کرا، بۆیە بەتەواوی شتێك نەبوو ئەوە پیشان بدات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو شوێنە دارستان بووە. لەناو پەناگەکانماندا دانیشتین و بەچاوە کزە خوێنتێزاوەکانمانەوە لە ئاسمان ڕامایین. ئاخافتن مەحاڵ بوو، چونکە نەتدەتوانی وا لە دراوسێکەت بکەیت گوێی لێت بێت، هەتا ئەگەر بە هەموو دەنگتەوە لە بۆڕژنت بدابایە.

دیمەنی پۆرتا و پیرەئان بوو کە منیان لە شێتبوون ڕزگارکرد، ئەوەندە بەس بوو کە تەماشای ئەوان بکەم وا بەهێمنیی دانیشتوون بێ ئەوەی بکەونە بەر کاریگەرییەتی ئەو دۆزەخە گوێ کەڕکەرە تەقیوە بۆ ئەوەی منیش هێور ببمەوە. پیرەئان پفی لە پایپەکەی دەکرد و پۆرتاش بلوێرەکەی لێدەدا، ستالینی پشیلەش لە کۆشیدا خۆی وێك هێنابۆوە. هیچ یەکێکمان، تەنانەت خودی پۆرتاش، گوێی لەیەك نۆتەی بلوێرلێدانەکەی خۆی نەبوو، بەڵام ئەو بە جەختکردنێکی نزمەوە بەردەوام بوو لەسەر لێدان بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو هەراوهۆریایە. لەوانەیە ئەو پلەیەکی وای لە گۆشەگیرییدا وەدەست خستبێت کە بتوانی بەڕاستیی گوێی لەوە بێت کە لێیدەدا.

پێش نیوەڕۆی چوارەمین ڕۆژ ڤۆن بارینگ لە پەناگاکەماندا پەیدا بوو. لەجاران زۆر نەخۆشتر دیار بوو، پیرەئان پێی ڕاگەیاندین کە بەدەست دێزانترییەکی مەرگئاوەرەوە دەناڵێنێت و بەشی زۆری ڕۆژیشی بەدانیشتن بەسەر دەبرد و پانتۆڵیشی بەدەوری ئەژنۆیەوە بوو، هەروەها گورچیلەکانیشی تووشی نەخۆشی ببوون. هەموو دیاردەکان وایان دەردەخست کە زۆر ناژیت.

فۆن بارینگ کاغەزێکی دایە پیرەئان ئەمەی لەسەر نووسرابوو:"پێویستە خۆراک بۆ سەربازەکان بێنین. من چوار دەستەم بۆ هێنانی خۆراک ناردووە، بەڵام نەگەڕاونەتەوە. دەکرێ تۆو هەردوو هاورێیەکەت هەوڵێك بدەن ؟ پێویستە خواردنەکە ئامادە بکەین. ئێوە هەر سێکتان دوا ئاواتی منن.

تەماشای یەکتری و تەماشای فۆن بارینگمان کرد، کە لەوێدا بە ماندوویی دانیشتبوو، سەری لەناو دەستەکانی دانابوو. پیرەئان شانەکانی هەڵتەکاندو بەسەری ڕەزامەندیی پیشان دا. ئەو، ڕاپۆرتێکی بۆ جێبەجێکردن پێدرابوو، بنکەی فەرماندەیی ئێمەشی ئاگادار کردبووەوە کە تەلەفۆنەکەمان گوللەی بەرکەوتووە و پارچە پارچە بووە.

ئەوی دیتمان دیمەنێکی لە وەسف بەدەر بوو، کاتێ، خۆمان و پەقرەجەکانی خۆراک کە لە کۆڵمان بەسترابوون خۆمان تێهەڵدایە ناو خەندەکە تێکشکاوەکەوە، کە لە دیمەنێکی سروشتیی زیوینی بە گاسن کێڵرا و دەچوو، بارانێکی بەردەوامی ئاگر و ئاسن لە ئاسمانی تاریکەوە دەباری. هەورەکان نزم بوون و هەڕەشەیان دەکرد. پیرەئان بە پەشۆکاوییەوە سەری لەقاند. پۆرتاش بێباکانە بەسەری ڕەزامەندی نیشان دا و ئنجا لە خەندەکەکەوە دەرچووین.

شەش سەعات و نیوی خایاند تا لە پشتێنەی تۆپخانە دەربازمان بوو کە پانییەکەی چوار کیلۆمەتر بوو، هەروەها حەفت سەعاتیشمان پێ چوو تا خۆمان و پەقرەجە پڕ لە خۆراکەکان گەڕاینەوە. خواردنەکەش بریتی بوو لە گۆشت بەرازو نۆك.

ئێمە خۆمان لە چێشتخانەی مەیداندا خواردمان، ئەوەندەمان خوارد، ئەوەندەمان خوارد تا تەنانەت چێشتلێنەرەکانیش سەرسام بوون. پۆرتا پارچە گۆشتێکی کوڵاوی، زۆر گەرمی لەهەر یەك لە گیرفانەکانی پانتۆڵەکەی ئاخنی، تێبینی ئەوەی کرد کە ئێمە دەبێ بیر لە ئێوارەش بکەینەوە. کە پەقرەجەکانمان کردنەوە کۆڵ زۆر قورس بوون. پۆرتا ستالینی خستە ناو ئەو گیرفانەی کە لە دیوی دەرەوەی پاڵتۆکەی دروستی کردبوو، ئەویش بۆ خۆی لەوێدا دانیشتبوو سەیری دەکرد، پشیلەیەکی سوور بەخۆی و شەپقەی سەرییەوە.

* * *    * * *    * * *

من لە قوڵایی ژێر زەمینیشدا جەنگیم. ڕووسەکان لەژێر جێیەکانمان دەستیان بەلەغەم لێدان کرد. ئەگەر گوێمان لەسەر زەوی پەناگەکانمان دابنابایە، گوێمان لە تەپە تەپی گولینکەکانیان دەبوو کە لەوێدا لەخوارەوە ئیشیان دەکرد. هەڵکەندنی زەوی بۆ ئەوەی بیانگەینێ، کوشتنی لەغەم لێدەرەکانیان و سەرەو ژێرکردنی جێی ڕووسەکان لەباتیان ببووە ئەرکی ئێمە.
ئێمە لە گەلەرییەکدا ڕاکشابووین و لەوێوە گوێمان لە ڕووسەکان دەبوو کاریان دەکرد : تەپ، تەپ، تەپ.
لەناکاو خامۆشییەك ڕووی دا، گوێمان گرت، هەموو هەستەوەرەکانمان تا ئەو پەڕ گرژبوونەوە. ئایا ئەوان تەواو بوون و، دەبێ ئێمە لە ماوەیەکی کورتدا گوێمان لە گرمەیەکی خەفەکراو نەبێت، کە بەدوایەوە زەوی بەسەرماندا دەڕمێت ؟

بۆ ماوەی یەك چارەك گوێمان گرت، ئەمەش ماوەیەکی درێژە بۆ دانیشتن و گویٚ هەڵخستن بۆ هاوارێك کە نەکرێت، کاتێ بەپێچەوانەوە بێدەنگییەکی تەواو هەبێت.

ماوەی یەك کاتژمێر گوێمان گرت.

پاشان تەپە تەپەکان دووبارە دەستیان پێکردەوە، دەتگوت هەلێکی تازەی ژیانمان بۆ ڕەخسا. گوێم لێبوو پیرەئان لە پشتمەوە هەناسەیەکی قووڵی فەرەحنایی هەڵکێشا.

خۆمان ئامادەکرد بۆ کارکردن.

پیرەئان بەنەرمییەوە بەگوێی گەنج و ناشارەزایەکاندا چرپاندی :

– لەبیرتان بێت، ئەگەر چەقۆتان ڕاوەشاند قەت لە نێوان پەراسووەکانیان مەدەن، چەقۆیەکە لەوێ گیر دەبێت، لە ملیان یان لە ورگیان بدەن، چاکیش وایە بەلاری بۆ خوارەوە بۆ ناو لنگ یان ڕانیان، کە ڕاتان کێشا هەڵیدەزڕێنێت. بەئاگادارییەوە ڕێمان بەناو ئەو تۆنێڵە درێژانەدا کرد کە لە هەندێ شوێندا ئەوەندە تەسك بوون ناچار بووین لەسەر زگ بخشین. بەسووڕانەوەمان لە سووچێکدا، بەتەواویی کەوتینە ناو چوار لە ڕووسەکان کە دە پێیەك دوور بوون و سەرقاڵی ئیش کردن بوون بەکولنکەکانیان، بەبێ خوستی لە پشتیانەوە خشین و چەقۆمان لێدان. هەموو ئەوانەی لە دەورو پشتمان لەناو گەلەرییەکانی پەیوەندی کردنەوە خەڵکی خۆمان بوون ڕاکشابوون چاوەڕێی لەغەم لێدەرە ڕووسەکانیان دەکرد، ئەوانەی لەو کاتەدا بەخۆخشاندن دەهاتنەوە سەر، چونکە کەوتبوونە گومانەوە. پیرەئان، پۆرتا، من و شەشی دیکە بەرەو پێش خشین بۆ کۆتایی تۆنیلێك کە لەوێوە گەنگەرەیەکی هەشت کەسیمان دیت ئیشیان دەکرد، کاتێ ئەوانی دی خۆیان لە پەنا تۆنێلێکەوە مەڵاس دابوو، پۆرتا بەزمانی ڕووسیی هاواری کرد :

- هاوڕێینه، خێرا سەرکەون. ئیسراحەتمان پێدرا.

ڕووسەکان بە سەرسامییەوە لە تۆنێلە تاریکەکەوە ڕامان، بەڵام ئێمەیان بەدی نەکرد. یەکێکیان وەڵامی داینەوە :

- هەر هەمووومان بێین ؟

- بەڵێ، خێراکەن ! ئەوانی دی لە سەرەوەن چاوەڕێتانن.

کە گەیشتنە تەنیشتمانەوە لێمان دان. چەقۆیەکانمان لەبەر ڕووناکی تۆرجە کزەکانیان دەبرقایەوە. یەکێکیان هەوڵیدا کورتە کولینکەکەی بژەنێتە ورگی یەکێك لە کوڕەکانمان، ئەویش دەستی بە هاوار کرد، بۆیە ئێمەش ناچار قورگیمان بڕی.

ڕووسنەکان بڕێکی زۆر تەقەمەنییان تێکرتین.

* * *

ڕۆژێکیان پلۆتۆمان ناشت. نەمانتوانی سەرەکەی بدۆزینەوە, بەڵام باقییەکەی لەوێ بوو.

* * *

ڕێکەوت وابوو کە فەوجی (٢٧)ەمین لە دواوە بمێنێتەوە لە کەرتێکی چۆڵکراو کە درێژییەکەی سەدو بیست کیلۆمەتر بوو بۆ شاردنەوەی پاشەکشەیەکی گەورە. سەنگەرەکان لەو کەرتەدا لەسەر زەوی دروست کرابوون، ئاگاداریش کراینەوە کە بۆ ماوەی بیست و چوار سەعاتی داهاتوو

سۆبەکان دەبێ بەداگیرساویی بمێننەوەو دووکەڵ کێشەکانیش دووکەڵ بکەن و ناو ناوەش دەبوایە هەندێك تەقە بە ڕەشاشەکانمان لە ڕووسەکان بکەین. سەرەڕای کردنی ئەمە، دەبوایە هەندێ تەڵەی ساختە دروست بکەین. سرییەکەمان بیست کیلۆمەتری بۆ تەرخان کرابوو، ئێمەش دوو سەد کەسێك بووین. فەرمانی توندمان پێدرابوو کە نابێت لەژێر هیچ بارودۆخێکدا سەنگەرەکانمان بەجێ بهێڵین مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە ڕووسەکان بەڕاستیی دێنە ناو خەندەقەکانمان.

ئێمە لە دەستەکەی خۆماندا سیی سەرباز بووین، ڕووبەڕووی چوار هەزارو پێنج سەد تفەنگداری سیبریایی بووین کە ترسناکترین یەکەی سەربازیی بوون لە هەموو سوپای سووردا.

ئامادەکارییەکانی خۆمانمان دەست پێکرد. هەر دەرگایەك بەمین بەسترابووەوە کە لەگەڵ کردنەوەی یان داخستنی دەتەقییەوە. پارچە ئاوردوویەکی بێ زیان ئەگەر هەر کەسێك هەڵیبگرتابایەوە و بیخستبایە ناو سۆپا گوژمەیەك تەقەمەنی نەیزەکی دەتەقاندەوە. لەوحە تەختەیەکی سەر ڕۆخی کەندەکێك بەپەنجا مینی دژە تانك بەسترا بووەوە لە دووریی سەد یاردەوە. دەست کردن بەئامادەکردنی ئەو سەرسوڕمێنانە شتێکی سەیر بوو. بۆچی هەر بەجێبەجێ نەکراویی وازمان لێنەهێنان ؟ ڕەنگبێ لەبەرئەوە بێت کە کردن و نەکردنیان وەکو یەك بێ بایەخ بێت.

پاش نیوەڕۆیەکە بەهێمنیی بەسەرچوو. ڕووسەکان بەتەواویی نەیاندەزانی کە ئەوانەی بەرامبەریانن تەنیا دەستەیەك سەربازی دڵتەنگ و نائومێدن. شەوی پاشتر زۆر دڵخۆشکەر نەبوو. نەمان وێرا بخەوین. هەر

دانیشتبووین و دەمانڕوانی. ماوەی نێوان سەربازێك و ئەوەی تەنیشتی پەنجا تا سەد یارد بوو، قەت کەس نەیدەزانی کەی دەورییەیەك دزە دەکات و دێت — دەورییەیەکی سیبریایی ! بەسەری پڕ لەم جۆرە بیرۆکانەوە لە قوژبنێکدا لەگەڵ کۆمەڵێك نارنجۆك دانیشتبووم ئامادە بۆ هاویشتنیان و دوو ڕەشاشیش بەتەنیشتمەوە بوون، بەردەوام چاوم بڕیبووە قوڵایی تاریکییەوە.

لە بەرەبەیاندا ڕووسەکان گومانیان لەوەکرد کە هەموو شتێك ئاسایی نییە. هەندێك گوللەمان بەسەردا هاویشتن، بەڵام ئەوان تا دەهات سەرەڕۆتر دەبوون، سەریان لە سەنگەرەکانیان دەردەهێناو بە فزووڵەوە لە ئێمە ڕادەمان. ڕامکردە لای پیرەئان و بە سەرسوڕمانەوە پێم گوت :

– ئەریٚ، پێش ئەوەی کات بەسەر بچێت، ڕانەکەین ؟ هیچ شتێك ناگۆڕێت ئەگەر ئێمە بیست سەعات یان بیست و چوار سەعات لێرە بمێنینەوە.

پیرەئان سەری ڕاوەشاند.

– سڤن ، فەرمان هەر فەرمانە و، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەوانی تر کە لەویٚ لەناو بەفرەکەدا ڕادەکەن پشت بە ئێمە دەبەستن. ئەو شەیتانە هەژارانە کاتێکی کەمیان لەبەردەم هەیە. با هەلێکیان پیٚ بدەین، ئەگەر بتوانن، خۆیان لەم تەڵەیە ڕزگار بکەن.

تازە پۆرتاش پەیوەندی بەئێمەوە کرد و ئەویش دەستی بەبۆڵە کرد، بەڵام پیرەئان هەر ئەوەندەی گوت کە ئەوەندەی کارەکە پەیوەندیی بەوییەوە هەبێت، ئێمە ئەگەر حەز بکەین دەتوانین بڕۆین، بەڵام ئەو ئەگەر پێویست بێت بە تەنیا دەمێنێتەوە.

پۆرتا بەتوڕەییەوە هاواری کرد " ئۆ، دەمت داخە، ئەی، فیلدۆبیلە گەمژە پیرەکە – بێگومان ئێمە تۆ بەجیٚ ناهێڵین، بەڵام مەڵیٚ ئەوان منیان ئاگادار نەکردەوە ".

بەتووڕەیی و بەجنێودان، گەڕاینەوە شوێنەکانمان کە لەوێ لە چاوەڕێ کردنی ڕووسەکان دابووین و ئەوەندەی تر ترساین. هەندێك لە ڕووسەکان تازە بەسەر سەنگەری خەندەکەکانیان کەوتن و لەوێوە ئیشارەتیان بۆ کردین. دوو تەقەمان پێوەنان کە وای لێکردن خۆیان تێ هەڵدەنە خوار، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم دووبارە گەڕانەوە. لەناکاو، هاوڕێ لەگەڵ ترسەوە، دەموچاوێکی پیسم دیت لەسەر سەنگەرەکەوە دەرکەوت لە دووریی دە یاردەیەك لەو شوێنەوە کە لێی دانیشتبووم. بروسك ئاسا نارنجۆکێکم تێگرت. کابرا لە شوێنی خۆی کوژرا. پاشان کاروبار ئاڵۆز بوو. ڕووسەکان بەکۆمەڵەی گەورەوە سالان سالان هاتن و ئنجا لە دواییدا پیرەئان فەرمانیدا شوێنەکانمان چۆڵ بکەین.

لەسەر ئەسکییەکانمان بەناو دەشتە بە بەفر داپۆشراوەکاندا بۆی دەرچووین. جارجار گرمەیەکمان لە دوای خۆمانەوە گوێ لێدەبوو. ئەمە تەقینەوەی یەکێك لە تەڵە ساختەکانی خۆمان بوو. ئەگەر نا هەموو شوێنێك هێمن و وێران بوو. ناوناوە ستوونێك تانکی ڕووسیی بەسەر شاڕێیەکەدا دەڕۆیشتن کە دوو کیلۆمەترێك دوور بوو. دوای پێنج ڕۆژ گەڕان پاشماوەی فەوجی بیست و حەفتەممان دۆزییەوە، کە لە دواییدا لە جەنگ کردن دوورخرایەوە بۆ مەبەستی چاکسازیی کردنی.

من کرام بە (فاهنەن یونکەر) کە خۆم حەزم لێی نەبوو. تا ئەو کاتە بەچاکیی لەناو سەربازاندا شرابوومەوە، بەڵام ئێستاکە دەبێ زۆر چاك لە پێشەوە دیاربم و ڕاپۆرتی کۆماندۆفیلدۆبیل وەرگرم کە پێشتر سەرکردەم بوو. وەکو ئەوە وابوو کە لەوێدا، لە دەرەوە بەڕووتی بوەستیت. هەڤاڵانم گرژینەوە.

پاش ماوەیەک بە هەمان دەنگی نزمەوە چرپاندی :

" کە شۆڕشەکەتان دژ بە نازی و جەنەڕاڵەکان هەڵدەگیرسێنن، دەکرێ دوو کوڵەمستی زیاد لە منەوە بە ئەدوڵف دا بکێشن ؟ "

پیرەئان لە وەڵامدا گوتی: " پۆرتا، ئێمە بەڵێنت پێدەدەین، ئەوەندە کوڵەمستی لەمەڕ تۆوە بە سمێڵیدا بکێشرێ کە ئەگەر خۆت بەدەستی خۆتەوە بتوەشاندبانایە زۆر پێیانەوە ماندوو دەبوویت ".

" زۆر باشە "

ئنجا ماوەیەکی باش بێدەنگ بوون و، هەرچییەکی گوێمان لێی بوو بریتی بوو لەو پفکردنەی کە پیرەئان لە پایپەکەی دەکرد.

" پیرەئان، ئامێرەکەت لەگەڵ خۆتدا هێناوە ؟ ".

پیرەئان شمشاڵەکەی لە بەرکی هێنایە دەرەوە.

" ئەو پارچە ئاوازەمان بۆ لێبدە لە بارەی ئەو کچەی کە پرچی شانە دەکا. ئەو کچەی کە لەسەر بەردەکەدا دانیشتووە و پرچی شانە دەکا ".

پیرەئان دەستی پێکرد و منیش بەنەرمیی کەوتمە گۆرانی گوتن، پۆرتاش لەوێ لێی پاڵکەوتبوو چاوی بڕیبووە بنمیچەکەوە.

" من نازانم ئەم شتە مانای چییە,

لەبەرئەوە من خەمبارم, چیرۆکە کۆنەکە, بەهیچ جۆرێک ناچێتە مێشکمەوە "

" Ich weiss nicht, was soll es bedeuten,
dass ich so traurig bin,
ein Marchen aus alter Zeiten,
das kommt mir nicht aus dem sinn."

گریاین. پاشان پۆرتا چرپاندی :

- ئێستاش جۆزێف پۆرتا، ستاپسگفریتەر بەقودرەتی خودا، فەوتاوە. کەمێک زەحمەتە. بەڵێنم پێبدە کە ئاگاداریی ستالین بکەیت. توخوا بەر لەوەی تەواوبم با ببینم.

پیرەئان پشیلەکەی بەرزکردەوە و خستییە بەر دەموچاوی پۆرتا.

لەبیرت بێ زللەیەک لە ئەدۆلف و هملەر بدەی !

شلەیەکی زەردباوی - ڕەش لە لادەمی چۆڕایەوە، بەڵام ڕادەی توندیی گرتنی بەسەر دەستەکانمانەوە سووکتر بوو، ئنجا کەم کەم گرتنەکە خاو بۆوە. پۆرتا مرد.

# پیاوێک هەیە لە دەرەوە لەسەر تێلەکە ڕاکشاوە

هەر چەندە من ئەوەم نەزانی، چوونی دووەم جارم بۆ نەخۆشخانە بۆ سەلماندنی خاڵی وەرچەرخان بوو. بە هەڵواسراویی بەسەر تێلدڕەکاندا هێلابوویانەوە، بەڵام لە پاشان ڕایانکێشام ئنجا ناردمیانە دواوە و لە وێوە بۆ نەخۆشخانە. دوای ڕەهابوونم ڕەوانەی فێرگەی تانک کرام لە ونسدۆرف لە بەرلین بۆ کورتە خولێکی ئەفسەریی بەر لە گەڕانەوەم بۆ فەوجی (٢٧) لەوێ، لە بەرلین بەویستێکی سەیری خوداوەند بوومە سەوداگەر بۆ پیلانگێران لە دژی هتلەر، بەڵام ئەمەیان با بۆ دەرفەتێکی تر بێت.

بەیانییەکیان، لە کاتێکدا لە نەخۆشخانە یەدەگەکە بووم لە فرانزنباد کەسێکی بچکۆڵەی کورتە خڕەی تێکسمراوی تەمەن دەوروبەری بیست و پێنج ساڵان هاتە ناو قاوشەکەمان و یەکسەر بەرەو شوێنەکەی من هات، دەستی بۆ درێژکردم و بە دەنگێکی لەرەدارەوە گوتی : " کۆنە برادەرێکتم، ئارنست ستۆلیم ناوە. لە فەوجی ئەلپیی حەفتەمم و ئاوارەم لە نهۆمی سەرەوە، لەسەر لێواری شێت بوونم و بەڵگە نامەم هەن بۆ سەلماندنی ئەمە فەرموو، خۆت بیانبینە ".

ئۆبەرگیفریتەر ئارنست ستۆلپ، بەتالیۆنی حەفتەمی ئەلپیی جیگەر وەکو برینداریکی ترسناکی جەنگ پۆلێن کرا بەهۆی سێ برینی مەترسیدار لە سەری. لەژێر هیچ بارودۆخێکدا نابێت بخرێتە بەر کاری قورس یان ناچار بکرێت کە کەل وپەلی قورس بکاتە بەر، بەتایبەتی خوودەی پۆڵا. لەکاتی ڕوودانی هەر پەلامارێکیشدا دەبێ یەکسەر ببرێتە نزیکترین نەخۆشخانەی سەربازیی.

ستاندورت لازێرت ٤٠ پاریس

د. واخموند، ئۆبەرستابسارتز

– دۆستی دێرین، ئەمەیان شتێکی جوانە هایل هتلەر، وانییە ؟ وا هزر دەکەم تۆ شێت نیت. ئەگەر شێتی، پێویست ناکات وا بڵێی، چونکە قەت نەبووە دووان لێرە بن لەیەك مەیدانی ڕاودا. من دەگەڕێم نامە بۆ گەلێك گەمژەی جیاواز دەبەم لە بنکەکانی سەرکردایەتی و لەسەربازگەکاندا. کاتێك پشوویەکی کورتم پێویست بێ لەسەرە لووتی ئەفسەرێك دەدەم و زەردەخەنەیەکی بۆ دەکەم و ئنجا مۆڵەتەکەمی نیشاندەدەم پاشان دەنێرڕیم بۆ نەخۆشخانە. کە مۆڵەتت پێدرا، ئەو کاتە فرانزنبادو ئیگەرو پراگت پیشان دەدەم. دەتەوێ بزانی چۆن هاتمە ئەم کارخانە بێ سەروبەرە.

وەڵامم دایەوە " بەڵێ، پێم بڵێ ". هەر یەکسەر وام بۆ هات کە ئەوە چەند حەفتەیەکە زەردەخەنەم نەهاتووەتێ. من بروسکەیەکم بۆ باربارا ناردو، ئەویش هات و پاشان ئەو خۆی گواستەوە تاکو بتوانێت لە فرانزنباد بمێنێتەوە و ئاگای لەمن بێت، بەلاّم باری دەروونیم باش نەبوو. من زۆر ماندو و شەکەت بووم. بەربارا زۆر نیگەران بوو.
ستۆلپ گوتی : " گوێچکەکانت شل بکە و ئنجا گوێم لێبگرە، کۆترەکەم ".
یەکەم جار کە شتێکی لە ئەندازە بەدەرم تووش بووبێت لە فەرەنسا بوو. قەدی دارێك بوو لەسەر فارگۆنی شەمەندەفەرێك، هەر یەکسەر بەر پشتەملم کەوت، شکانی کەللە. بۆ نەخۆشخانە. دووبارە بۆ دەرەوە. بۆ دەرەوە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ، ئنجا کابراییێکم فێری چۆنیەتی سواربوونی مۆتۆر کرد، بەو شێوازەی کە پێویستە فێربکرێت. دەستەکانم لە ستێرنەکە بەربوون، بەلاّم لەعنەتم لێ بێت ئەگەر کەسێك پەرژینێکی لەو شوێنە دانەنابێت کە دەمویست بۆی بچم. من وەکو گوللە تۆپێك بەهەوادا فڕیم و لەناو حەوزە ئاوێکی ئاسن

نیشتمەوە. حەوزەکە خۆڕاگربوو، من نا. شکستی تازە لە کەللە، لەگەڵ شکانی هێسکە چەنبەر، وەدەرنان بەبێ بڕوانامە. شەش حەفتە و، دووبارە چوومەوە ئەوێ. ئەمجارەیان ستوونێکی واگۆن بوو. ئێستاش، بەخۆم دەڵێم، ئەمجارەیان دەبێ بیکەیت، بەڵام ئێوە هیچ بیرۆکەیەکتان نییە کە چەند زەحمەتە بڕوانامەیەکت دەستکەوێت تیایدا هاتبێت کە حاڵ و باری خراپت هەیە. سەربازێکی باشی ئەڵمان نابێ حاڵ و باری خراپی هەبێت، تەنانەت کەمێکیش. ئەمەش، وەکو من لێی تێبگەم لەبەر ئەوەیە کە زۆربەی ئەو سەربازە ئەڵمانە باشانەی کە من دیومن گەلێك حاڵ و باری خراپیان هەیە. باشە، بەردەوام بووم، بەڵام پێویستە دەوری خۆم ببینم، تا پاداشتێکم دێتە دەست. من بەوەوە دەستم پێکرد کە مستێکی لووت شکێنم خێواندە دکتورەکە. ئۆی، دەکرێ لە پاشان لووتی ببینی، دەتوانم پێت بلێم، ئەو گریا. بەئەدەبەوە پێم گوت، پێت خۆشە ؟ . "من ناوم ستۆلپە". بەڵام هیچ ئەنجامێکی وای نەبوو، وام بۆهات کە دەبێ کارتێخێکی زبرتر بەکاربێت. لەبەرئەوە پاش نیوەڕۆیێکیان بە سەر پەرستارەکەم گوت، کە ئافرەتێکی بەساڵاچووی چورچەی پاکدامەنی تەمەن دەوروبەری پەنجا بوو "خۆت و کورتە دەرپێکەت بڕۆ ئەو لاوە کیلۆپاترە، دەمەوێ قسەیەکت لەگەڵدا بکەم !" ئەمەش سوودی نەبوو، من وای بۆ دەچم کە تا ئێستاش هیوادارە، بەخۆمم گوت، باشە، سەربازێکی باشی ئەڵمان قەت واز ناهێنێ. ئەوەی من دەمەوێ چەکوشێکە، بۆیە چەکوشێکم پەیداکردو چاوەڕێم کرد تا کاتی هات، بەم جۆرە ڕۆژێکیان بۆم دەرکەوت کە کاتەکە هاتووە لە مێجورێك وەژوورکەوتم سڵاوێکی جوان و بەڕێزم لێکردو ژوورە تایبەتییەکەیم بە دڵ بوو. ئنجا دڵم چووە سەعاتەکەی، دانەیەکی جوان و لە زێڕ دروستکراو. لێم پرسی ئایا سەعاتەکە قایمە. کابرا وەڵامی نەدامەوە، تەنیا هەر تێم ڕاما. بۆیە چاوم تروکاند، چەکوشەکەی خۆمم دەرهێناو بەسەعاتەکەیم دادا. گوتم،

نا، ئەم سەعاتە بەهیچ جۆرێك قایم نەبوو، ئنجا سەری چەکوشەکەم سڕییەوە لەو کاتەی ئەو زەنگەکەی لێدەدا، بەبێزەوە گوتم، ئەوە تەنیا ڕیخی بێ نرخە و دە (فینك)م خستەناو دەستییەوە و پێم گوت، ئەمە بۆ بلیتی تیروپشکە بۆ سەعاتێکی تازە. نیوەی نەخۆشخانەکە پەلاماریان هێنایە ژوورەوە، بەڵام من بەهێمنییەوە خشیمە ناو چێشتخانەکان و لەوێ چاوم لە کچەکان تروکاند. گوتم، ئێرە گەرم و خۆشە. ئێوەش، کچینە، بۆ خۆتان وەکو من پەنجەرەیەك ناکەنەوە ؟ بەم جۆرە خۆم و چەکوشەکەم بۆ دەرەوە. هەشت شووشە. ئەوە کەمێك هەواتان پێ دەدات، ها، خانمینە ؟ ئنجا گۆرییەکانم، سێ دەستەسڕو پەڕۆیەکی کاشیم لە شۆڕبایەکە هەڵێناو پرسیم ئایا ئەوان ناتوانن ئەوانەم بۆ بشۆن لەکاتێکدا ئەمە ئیشیانە ئەوەش، لە کۆتاییدا، مۆڵەتەکەمی پێ بەخشیم.

من قەت ناتوانم ئەوە تێبگەم کە ستۆلپ لە ڕاستیدا ئەوەندە شێتە، بەڵام بەتەئکید هیچ خەوشێك لە دەرکردنیدا بەدڵگوشایی و سوودمەندیدا نەبوو، بەرباراش بەوە زۆر دڵخۆش بوو کە ستۆلپ منی خستە ژێر باڵی خۆی و بەبیرۆکە شێتەکانی منی دڵخۆش کرد، خەنی بوو، کە ڕەفتارێکی لە ڕادە بەدەریان هەبوو بۆ ڕزگاربوونمان لە هەندێك لە کاریگەرییەکانی نەخۆشخانە.

کاتێك کە توانای هەستانەوەم پەیداکرد، کورسییەکی سێ چەرخەیان پێدام، چونکە تا ئەو کاتەش من هەر ئیفلج بووم و ستۆلپیش زۆر بەوە دلخۆش بوو کە لەسەر کورسییەکەم پاڵم پێوەبنێت، بەتایبەتی لەو کاتانەی کە دەچووین بۆ شانۆ یان بۆ هەر شوێنێکی دی کە دەبوایە ڕیزیان تیادا بگریت، چونکە ستۆلپ منی هەر پاڵدا بۆ یەکێك لە ڕاڕەوەکان و، پاشان هات و بەتەنیشتمەوە دانیشت، ئەو شوێنە بوو بەژوورێك بۆ دووان.

هەروا ئێمە هەستمان بەخۆشییەکی زۆر کرد بەوەی کە کەسێکی سێیەم هەردووکمانی بەشەقامە جوانەکانی ئیگەر، یان پراگ دا پاڵدا، لە کاتێکدا ئێمە بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبووین و بەزەردەخەنەوە نیگا دڵسۆزەکانی کچۆڵەکانمان وەردەگرت. ئەمە وای کرد کە ڕۆژێکیان بۆ ئاهەنگێکی شکۆدار بانگهێشت بکرێین کە تیایدا هەندێ ئەفسەری بە ساڵاچووی ئەڵمانیی و سلۆڤاکیی ئامادە ببوون. ئەوانە و، خانمانی کۆمەڵگای پراگ بەهۆی دیمەنە جوانەکەی دانیشتنی ئێمە لەناو یەك کورسی چەرخەداردا دایانە گریان ستۆلپ بە بەدلە خاکییە سەوزەکەیەوە و منیش بە بەدلە ڕەشەکەی تانکمەوە و بە بێرییە لارەکەمەوە. هیچ سنوورێك نەبوو بۆ ئەو شتانەی بۆ ئێمەیان دەکرد، گیرفانەکانمان بەهەموو جۆرە خواردەمەنییێکی خۆش ئاخنیبوو، کە پاشان بەشمان کرد لەگەڵ ئەوانی تر کە لە نەخۆشخانە بوون. دوایی هەتا وێنەی فۆتۆگرافی ئێمەشیان گرت بۆ ئەوەی یادەوەری ئەوەیان هەبێ کە سەربازانی جیگەرو تانك لە یەك کورسی چەرخەدار دا یەکیان گرتووە.

ئەوەی جێی بەدبەختیی بوو، ئەوەبوو کە دووان لەو سەرپەرستارە میهرەبانانە من و ستۆلپیان لە پێشبڕکێیەکی سەرپێی کورسییە چەرخەدارەکاندا گرت، کە لەو کاتەدا ستۆلپ لەناو کورسییەکە نەبوو، بەڵکو بەهەموو توانایەوە بەشەقامەکەدا پالی دەدا. دوای ئەم ڕووداوە جارێکی تر بانگهێشتی ئاهەنگەکان نەکراینەوە.

کاتێکیش پێویستیمان بە پارە و بەڕابواردن دەبوو، ستۆلپ تەلەفۆنی بۆ دۆستەکەی دەکرد، ژنی ستاندارتفۆهەرێکی (SS) لە نۆرنبورگ.

لە تەلەفۆندا وا هاواری دەکرد کە هەموو کەسێکی لە پۆستە خانەدا وا لێدەکرد ئاوڕی لیّ بدەنەوە.

-- هەلۆ، دۆستە دێرینەکەم. کابرا چۆنە ؟ لە ماڵەوەیە ؟ نا ؟ لە ڕووسیا دەستگیر کراوە، وانییە ؟ جێیەکی خۆشە بۆ ئەو ! پیرەماین ! گویّ بگرە من فێری کارێکی تازە بووم، بۆیە، ئەگەر ئارەزووت لێیە وەرە. بەڵام کارەکە زۆر زەحمەتە، بۆیە هەتا شتێکی زۆر بەهێز کەرت نەبیّ بیهێنی، خۆت تووشی دەردەسەری مەکە، ئەو ئارەقی پۆرتە لەگەڵ خۆتدا مەهێنە، دەیزانی، من هەردەم گوتوومە کە بڕێکی خراپە ئەوەی دەرۆزەکەرەکە کڕیوییەتی. نامەویّ پۆرت ببینم هەتا هەموو ئەو شەڕابە نەخۆیتەوە کە ئێستا هەتە. باشە، من ناتوانم بەدرێژایی ڕۆژ لێرە بوەستم و چەنەبازیت لەگەڵدا بکەم. چاوەڕێتم لە دوو و سیی و دوو.

پاشان تەلەفۆنەکەی بەردایەوە بیّ ئەوەی لە شوێنەکەی دایبنێتەوە، بۆیە بەهەڵواسراویی شۆڕبوویەوە و بەجدی بۆ ماوەی چەند چرکەیەك پێکەنی پێش ئەوەی تەلەفۆنەکە بیّ دەنگ بێت. جووتە کچێکی گەنج پێکەنین و، لەو شوێنە جیاوازە بێزارکەرەدا بەگشتی شادمانییەکی خراپ داپۆشراو هەبوو. پاشان بەڕیزێکدا وەستاین و پوولێکمان کڕی، ستۆلپ پوولەکەی لە هەنیەی پۆلیسێك دا کە زۆر لە دواوە وەستا بوو، ئەویش شتەکەی بەگاڵتە وەرگرت. ئەوەی بووە جێی سەرسامیی من، ئەوەبوو لە ڕۆژی دواییدا ژنە تەمەن ناوەنجییەکەی ستاندەرت فۆهەرەکە گەیشت و بارێك کەل وپەلی بازاڕی ڕەشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. خۆی و ئەرنست دوو سەعاتیان لە ژووری هۆتێلێکدا بەسەر بردو، ئنجا ناردییەوە بۆ نۆرنبێرگ بەبیانووی ئەوەی کە کاتی زۆر کەمە، کە ژنەکە ڕۆیشت سەرتاپای قاوشەکە خۆیان بەو ئارەق و شەڕابە سەرخۆش کرد کە ژنە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی.

ڕۆژێکیان ستۆلپ بزر بوو، ناردبوویانە نەخۆشخانەیەکی تایبەت. دوای حەفتەیەك پۆستکارتێکم لە ئەو پێگەیشت.

سۆمەرسلت فاکتەری، نۆرنبرگ

١٨ی نیسانی ١٩٤٤

ئازیزەکەم سڤن

چ قوڕە ڕەشێکە من تێی کەوتووم ! جگەرەکێشان قەدەغەیە، چوونە دەرەوە قەدەغەیە. زۆر بەنهێنی دەچم بۆ ئاودەست و زۆریش دەترسم ڕۆژێك بێت ئەوەش قەدەغە بێت. هەتا دوێنێ خواردنم لەژێر بەتانییەکەمدا دەخوارد، بەڵام پاشان پەرستارێك پێی ڕاگەیاندم کە ئەمە قەدەغە نییە. هەموو دەرگاکان داخراون، جگە لە دەرگای ئاودەست نەبێت کە لەسەر گازی پشتە. لەبەردەم هەموو پەنجەرەکاندا بەربەستی ئاسن دانراوە، جا ئایا ئەمانە بۆ ئەوەن کە ڕێگەی ڕاکردن لەبەردەم ئەوانەی کە لێرەن بگرن، یان ڕێگەی هاتنە ژوورەوە لەبەردەم کەسانێکدا بگرن کە دێنە ژوورو ئێمە دەبەن، ئەمەیان من نایزانم.

.. لەگەڵ سڵاوم ...

ئارنستی شێت

- "خۆشەویستەکەم ! ، ئۆ، ئازیزەکەم !، چەند خۆشە جارێکی تر دەتبینمەوە، سڤن من زۆر ئارەزووت دەکەم.

- منیش، بەربارا، وەرە، ڕێم پێبدە، یەکێ لەو جانتایانە هەڵگرم. ئۆتۆمبیلەکەم لەچاوەڕێ دایە. برسیتە ؟

- دڵنیای کە بریسمە.

کە نانمان خوارد، چووینە هۆتێلەکەی، لەوێ بەربارا خۆی شوشت و نیو سەعات ئیسراحەتی کرد. سەیر ئەوە بوو ئامێزمان تێک نەکرد. تەنیا زۆر کارتێکراو بووین و بارودۆخەکەش ئەوەندە خۆش و هێمن بوو، خۆمان ئاسا. من ئارامتربووم لەوەی کە لەو چەند مانگە پڕ لە گرژییەی پێشوو تیایدا بووم. شتی زۆرمان هەبوو بۆ یەکتری بیلێین. شتەکەی ترمان لە دەست ناچێ. پێکەوە چووینە دەرەوە بۆ (پۆستدام) و لەوێ فراڤینمان خواردو دەست لەناو دەست لە پارکی سانس – سوسی پیاسەمان کرد.

یەکێک لە بۆردومانە گەورەکانی سەر بەرلین ڕمبەو گڤەی دەهات. لە کاتێکدا وەستابووین و تەماشای دووکەڵ و گڕی ئاگرمان دەکرد لەسەر (نیوکۆلن) بەربارا بەتووڕەییەوە خۆی دایە پاڵ من. شەپۆڵ شەپۆڵ فڕۆکەی بۆمبهاوێژ بەسەر شارەکەدا دەفڕین بۆ ئەوەی بۆمبەکانیان بخەنە خوار.

لەناکاو نووزەیەکی بڵند هات بروسک ئاسا بەربارام کێشایە خوارەوە و خۆم تێ هەڵدایە تەنیشتییەوە. بۆمبێکی تر بە لورەوە هاتە خوارەوە. بەربارا دەرپەڕی و بەهاوارەوە بەسەر ڕێگاوە ڕای کرد، بەتەواویی لەبەر زەندەق چوویی مەندە هۆش ببوو.

بازم داو بەدوای بەربارا کەوتم و هاوارم دەکرد: "بەربارا، خۆت تیّ هەڵدە خـواریّ ! بەربارا، بەربارا

نووزەیەکی بەهێز وای لێکردم کە خۆم تیّ هەڵدەمە نـاو خەنـدەکێک. خـاك و خـۆڵ بەسـەرمدا بـاری. لەوێـدا بـۆ مـاوەی چـەند چـرکەیەك مامـەوە بەرلـەوەی هەستمەوە سەر پێیان. بەربارا ون ببوو.

لە دووریی دووسەد یاردەوە، بەربارام دۆزییەوە. جەستەکەی لەسەر ڕێگاکەدا خلّتانی خوێن بوو.

ئاگام لە هیچ شتێک نەما، هیـچم نـەدیت، قـەت گـوێم لـە دەنگـی نیـشانەی بەسەرچوونی مەترسی بومباران نـەبوو. ئۆتۆمبیلێـك وەسـتا. پیـاوێکی بەدلـە لەبـەر بردمیە ناوی. قالیچەیەك لە پشتەوە دانراو بارباراکەی منی تێدا بوو.

جلکیان لەبەر داماڵیم. دکتۆرێك شتێکی لە بارەی هێدمەی کارەباییەوە گوت. دەسـتێك مەچـەکی گـرتم، دەسـتێکی نـەرم کـە منـی بەهـەمان شـێوەی سـووك و هەستیاری بەربارا ئاسا گرت ئەو بەربارایەی کە ئەوان کوشتیان.

## فەرماندەی سرییەکە

من وەکو ئۆبەرلیفتنانت و فەرماندەی سرییە کۆنەکەی خۆم نیررامەوە بۆ فەوجەکەم. ڤۆن بارنیگ ببووە ئۆبەرلیفتنانت و فەرماندەی بەتالیۆن. ئەوانەی لە سرییە کۆنەکەماندا مابوون ئەمانە بوون، ئۆبەرست هنکا، ڤۆن بارینگ، پیرەئان و من. پیرەئانیش ببووە ئۆبەر فیلدۆبێل.

ڕۆژێکی ساردی تاریک و ڕوونی باراناوی من و پیرەئان لە هێڵی بەرەی جەنگدا دەگەڕاینەوە. لە قۆناغی کۆتایی گەیشتنمان بەگوندەکەمان بەسەر هەندێ فارگۆنی ئاسنیندا ڕۆیشتین. هاتبوو بگەینە وێستگەیەکی کاتیی کە ئەمبارێکی گەورەی تەقەمەنی لێ بوو، کە ویزەیەکی ناسراوی تۆقێنەر لە هەوادا هات. پیرەئان پاڵێکی پێوەنام سەراوسەر خستمیە ناو کەندەکەوەو ئەویش بەدوامەوە هات.

لە ماوەی نیو سەعاتەکەی تردا، دەتگوت دونیا بەرەو کۆتایی دەچێت. لورە و گرمە و شرق و هۆڕێکی بەردەوام لە زنجیرە تەقینەوە دەمارگیرەکانەوە دەهات. گڕە ئاگری سپی گەش بەدەنگی وەك شریخەی قامچی بەهەوادا هەڵدەدران. گورزەی تەواوی گوللە تۆپ بەهەموو لایەکدا دەهاوێژران و دەتەقینەوە. دوو کامیۆنی شەمەندەفەڕ بەهەوادا فڕین و لە دووریی سەدو پەنجا یاردەوە لەکێڵگەکاندا کەوتنە خوار. تەواوی بنکەی واگۆنێکی قورسی بارهەڵگر وردوخاش و بەتێکشکانەوە لە نزیك ئێمەوە کەوت. دوو دووکەڵکێشی درێژی کارگەیەك کەوتن و، یەکێکیان هاوکات لە چەند

شوێنێکیدا شکاو، ئەوەکەی تریان لەسەرخۆ سەرەو ژێر بوو، تا لەسەر زەوی لەناو هەورێکی تۆزو گەردا کۆتایی پێ هات. هەموو خانووەکان لە نیوە تیرەیەکی فراواندا کاول بوون و لەگەڵ زەویدا یەکسان کران.

بێدەنگییەکەی دوای ئەمە ترسناک بوو. لەسەرخۆ هاتمەوە هۆش خۆم، هەستامەوە و سەیری دەوروبەری خۆمم کرد. پیرەئان لە دووریی دوو یاردەوە لە من ڕاکشابوو.

" زۆر چاکە، پیرەئان، من وا تێدەگەم کە دەبێ بەرەو پێش بچین، ئەوەش نەختێك بە ترسە، وانییە ؟

هیچ وەڵامێك نەبوو.

هەردوو لاقی شکاو، سمتی چەپی ببووە هەویرو شانیشی هەروا.

سەریم خستە سەر کۆشم و بە ملپێچەکەم ئارەقی نێو چەوانیم سڕییەوە چرپاندم، پیرەئان، پیرەکوڕەکە، پێت وایە ئەگەر هەڵت گرم دەگەیتە بنکەی تیمار کردن ؟ .

بۆ ساتێك چاوەکانی کردنەوە.

- سفن ، پیرەئان فەوتا، وا باشترە لێرە بین و دەستەکانمان تێك بگرین. زۆر ناخایێنێ، ئەگەر پێتە جگەرەیەکم پێ بدە. جگەرەیەکم داگیرساندو لە نێوان لێوەکانیم ئاخنی. بەزەحمەت قسەی بۆ دەکرا.

کە مردم، نامە بۆ ژن و منداڵەکانم دەنووسی، وانییە ؟ شێوازەکە دەزانی: گوللە بەر لاجانگی کەوتووە و بێ ئازارە ... بەهەر حاڵ ئازارێکی وام نییە، جگە لە ڕاکێشانێك نەبێ لە پشتم لەکاتی قسەکردندا .. پایپە کۆنەکەم و

قەڵەمبڕەکەم بۆ تۆ بن، شتەکانی دی لەگەڵ هەردوو نامەکەی ناوگیرفانم پێکەوە بیاننێرەوە ماڵمان.

بۆ ماوەیەکی کورت بەبێ دەنگیی ڕاکشا، چاوەکانی داخرا بوون، کە چی ژان و ئێش لە لەشی دەردەچوو، مەتارەی ئاوەکەمم بەلێوانییەوە نا.
– پیرەئان، ئەوە هەندێ شناپسە. ئەگەر بتوانی هەندێکی لێ بخووە. توانی دوو قومی لێبداو ئنجا دووبارە چاوەکانی کردنەوە. بەدەنگێکی گڕەوە چرپاندی :
– ئەوەی زۆر ئازارم دەدا ئەوەیە کە تۆ بەتەنیا بەجێ دەهێڵم. ئومێد دەکەم بتوانی بگەڕێیتەوە بۆ ئەو وڵاتە بچکۆڵانەی کە تیایدا هەست دەکەی لە ماڵەوەیت، ئەو شوێنەی کە گەلێك شتی خۆشت لەبارەیەوە بە من گەیاندووە.
کە هەموو شتێك کۆتایی هات بەرزم کردەوە و خستمە سەر شانەکانم و ئنجا بەزەحمەت بەناو قوڕو لیتەدا ڕێم کرد، کە لە ناویدا بووتەکانم بەردەوام دەخزین. هەر جارێکیش کە دەخلیسکام بەتوڕەییەکی بێچارەوە دەگریام و ددانەکانم جیر دەکردنەوە، لە کاتێکدا ئارەقە بەملمدا دەهاتە خوارێ و کزەی هەناسەم گەرم بوو.
ڕووسەکان بە سەرسامییەوە تێمان ڕامان کاتێ بەلاکە لاك خۆم و هاوڕێ مردووەکەم هاتینە ژوورەوە و لەسەر نوێنەکەدا ڕامکشاند. پاشان یەکسەر چوومە لای ڤۆن بارینگ.

ڤۆن بارینگ نالاندی " ئەویش، من ناتوانم لەمە زیاتر بوەستم ". شانی منی گرت و هاواری کرد " سڤن ، من شێت دەبم، هەرجارێ کە فەرمانی پەلاماردان دەدەم خۆم وەك قەسابێك دێتە بەرچاو". ئەو بەدەم ئاخ

هەڵکێشانەوە دەلەرزی، بەتوندیی خۆی تێهەڵدایە سەر کورسییێك و سەری خستەسەر هەردوو باسکی کە لە پێش خۆی لەسەر مێزەکەدا درێژی کردبوون.
- ئەی، خودای لە ئاسمان، با ئەمە زوو بەسەر بچێت ! با زوو بەسەر بچێت !
ڤۆدکای لە دوو بەرداخ کرد تا بەسەریان داڕژا، ئنجا یەك لەو پەرداخانەی دا بە من. بە قومێك فرمان کردن، دووبارە پڕی کردنەوە، بەڵام هەر کە ویستی پەرداخەکەی خۆی هەڵگرێت دەستیم گرت.

پێم گوت : ئەریك، با جاریٚ واز لە پەرداخەکانمان بهێنین تا ئەو کاتەی پیرەئان دەنێژین، ئێستا دەبیٚ لەگەڵم بێیت و بینێژین. دەبیٚ هەر من و تۆ ئەو کارە بکەین چونکە ئێمە دەیناسین دوای ئەمە من بەشادییەوە تا ڕادەی مردن لەگەڵت دەخۆمەوە. سواستیکاکەمان لەو ئاڵایە کردەوە کە تیایدا پێچامانەوە.

* * *          * * *          * * *

هەر کە قایشی چەناگەکەم توند کردەوە و خودەکەمم دانا، نیگایەکم بەسەر سرییەکەدا هێناوبرد کە خۆم فەرماندەی بووم.
لەو بۆشاییەی ڕێك کەوتبووە بەردەمم، ڕۆژانێك هاوپێت فیلدوبیل (ئەدەل)ی لیٚ ڕادەوەستا. ئەو لە ١٩٤٣دا بە تیفۆ مرد.
ڕۆژگارێکیش لە پشتییەوە فیلدۆبیل (بیلندۆرف)ی باڵا بەرزی خۆش خوو ڕادەوەستا، ئەویش لە شەڕەکەی پردی کووبان لەگەڵ تەواویی دەستەکەی بەزیندوویی نێژران.
لە لای ڕاستی دەستەی دووەمیشەوە پیرەئان دەوەستا، ئەویش پێریٚ بە گوللەی تۆپەکان تێك هاڕا لەپشتییەوە ستابس گیفریتەر جۆزیف پۆرتا، کە ئەویش بەهۆی هەڵزڕانی سکییەوە بەچەقۆ گەیشتە ئاکامی خۆی.

لە تەنیشت ئەویشەوە تیج، کە بەشێوەیەکی نادیار بەمەرگی خۆی گەیشت.

پلۆتۆش لە دارستانێکدا لە (ڕۆگلیف) بەهۆی بۆمبێکەوە سەری پەڕی.

ئەنتیرۆفیزەر، هۆگۆستیگیش لەناو تانکەکەیدا سووتاو لایەکی لەشی بەهۆی پارچە گوللە تۆپێکەوە هەڵدڕابوو.

ئاسمۆس براونی هەمیشە دڵخۆش، هەردوو قاچ و باسکەکی لە شوباتی ۱۹٤۲ دا پەڕین.

ئەنیترۆفیزەر بیرنهارد فلیشمان، پاش ئەوەی لە یەکێك لە گرتووخانەکانی جەنگ لە سیبیریا ڕایکرد لە مۆسکۆ شوێن بزر بوو.

گیفریتەر هانز برور، پۆلیس لیفتنانتی پلە دابەزێنراو پاش ئەوەی پێیێکی خۆی بەهۆی زنجیری دەبابەوە تێکهاڕی، لە سێدارە درا.

لەو لاشەوە، لە دەستەی ژمارە (٥)دا لیفتنانت هۆبەری تەمەن نۆزدە ساڵیی و، برادەری ڕاستەقینەی سەربازەکانی، بەیانییەکیان لە نیسانی ۱۹٤۳دا هەردوو قاچەکانی پەڕین و لەسەر تێڵدڕەکەدا تا مردن خوێنی لەبەر ڕۆیی و بانگی (هندل)ی خوشکی دەکرد.

تۆپچی تانك، (کورت بریتنگ)ی تەمەن شازدە ساڵیی، لە عەزابی دۆزەخدا مرد پاش ئەوەی بۆمبێکی فۆسفۆری لەناو دەستەکانیدا تەقییەوە لەو کاتەی کە لە حوزەیرانی ۱۹٤۳دا شەمەندەفەرە زرێپۆشەکەمان مینرێژ دەکرد.

ئۆبەرگیفریتەر ویلی پالاسی کورتە باڵای هەمیشە دەم بەخەندە لە هەمان کارەساتدا گیانی لەدەستدا.

ئارنست ڤۆلکاسی تۆپچی لە هەمان شەمەندەفەری زرێپۆشدا سەری وردوخاش بوو، مێشکی ئەو بوو پڕژایە سەرە من.

ئۆبەر لیفتنانت ڤۆن ساندرا، زگی بەبۆمبێکی HE هەڵزڕا.

لیفتنانت برۆنۆ هالەری تەمەن سیی و پێنج ساڵە، خۆی و برا بەسەختی سووتاوەکەی، ئەتنیرۆفیزەر پاوڵ هالەر کە لە باوەشی بوو، لە تانکێکی گڕ گرتووەوە خۆیان تێهەڵدا، خۆی بەهۆی سووتانی فۆسفۆرییەوە گیانی لە دەستدا. هەردوو برا بەباسکی تێك ئاڵاوەوە لە (بەردچیف) نێژران هەردووکیان پێکەوە لە گرتووخانە سەربازییەکانی هتلەرو لە فەوجە سزادراوەکانیدا بوون و هەردووکیشیان پێکەوە لە زەوی ساردو سڕی دەشتەکانی ڕووسیا بەئاسوودەیی سەریان نایەوە.

خوداوەند ! ئەگەر تۆ هەیت، داوات لێدەکەم کە ڕێگە بەم سوپا مەزنەی کوژراوان بدەیت کە لەبەرچاوی فیلدمارشاڵە بەرپرسەکاندا ڕێپێوان بکەن ! وایان لێبکە ئەمانە لەبەر تەپەی بووتەکانی سەربازە کوژراوەکاندا قەت ئاسوودە نەبن ! وایان لێبکە لەو سەدان هەزار چاوە تۆمەتبار کردووانەدا ڕامێنن. ڕێ بەدایکان، هاوسەران و خوشکان بدە کە بەرامبەریان بوەستن و تۆمەتەکانیان بەڕوویان و ڕووی ئەفسەرانی ستافەکەیاندا بدەن، ئەوانەی پلانیان بۆ ڕەشەکوژیی دانا بۆ ئەوەی ئەو بورژوازییە بێ بەهرەیە، ئەو شاگرد بۆیاخچییە کارامە شێتە دلخۆش بکەن.

لەناکاو ڕاچەنیم و هاتمەوە هۆش خۆم، ئنجا زانیم کە هاوپتفیلدوبیل تازە بە تازە ڕاپۆرتەکەی پێشکەش کردووم. سڵاوم کرد و ئنجا فەرمانم دا :

- سرییەی ژمارە (5). چەك - بۆشان !

جوولەی سەربازە خراپ مەشق پێکراوەکان زۆر لەسەرخۆ بوو، چونکە زۆربەیان وەکو سەربازی تازە ماوەی سێ حەفتە مەشقیان پێ کرابوو.

- سرییە، بۆ لای چەپ - بسووڕێ - خێرا بڕۆن !.

بەناو قوڕو چڵپاوی بێ بندا، دوو سەد ماددەی سووتەمەنی جەنگ لەسەر ڕێگادا بەرەو بنکەکانیان ڕێیان کرد.

من و ئۆبەرست لێغتنانت ڤۆن بارینگ لـە پەناگـەی سـرییەکەماندا بەتەنیـشت ڕووناکییە بە پڵتە پڵتەکەی مۆمێکەوە دانیشتبووین و دەمان خواردەوە.
لە پێشمانەوە کۆمەڵێک شووشەی بەتاڵ و نیمچە بەتاڵی ڤۆدکاو کۆنیاک دانرابوون.

دەمارە ئەعـسابەکانی بـارینگ دارزابـوون و چـیتر ئـەو بارتـەقای هۆشـیاریی نەدەکرد. ئەگەر هۆشیار بووایـە، تووشـی جـۆرە هەڵـچوونێکی وا دەبـوو کـە ناچـار دەبووین بیبەستینەوە بۆ ئەوەی رێی پێنەدەین خـۆی یـان ئێمـە برینـدار بکـات. بـۆ ئەوەی کەم یا زۆر لەژێر کۆنترۆڵدا بیهێڵینەوە مـن و هنکـا بـەنۆرە لەگەڵیـدا دەمـان خواردەوە. بەهەر حاڵ بەتەنیا یەکێکمان نەماندەتوانی لەگەڵ خواردنەوەکـەی ئـەودا رێ بکەین. لەسەر خۆشییەکی مەرگ ئاوەری بەردەوامدا بمێنینەوە، ئەو کەم یـا زۆر لە بارێکی ئاساییدا بوو.

پێی گـوتم: " سـڤن ، شـتەکە هـەمووی چ پـیس و دژوارە " ئەمـەی گـوت و پەرداخێکی گەورەی پڕ لە ڤۆدکا کردو بەجۆرێ خواردییەوە دەتگوت بیرەیـە. " پیـاو کە بیر لەوە دەکاتەوە ئەدۆلف و ئەو گۆبلزە درۆزنە مێشکی ئێمەیان بەچی ئـاخنیوە، خۆی پێ ڕاناگیرێ، ئایـا ئەمـە خەونـە، ئـەرێ ڕاسـتە ئـەم هـەموو درۆو دەلەسـەیە لەلایـەن تـەواویی نەتەوەیەکـەوە پەسـندو قـەبووڵکراوە ؟ ئێمـەی ئـەڵمان چـیمان لێقەوماوە ؟ هەموومان چـاک دەزانـین بـەرەو دۆزەخ دەچـین، ئـەو ڕاستییەمان بەدرێژایی کات لا ئاشکرایە. ئایا ئێمە، هەر هەموومان خۆکوژین ؟ یان وەک دەبینین گەمژەو نەزانین ؟ مردووی هێزو دەسەڵاتـین و، کـەم ئـەقل و نـەفامین ؟ وا دەزانم ئێمە شێتین .... من دەزانم من شێتم".

## ڤۆن بارينگ

به بیرتان دێت که ئەدۆلف له ڕادیۆدا هاواری کرد :

– ئەگەر بمەوێ ستالینگرد داگیربکەم، لەبەر ئەوە نییە کە من ناوەکەیم پێخۆشە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە پێویستە ئەم ناوەندە دەمارە گرنگەی هاتوچۆی ئاویی ڕووسیا لەدەست دوژمن بسێنرێتەوە، کاتێکیش ستالینگراد دەگرم که بزانم کاتی هاتووه ! ، بەڵام پاش چەند حەفتەیەك که تەواوی سوپای شەشەم بەدیل گیرا، چۆن ئەو شێتە وەستاو لەناو چەپڵە ڕێزانی ئەندامە گەمژەکانی پارتییەکەی هاواری کرد : " کە بینیم گرتنی ستالینگراد بێ سوودە، کە هیچ گرنگییەکی بەرچاوی ئەوتۆی بۆ سەرکەوتنی یەکجارەکی یەکە سەربازییەکانمان نییە، فەرمانی کشانەوەی پێچەوانەم دا ! ". خەڵکیی هوتافیان بۆ ئەم وتەیە کێشا. سەدو هەشتا هەزار، بەهەر حاڵ، پاشەکشەیان پێ نەکرا. ئەوان له شەڕی گرتنی ستالنیگرادی " بێ بایەخ " قڕکران.

لە وەڵامدا گوتم : ،، ئاخ ! تەڵەکە دەبینین، بەڵام فەوجێکی سزادراو دەتوانێ بەرامبەر شەست حەفتا ملیۆن کەسی نەڕەکردوو چی بکات، کە هیچ شتێك نابینن، چونکە ئارەزوویان لە دیتنی نییە. ئەوان ئەمڕۆ کە جەنگ بەتەواویی دۆڕاوە، دەڵێن مردن لە دۆڕاندنی جەنگ باشترە. مەبەستیشیان ئەوەیە : باشترە خەڵکانی تر بمرن لەوەی کە ئێمە ژیان لە دەست بدەین. لە بەرلین گوێم لە ژنێك بوو دەیگوت : ئەگەر تەنیا یەك تاکە فەوجی ئەڵمانی لە بەرەی جەنگدا بمێنێ، ئەڵمانیا جەنگەکە دەباتەوە بەمەرجێ ئەو فەوجە (SS) بێت.

ڤۆن بارینگ گوتی: " ژنان لە هەموو کەسێك خراپترن، خواوەند لە ژنانی دەمارگر بمپارێزێت، بەڵام هەمووی قەیدی نییە. هتلەر جەنگی دۆڕاندووە، بەڵام ئەگەر ئێمە هەردووکمان ئەو هەرەس هێنانە شکۆدارە ببینین ئەمە مەسەلەیەکی جیاوازە. بەم زووانەش نۆرەی ئێمە دێ. تەنیا خەیاڵی ژیان لەسەر ئومێد ئەوەی کە هەموو شتەکە بەزووترین کاتی شیاو بەشادمانی بەسەر دەچێت ! سڤن، با بخۆینەوە، ئەمە تەنیا شتێکە بۆ ئێمە کە بیکەین.

- بەڵێ، هەموویان کە دەکەونە سەرپشتیان یەك شتن : خۆشییە. خۆ ئەگەر وا نەبووایە ئەوا کۆمەڵێکی خەم ئەنگێزی نەفرەت لێکراوبوون کە تەنانەت مرۆڤ نەیدەتوانی قسەشیان لەگەڵدا بکات، چونکە ئەوان قەت هیچ فێر نەبوونە جگە لە لەسەر پشت درێژ بوون و بە ((بەڵێ)) و ((ئامین)) وەڵامدانەوەی هەموو پێشنیارێك. قەت ژنێکت دیوە خاوەنی بیرو ڕای خۆی بێت ؟

زەنگلێدانی بەخشەخشی تەلەفۆنی مەیدان قسەکانمانی بڕی. تەلەفۆنەکە بۆ ئەوەبوو پێم ڕابگەیەنن کە دەمنێرنە لۆو بۆ هێنانی چل تانکی گرانبەها، کە ڕەنگبێ دوایین تانك بن کە سوپا توانیبێتی بەیەکەوە خڕیان بکاتەوە.

بەهەرحاڵ سەفەرەکەی لۆو دواخرا، چونکە ڕووسەکان ئەو کاتەیان هەڵبژارد بۆ پەلاماردانمان بۆیە کۆمەڵە ئیشێکیان بۆ حەفتەی داهاتووش بۆ پەیداکردین.

ڕۆژێکیان ڤۆن بارینگ لە کاتێکدا پشکنینی دەکرد هاتە پەناگەکەم. وەستاو بەتێڕوانینێکی بێباکانەوە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد.

- ئێستاکە دەکرێ هیچی تر نیگەران نەبم، ئەمەی گوت و لێیدا ڕۆیشت.

بەخێراییەوە بە دوای کەوتم.

له دەرەوەی پەناگەکەم دەستی کرد بەهەڵدانی ڕووناکی ئاگادار کردنەوە لە هەموو ڕەنگێك، بۆ ئەوەی تۆپەکانمان نەزانن مەبەست چییە. ئێمە زەفتمان کردو شەتەکمان کردو بردمانەوە ناو پەناگەکە. بەدەنگی بەرزەوە هەر هاواری دەکردو ڕاستەوخۆ چاوی بڕیبووە پێش خۆی، چاوەکانی لەترسان زەق ببوون، ترسێك کە تەنیا خۆی هەستی پێدەکرد، بەڵام ئێمەش دەمانتوانی زۆر بەچاکیی هزری لێ بکەینەوە.

– له خزمەتت داین، ئەی خاوەن شکۆ ! هتلەری خاوەن شکۆ، ها ، ها ، ها ! ئۆبەرست لێفتنانت ڤۆن بارینگ لە فەوجی مردن ڕاپۆرت بۆ چالاکیی لە دۆزەخ دەدات. ئا لێرەدا لەگەڵ باشترین شەنەی دەزگاکە، ئەی خاوەن شکۆ ! ڤۆن بارینگی پیاو کوژ ڕاپۆرت بۆ چالاکیی دەدات، هتلەری خاوەن شکۆ !.

پەنجەکانم لە گوێچکەکانم ئاخنین بۆ ئەوەی گوێم لە پێکەنینی نەبێت. کاتێکیش کە زانیم ئەو لەسەر لێواری دروست کردنی ترسێکی گشتییە لە نێوان ئەوانەی کە لە پەناگەکاندان، کە لەوێدا هەموو کەسێك بەجۆرێ تەماشای پیاوە شێتەکەیان دەکرد دەتگوت تووشی نواندنی مەگناتی بووبوون. ناچار بە زەویم دا کێشا.

ئێستاش، لە فەوجی مردن تەنیا من و هنکا ماوین. بارینگ، کە سەردەمێك ئەوەندە گەنج و ڕووخۆش و دڵ پڕ لە میهرەبانیی ڕاستەقینە بوو، کاتێ ئێمە لەژێر دەستی میری خوێڕی دەمان ناڵاند، بۆمان وەستا، ئێستاش لەژێر باری گرژیدا تێکشکاوە.

پاش ماوەیەك کە من و هنکا لە گەشتێکی کورتی ئەرك بەجێهێناندا بووین، لە جیسن وەستاین و چووینە نەخۆشخانەی سەربازیی بۆ

نەخۆشـییەکانی مێشك کـە بـارینگ لـەوێ بـوو. بـارینگ لـە قەرەوێڵەکەیـەوە بەسترابووەوە و شێتانە هاواری دەکرد بێ ئەوەی ئێمە بناسێتەوە. لیکاو بە ڕدێنیـدا دەهاتـە خـوارو تەنانـەت بـۆ ئێمـەش کـە بـرادەری بـووین دیمـەنێکی بێـزەوەری هـەبوو. کـە جـارێکی تـریش چـووینەوە نـاو شـەمەندەفەرەکە وا دەلەرزین کە هیچ کامێکمان زاتی ئەوەی نەدەکرد بۆ ماوەیەکی درێـژ بئاخفێت.

پاشان، هنکا ((نا))ییێکی دەمارگیرانە و پێکەنینێکی نائومێدانەی لێدەرچوو

– گوتی، کەواتـە ئێمـە ئەوەنـدە دڵڕەق نەکراوین وەکو بیرمان لێدەکردەوە. لـە وەڵامدا گوتم :

– نەخێر، شتێکی ترسناك بوو.

لە حاڵەتێکدا ئەمە تووشی هەر یەکێکمان بێت، ئایا لەسـەر ئـەوە ڕێك ناکـەوین کە یارمەتی یەك و دوو بدەین تا لێی دەرباز بین.

هنکا دەستی بەرز کردەوە.



**وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا**

- لەساڵی ١٩٤٣ لە گوندی (ڕایات)ی سەر بەقەزای ڕواندز لەدایکبووە. قۆناغەکانی خوێندنی لەکووت و کۆیەو سلێمانی و ڕواندز و هەولێر تەواوکردووە.
- لە ساڵی ١٩٦٠ لەکۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا/ بەشی کوردی وەرگیراوە، لە ١٩٦٤ بە پلەی (شەرەف) دەرچووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ دا دوورخراوەتەوە بۆ عانە و ئنجا رومادی.
- جگە لەم کتێبە (ئەندازەی باخچان)ی لە عەرەبییەوە، کردووە بەکوردی و هەروەها مێژووی نوێی عێراقی (ڤیبی مار)ی لەئینگلیزییەوە لەگەڵ بەڕێز حەمەشەریف حەمەغەریب کردووە بەکوردی.
- لەدانانی پرۆگرامەکانی زمانی کوردی بەشداری کردووە.

چاپخانەی ڕۆشنبیری